ناوی کتێب: خوشکم ڕێگاکەت هەڵەکرد

بابەت: کۆمەڵێ ڕووداو و بەسەرهاتی واقیعیە

نوسەر: یوسف الحاج احمد

وەرگێڕ: حسێن محمود هەڵەبجەیی

تایپ: انور عرب امین

دیزاینی بەرگ: فوئاد کەوڵۆسی

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

بڵاوکار: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

ژمارەی سپاردن: ( ٢٠٢٥ )ی وەزارەتی ڕۆشنبیری ساڵی٢٠٠٨ پێدراوە

# نرخی سەرەڕۆیی

دوای ئەوەی کەوتمە تەڵە و داوەوە :- بە فرمێسکەکانم کە بوون بە دەریایەك لە خوێن چیرۆکی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە . دوای ئەوەی دڵمی نوقم کرد لە ماتەمی و گریان و پەشیمانی . بەڵام پەشیمانی هیچ سوودیکی نییە ؟

ئایا گەڵا دوای ئەوەی زەرد و سیس بوو سەوز دەبێتەوە ؟ وە ئایا رۆژەکان و ساتەکان دوای بەسەرچونیان دەگەڕێنەوە ؟! چیرۆکەکەی من چنراوی ئەندێشە و خەیاڵ نیە . وە سەرگوزەشتەی داپیرە نیە بۆ نەوەکانی تا خەویان لێبکەوێت . وە دیمەنی فیلمێك نییە رووداوەکانی بە وشەی کۆتایی تەواو ببێت و هیچ ئاسەوارێکی نەمێنێت .

چیرۆکی من مینەتیەکی تۆقێنەرە کە ژیانمی کرد بە دێوەزمە و و خەیاڵی و ترسناك کە لەهەر کوێ بم دەورەی داوم . ئایا چیرۆك و مەینەتی من چییە ؟ تەنها بۆ ئەوە دەیگێڕمەوە بەڵکو ئەو کەسەی کە گوێی لێیە پەند و ئامۆژگاری لێوەرگرێت . یان ئەو کچەی لایداوە لە رێگەی راست پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت خەبەری بێتەوە . بۆ ئەو کچەی دەگێڕمەوە کەتازە دەگەشێتەوە و گوڵی گەنجیەتی دەپشکوێت و رۆژگارەکانی دەکرێنەوە لە هەرەتی گەنجیەتیدا . حەزو ئارەزوو تەقوا و لە خوا ترسانی لەبیر بردەوتەوە و لە دەریاچەی حەزەکاندا مەلەدەکات و نازانێ چی بە سەردێت .

ئێستا بە کورتی لە چیرۆکەکەم رابمێنە .

کاتێ گەشتمە تەمەنی هەژدە ساڵی ، وام هەست دەکرد بەو پەڕی ئازادی و بە بێ کۆت و بەبێ چاودێری پێشوازی لە ژیان دەکەم ، بە

هۆی متمانەی تەواوەوە لە لایەن کەس و کارمەوە پاڵی پێوە نام کە پەی بە پەنهانەکان بەرم ، لە قۆناغی یەکەمی کۆلێژدا ئاشنا بووم بە کۆمەڵێ هاوڕێی کچ ، لە بەر ئەوی من خۆم بە پێشکەوتوو ( مۆدێرن ) دەزانی سوور بووم لە سەر ئەوەی بۆی فرێند ( هاوڕێی کوڕم ) هەبێت ، بۆیە ئەو کچەی کە هاوڕێم بوو براکەی خۆی بۆ هەڵبژاردم ، بەبێ ڕاڕایی ڕازی بووم ، یەکتر ناسین تەواو بوو بەبێ ئەوەی حیساب بۆ چارەنووسی کارەکامان بکەین ، شەیتان دای لە سیاجی ئازادی و متمانە بە خۆ ، و بێگومان ئەوە شتێکی سروشتی بوو ، منیش بەوپەری حەز و لە خۆبوردویی و بەرائەتی منالیەوە کەمەند کێش بووم ،دوای ئەوە زەنجیرە بینینەکان و سەردانەکان و قسەکردنەکان پێکەوە دەستی پێکرد ، من دەچووم بۆ لای و بۆ هەر کوێ بمان ویستایە دەچووین ، هەموو ئەمانە ڕوویان دەدا و بەبێ ئەوەی دایکم بزانێت ، من درۆم دەکرد لە گەڵی و خۆزگە پێم نەوتایە ، بەڵام پەشیمانی چەند سەختە .

هەستم دەکرد کە زۆر هۆگری بووم و ناتوانم لێی جیا ببمەوە ، لە پڕ هەواڵێکم پێگەیشت کە وەك گەردەلول وا بوو ، لە سەرەتادا بڕوام نەکرد . بەڵام هەمیشە ئێمە واین ، بڕوا بە هەواڵە گرنگەکان ناکەین تەنها دوای دەروون هێمنی نەبێت ، بەڵێ کۆچێکی دڵنیایی بوو ، هاوڕێکەم مرد بە هۆی کاریگەری نەخۆشی لە ناوچوونی جگەرەوە ، بۆم دەرکەوت کە بە هۆی مادە بێهۆشبەرەکانەوە بووە، چونکە ئەو موعتاد بوو ، منیش نەمدەزانی ، ماتەمی داباری بەسەرمدا و و دەروونم تەسك بووبوویەوە ، بەڵام ئایا ماتەمی سوودی هەیە ؟ لە کاتێکدا من تاڵاوی خەم و خەفەت دەچێژم ، بە هۆی ئەو کەسەی کە مەجرای

ژیــانمی گــۆڕی ، کیــانمی هەڵگێڕایــەوە و ڕاســتی لــیٚ تێــك دام و سەرگەردانی کردم ، لەو حاڵەتم هاتمەوە هۆش و خۆم وەك شێت بە بیٚ ئــیرادەی خــۆم زمــانم نــەفرەتی لێئــەکردم ، هاوڕێکــەم کــە دەیناســی چــرپاندی بــە گوێمــدا : کــە ئــەو پــێش وەفــاتی بــەهۆی لــە ناوچــوونی جگەرەوە توشــی نەخۆشــێکی زۆر مەترسیدار بووبوو ، وتــی : تووشــی ئایدز بووە.!!

بــەڵیٚ تووشــی ئایــدز بــوو بــوو ...نــەمتوانی هــیچ بڵــێم دڵــم خــەریك بــوو دەوەستا و هیچم بۆ نەدەوترا و نەمدەتوانی بیر بکەمــەوە ، بۆیــە ڕۆشــتم .. دەرگــای ژوورەکــەم لــە خــۆم داخــست و مــانم گــرت لــە خــواردن.. بــەڵام ئایا بڵێم کار لە کار ترازاوە و پاش چی ؟

بەزەیت بێت ئەی پەروەردگارم .. ئەو شەوانە و ئەو یــەکتر بینینانــە لە بەردەم چاوم سەمایان دەکرد .. دڵم خەریك بوو لــە پەشــیمانیا پارچــە پارچە دەبوو ، بەڵام ئەگەر پەشیمانیەکەم دابەش بکردایە بەسەر هەموو کچانی جیهاندا بەشی هــەموویانی دەکــرد ، دۆش دامــابووم نــەم دەزانــی چی بکەم ؟

پێویستە شیکاریەك بۆخۆم ئەنجام بــدەم بــەڵام چــی بڵــێم بــە دایکــم ، وە بــاوکم کــە نەخۆشــی دڵــی هــەبوو ، دوای گریــانێکی زۆر دایکمــم تێگەیاند ، دایکم خوازیار بوو لــە خەفــەتا لــە ســەر دەســتی ئــەو بمــرم و بەرەو نەخۆشخانە کەوتینە ڕیٚ ، چەند دڵۆپێك خوێنیان لێوەرگرتم .

مەوعیدەکە دوای هەفتەیەك بوو تا بزانین ئەنجامی شیکارەکە چیە ؟ ئەو هەفتەیە بە قەد هەموو ژیانم درێژ بووبوویەوە لە لای من ســەدەیەك درێــژ بــوو ، لــەزەتم لــە خــواردن نەئــەبینی ، چــەندێك مەوعیدەکــە نزیــك

ببوایەتەوە ترس و داچڵکینم زیاتریان دەکرد لە تاو شەکەتی و کفتی بێهێز بووبووم .

بەرەو نەخۆشخانە من و دایکم بە هەنگاونانێکی قورسەوە کەوتینە رێ. دوای ئەوەی رەنگم بزرکا بوو . لێوەکانم سپی بووبوونەوە و چاوەکانم بە هۆی گریان و شەونخونیەوە سوور بووبوونەوە ، لە ژووری چاوەڕوانی دانیشتم . شوێنەکە پڕ بوو لە ئافرەت .کچان لە تەمەنی مندا پێدەکەنین و لەو پەڕی خۆڕازاندنەوەدا بوون . ئەمەیان منداڵی یەکەمی پێیە و ئەوەیان تازە دامەزراوە و ئەوەی تریان لە گەڵ دایکیەتی دیارە چاوەڕێی زەماوەند دەکەن . ئەوەی کە بە هەمووانەوە دیار بوو دڵخۆشی و ئاسوودەیی بوو ، بەڵام من ئەگەر ئەیانزانی چەندە بێتاقەت و خەمبارم کاتێ کە چاوەڕوانی ئەنجامی شیکارەکەم دەکەم . ئایا من لە گەڵ مردووواندا دەبم لە کاتێکدا لە ریزی زیندواندام . یان رزگارم بووە لە تیاچوون و سەر لەنوێ دەست دەکەمەوە بە ژیان و خۆم دەپارێزم و بە سیاجی داوێنپاکی و لە خوا ترسان ؟!

بەڵام چەند سەختە ئادەمیزاد چاوەڕوانی مردن بێت لە هەر ساتێکدا بێت و نازانێ لەکوێوە بۆی دێت . بەڕاستی ترسناکە شتێك کە نەیبینیت ..

پەرستارەکە هاتە دەرەوە و تەماشای روخسارەکانی دەکرد ، وەك ئەوەی بەدوای مندا بگەڕێت ، لێدانەکانی دڵم زیادیان کرد . دڵم گوشرا و تف لە دەممدا وشك بوو ، بۆچی ئاوایە، دایکمی بانگ کرد ،دایکم بە پەشۆکاویەوە بە هەڵداوان هەستایەوە و چوو بۆ لای تا ئەنجامەکە بزانێت .. وەك چۆن منیش حەزم دەکرد بیزانم ... چەندە خوازیار بوو

ئەنجامەکەی بەو شێوەیە بێت کە رزگارم بووبێت لە داو و تەڵەکە . ئای خەونەکان چەندە هەرزانی و واقیعیش چەندە تاڵە ؟

پەرەستارەکە بە دایکمی وت : پێویستە پیاوێك ئامادە بێت ! ئەبێت چی روویدابێت ، وتی: نا پێت ناڵێم .. پێویستە پیاوێکتان بێت ، دایکم فرمێسك بە چاوانیدا دەباری ، دایکە ئەوە چیە . بێدەنگی روخساری دایکمی داگرتبوو . فرمێسکەکانیش بە خوڕ دادەبارین بە روومەتیدا . دایکم وەرقەکەی لێسەند و تەماشایەکی کرد و دڕاندی و فڕێی دایە سەر زەویەکە و نەیزای .

منیش دانەویمە سەر زەوی و پارچەیەك لە کاغەزەکەم هەڵگرت و پاشان کردمەوە تەماشام کرد بزانم چی تیایە . ئای چ کارەساتێك بوو .. ئەنجامەکەم بینی .

نرخی سەرەڕۆیی و لادان لەسەر رێگای داوێنپاکیم بینی .. بە هەردوو چاوم ئەنجامی بێهودەیی و رابواردنم بینی . لە سەرتادا خۆش بوو پاشان بە مەینەتیەك کۆتایی هات کە عەقڵ بەرگەی ناگرێت .من لە هەرەتی گەنجیەتیدام .. تەمەنم هەژدەساڵە .. ئایا بڕوا دەکەن ... ئایا قبوڵی دەکەن .. ئایا گوێ دەگرن ؟

من ... بەڵی من توشی تاعوون بووم ... نرخی سەرەڕۆییەکەم وەرگرتەوە، ڤایرۆسی ئایدزم هەڵگرتووە !!

هاتمەوە هۆش .. بەڵام دوای ئەوەی کار لە کار ترازا ، پەشیمان بووم بەڵام پەشیمانی داد نادات .. گریام و فرمێسکەکانم وشك بوونەوە ... شەونخونیم کێشا تا شەبەحی مردن راوبنێم ، ماندوو وێڵ و شەکەتی کردبووم . بۆ رێگاکانی ژیان دەگەڕام لە گوزەرێکەوە ، هیچم شك نەبرد بێجگە لە رێگای ئیمان و پەشیمانی ، من ئێستا لە بەردەم

ڕەشــەبایەکدا ڕاوەســتاوم و چــاوەڕوانی چارەنووســی خــۆمم لەگــەڵ ئەوپەڕی هەست کردن بە ئازار .

چیرۆکی خـۆم بـۆ تـۆ و بـۆ کـچانی تـریش دەگێڕمـەوە بـەڵکو ئـەو کەسـەی بێئاگایـە بە ئاگـا بێتـەوە و ئـەوەی سـەرەڕۆیە ئاگاداربێتـەوە و بێتەوە سەر ڕێگای ڕاست.. بەڵکو ئەو ئافرەتەی بێهودەیە ئاگاداربێتەوە پـێش ئـەوەی ڕۆژانـی خـۆی تـەفر و تونـا بکـات ، مەینـەتی مـن وەسـف ناکرێت.. ئازارەکانم سنوریان نیە، سەختن لـە نارەحـەترین نەخۆشـی ، ئـازاری مـن بێبـەش بوون بـوو لـە ژیـانێکی خـۆش ، ئـازاری ترسـان لـەو مردنەی هەموو ساتێك و لە هەموو گۆشەیەکی ڕۆژانی ژیانمدا دەیبینم پەروەردگارا چاوەڕوانی ڕەحمەت و لێبوردن و میهرەبانی تۆم .

# ئاه وناڵەی ژنێك

تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و وەڵامم دایەوە : بەڵێ ، سڵاو لە تۆ ، گوێم لە دەنگێکی بزڕکاو بوو کە گریان و ئازار پچڕ پچڕی دەکرد ، هەر کە گوێم لێوە بوو ، هەموو هەستێکم یەکلایی کردەوە بۆ ئەو دەنگە ماتەم و بێزارە ، تەنها گوێم لە دەنگی گریان و ناڵە و زاریە بوو ، ئافرەتێك بوو ئازار و ماتەم وای لێکردبوو کە تەلەفۆن بکات بە گرنگی پێدانەوە لێم پرسی : خوشکی بەڕێزم چیتە ؟بۆچی ئەوەندە دەگریت و هاوار دەکەیت ؟

بە دەنگێکی خنکاوەوە کە بگەڕێت بە دوای فریادڕەسێکدا کە رزگاری بکات ئەگەر رۆچووبێت لە سەرگەردانی و تاریکیدا ؟ژنێك چی بکات ئەگەر نوقم بووبێت لە داوێن پیسی و خراپەکاریدا ؟ ئەو کەسەی کە رووناکی رێنمایی گۆڕی بێت بە گومڕایی چی بکات ؟ ئەو کەسە چی بکات کە ناپاکی لە گەڵ خوا و مێرد و کەسوکاری و داب و نەریتی رەسەندا کردبێت ؟

کەسێك کە رۆژ و شەوی کردبێتەوە بۆ ئارەزوواتە حەرامەکان وکوێر بووبێت لە ئاست پاکیتی و بینایدا ؟ یا شێخ وەڵامم بەرەوە ، وەڵامم بەرەوە ئەگەر وەڵامێك شك دەبەیت ، چونکە لۆمە و سەرزەنشت دەروونمی گڕ تێبەریاوە ..

منیش بە هێمنکردنەوەوە پێم ووت : لە سەرخۆبە خوشکی بەڕێزم ، فرمێسکە گەرمەکانت وا رادەگەیێنن بە ئیزنی خوای گەورە لە دایك بوونی ئافرەتێکی نوێ و سەرەتای لاپەرەیەکی ئاسودە لە ژیانتدا..

بەلأم پێم بڵێ بۆچی ئەو رێگایەت گرتە بەر ؟ بۆچی رۆچویت لە گوناه و تاواندا ؟ بۆچی لە فەرمانی خوای گەورە دەرچوویت ؟

بە دەنگێکی ماتەم و خەفەتبارییەوە وتی ، مێردەکەم هۆکاری ئەوە بوو . بەڵێ ئەو بەرەو سەرگەردانی بردم ، ئەو کردمی بە نێچیری سەگە برسیەکان ، مێردەکەم بە دەستی خۆی منی کوشت ، هەموو بەها و بنەمایەکی لە مندا کوشت . هەموو مانا جوانەکانی تیا کوشتم ، هەموو پردەکانی خۆشەویستی نێوان خۆم و خۆیی پچڕاند . بە هۆی دڵرەقی و کەللە رەقی و نەزانیەوە .

ئافرەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو هەناسەی هەڵکێشا و فرمێسکەکانی سڕی . پاشان ووتی : خەونم دەبینی بە مێردێکی ناسکەوە کە رێگام بۆ روونـاك بکاتەوە . خەونم بە چرای خۆشەویستیەوە دەبینی و بە هەست و سۆز و ئەویندارییەوە کە بمبات بەرەو کەناری ئارام و هێمن .. خەونم بە کەسێکەوە دەبینی لاپەرە ناخۆشەکانی ژیانم بگۆڕێت بە لاپەرەی پرشنگدار لە بەختیاری و ئارامیی .کە گەورەبووم هەموو خەونەکانم لە گەڵمدا گەورە بوون .من گەورە بووم و ئەویش پێش من گەورە بوو ، پێشبڕکێی لە گڵدا دەکردم ، هەتا سواری خەونەکان (فارس الاحلام ) بووم کە چاوەروانم دەکرد و وا گومانم دەبرد تەقەی دا لە دەرگا . شووم پێکرد لەو کاتەدا هەستم کرد پێویستم بەو خەونە ئەرخەوانیانە نیە ، چونکە سبەینێ لە گەڵ مێردەکەمدا دەبێتە راستی و تێیدا دەژیم بۆیە شەوی بوکێنیم خوا حافیزیم لێکرد و پێم وت : خوا حافیز بۆ ئاسمانی خەیاڵ ، ئیتر ناتبینمەوە ، ئەگەر کۆبونەوەکەم هەبوو لە سەر ئەرزی واقیعا ئەوە ئەتبینم ، رۆژگار گوزەران و چەند مانگێك دوای زەواجەکەمان لە گەڵ مێردەکەمدا دەژیام و هەستم بە

وشـكی ئـەو دەكـرد ... بـەلام قبـولم دەكـرد و دەمـووت : سـبەینێ سەرسامی ئەكەم بە قسەكانم و بە شێوازی مامەڵەكردنم لەگەڵی . وای لێ دەكەم هەستم پێ بكات و هەست بە ناخم بكات و واز لەو عەقڵیەتە سەرەرۆییە بێنێت بەلام هەی هووو .....

هەی هوو بۆ ئاسن كە كەل و كول ببێت .. وە بۆ بەرد كە نەرم بێت مانگ بە دوای مانگدا دەهات و كارەكە خراپتر دەبوو . ئەو ساردیەی نێوانمان بۆشاییەكی قوڵی دروست كرد . قوڵیەكەی بەرادەی قوڵی خەمەكانم بوو بۆ سەر خەونە جوانەكانم . كە خوا حافیزیم لێكردبوو بەو ئومێدەی لە ئەرزی واقیعدا پێی بگەمەوە . بەلام وا دیار بوو خوا حافیزیم لێكردبوو بۆ هەتا هەتایی و ئیتر نایبینمەوە مادام لە گەڵ مرۆڤێكی ئاوادا دەژیم ..

زۆر بە سەختی و دڵرەقی مامەڵەی لە گەڵدا دەكردم من بە قسەی ناسك و شیرین دەدوام لە گەڵی ، بەلام ئەو بە خراپترین و ناقۆلا ترین قسە وەلامی دەدامەوە . دەمویست بە خۆجوانكردن و خۆرازاندنەوە لێی نزیك بمەوە . بەلام خۆمم دەبینیەوە كە خۆم دەكێشم بە دیوارێكی بەردیندا كە هەست و نەستی نیە و مانای جوانی ناچێژێت .

دڵتەنگ ئەبووم ، گوێم نەئەدا بەو دڵتەنگیەم ، دەگریام. نەیدەپرسی بۆچی فرمێسك بە چاوانتا دێت . نەیدەزانی ئەو هۆكاری خەم و ئازارەكانمە .

بە درێژایی رۆژ زۆر كەم ئەمبینی، لەو كاتە كەمانەشدا رزگارم نەدەبوو لە گاڵتە پێكردنی پێم و رەخنەگرتنی لە ئیش و كارەكانی ناومالم .

شەویش تا نیوە شەو چاوەڕوانیم دەکرد تا بەشەکەتی دەگەڕایەوە و بە ماندوویی وەك لاشەیەکی خامۆش لە جێگایەکدا پاڵ دەکەوت تا بخەوێت ، هەموو خەمێکی ئەوە بوو کە بگەڕێتەوە ماڵەوە خواردن ئامادەبێت و بیخوات و بخەوێت و پاشان برواتەوە بۆ سەر ئیش و کار و جەنجاڵیەکانی و لای هاورێکانی .

جارێکیان پێم وت کە دەیویست بچێت بۆ شەونشینیەکانی خۆی : مێردەکەم تکایە بمێنەرەوە لە گەڵم ، من پێویستم بە تۆیە ، بە تەنها جێم مەهێڵە، بە گاڵتە پێکردنەوە تەماشای کردم و ووتی لە چیت کەمە . باشترین خواردن و پۆشاك و کەل و پەلی ناوماڵم بۆ دابین کردووی لە سەروو ئەمانەشەوە سەتەلایتێکم بۆ هێناوی تا سەدان کەناڵی ئاسمانی هەمەرەنگ ببینیت تا کاتی بەتاڵیشتی پێ بەریتە سەر ، ئیتر پێویستت بە چیە ؟

بە دەنگێکی شکاوانە و شەرمنانەوە وتم پێویستم بە تۆیە پێویستم بە قسەی شیرین و هەڵسوکەوتی ناسکی تۆیە ، پێویستم بە سۆز و خۆشەویستی و ئەوینی تۆیە ، پێویستم بەوەیە کە هەست بکەم لێمەوە نزیکیت ، تاوەکو هەموو مەترسیەکانم لێ دوورخەیتەوە .

قاقا پێکەنی و وتی : ئەمانە قسەی بەتاڵن ، جیهان هەر هەمووی لە کێشەی ئابووری و سیاسیدا دەژی و تۆش گرنگی بەو شتە بێبایەخانە دەدەیت .

منیش خێرا پێم وت : ئایا بێبەش بوونی من لە سۆز و خۆشەویستی تۆ کێشەکانی جیهان بنبڕ دەکات و نایهێڵێت ، نەخێر هیچ لەم واقیعە ناگۆڕێت ، بەڵکو کێشەی نوێ زیاد دەکات کە ئەویش کێشەی منە ، ژنە هەژارەکەت..... کاتێ دەستی بە دەرگاکەوە بوو

دەیەویست بچێتە دەرەوە بە تووڕەییەوە لای کردەوە بە لامدا وتی : واز لەم فەلسەفە بەتاڵانە بێنە و پاشان رۆشتە دەرەوە و دەرگاکەی داخست

لەو ساتەدا زۆر بە تاسەوە دەستم کرد بە گریان و لە خۆمم پرسی: ( مێردەکەم گرنگی بە کەسی تر دەدات ، ئەی بۆچی گرنگی بە ژنەکەی و هاوڕێی ژیانی نادات کە هەست و سۆزە ناسکەکانی کوشتووە بە ئاگری گاڵتە پێکردن و گوێ پێنەدان و پشت گوێ خستن ؟)

نەفرەتت لێ بێت مێردەکەم ، بۆچی ئەم هەموو نەگونجانە ؟ ئەگەر رۆژێ دڵخۆش بوومایە لە گەڵیدا ئەوا ئەو دڵخۆشیەی تێك ئەیام و ئەیکرد بە رۆژێکی خەم و خەفەتاوی .

هەموو هۆکارەکانم بۆ تاقی بوویەوە و تەقەم لە هەموو دەرگاکان یابوو ، بەڵام هەموو دەرگاکانی بەرووی مندا داخستبوو ، وام لێهاتبوو زۆربەی کاتەکانم بە تەماشاکردنی کەناڵە ئاسمانیەکان دەبردە سەر و دەمگۆڕین لەم کەناڵ بۆ ئەو کەناڵ بەڵکو ئەو مەینەتیە تاڵەم کە هەمە لە گەڵ مێردەکەمدا لە بیر بچێتەوە ، ئێوارەیەکیان دانیشتبووم تەماشای یەکێ لە فیلمە عەرەبیەکانم دەکرد ، رووداوی فیلمەکە لە روداوی ژیانی منی دەکرد . رووداوەکانی باسی ژنێکی دەکرد کە مێردەکەی فەرامۆشی کردبوو بە هۆی شەونشینیەکانیەوە و کار و باری خۆیەوە ، ئەمیش هەستی بە بۆشایەیەکی مەترسیدار دەکرد کە ژیانی پر کردبوو، بۆیە ناپاکی لە مێردەکەی کرد و دەستی کرد بە پەیوەندی کردن بە هاوڕێی مێردەکەیەوە ، لە گەڵیدا کەوتە تاوان و داوێن پیسیەوە .... لە راستیدا کاتێ سەیری ئەو فیلمەم دەکرد بۆ یەکەمجار شتێك هات بە خەیاڵمدا و دەیووت بۆچی تۆش وەکو ئەو ژنە بێبەشکراوە ئەو کارە ناکەیت ؟بۆچی تاقی ناکەیتەوە وەك ئەو چۆن

تاقی کردەوە ، بەڵکو ئەوەت دەست کەوێت کە ئەگەڕێیت بە دوایدا لە سـوز و خۆشەویـستی و ئەوینـداری لــە پیـاوێکی تــرەوە .. لێــرەدا پاکیزەیی و داوێنپاکی لە دڵمدا خەبەری بوویـەوە و لـەناخ و یژدانمـدا هـاواری کـرد .نـەخێر ، ئایـا دەتـەوێت تـۆش وەکـو ئـەو ئافرەتـە ناپاکـە تۆش ناپاك بێت. بۆچی ڕێز و سەربەرزی دەگۆڕیتەوە بە سـەرنزمی، بـا مێردەکـەت کەمتـەرخـەم بێـت . ئەمـە بەهانـە نیـە بـۆ تـۆ و مـافی ئـەوەت نایـاتیّ ناپـاکی بەرامبــەر بکـەیت و شـەرەفی لەکـەدار بکـەیت لەگـەڵ پیـاوێکی تـردا . هەڵـە بـە هـەمان هەڵـەی وەك خـۆی چارەسـەر ناکرێـت . ئاگری بلێسەدار بە هەمان ئاگری وەك خۆی ناکوژێتەوە ..

ئێوارەیەکیان دانیشتبووم چاوەڕوانی گەڕانەوەی مێردەکەم دەکرد لە یەکیّ لە شەونشینیەکانی . ئەو نیوە شەو نەهاتایە نەئەگەڕایـەوە. خـوا ئاگادارە هەستم بەترس و تەنیایی دەکرد ، دانیـشتبووم ماتـەمم دەگێـڕا بۆ بەخت و چارەڕەشی خۆم ، شـریتی خەونـەکانم بەبەردەممـدا ئەچـوو دەمبینـی دەکەوێتـە ئـاگری خەمەکانمـەوە و وردە وردە دەسـوتێت . لـەو کاتـەدا بـە کـوڵ دەسـتم کـرد بـە گریـان و تـا بیتاقـەت بـووم لـە گریـان ، دەستم کرد بە گۆڕینی کەناڵەکان بەڵکو شتێك ببینم و ئەو خەم و ئازارە ناخۆشـانەم لـە بـیر بەرێتـەوە کـە هەسـتم پێـدەکردن . لـە پـڕ زەنگـی تەلەفونەکەی پاڵم لێیـدا و واهـات بەخەیاڵمـدا وەڵامـی نەدەمـەوە ، بـەڵام ترسـام ئـەوەی کـە پەیوەنـدی دەکـات مێردەکـەم بێـت و ئـەو کاتـە دنیـا ژێرەو ژوور دەکات .

بــەتنی تەلەفونەکــەم هــەڵگرت و وزۆر بێزاربــووم لــەو پەیوەندیــە ناوەختەدا کە کاتی شك نەبردبوو لەو ساتەدا نـەبێت ؛ بە وشـکیەکەوە وتم بەڵیّ .. ئەویش بە دەنگێکی ناسـك و نـەرم وەك پێـستی مـار وتـی :

بەڵێت باقی بێت ، ئەم کاتەت باش .. بە توندی و ڕەقیەوە وەڵامم دایەوە: چیت ئەوێت ؟

وتی داوای لێبوردن دەکەم ، پێدەچێت ژمارەکەم بە هەڵە لێدابێت . بەڵام ئەم دەنگە وام پێ دەڵێت کە دەنگی کەسێکە دەناڵێنێت بە هۆی ئازاری تەنیایی و خەفەتەوە ، ئەی ئەو دڵە ناسکە بۆچی ؟

ژنەکە وتی : یاشێخ لە ڕاستیدا لێت ناشارمەوە . قسەکانی تەقەیان لەدەرگای دڵم دا پێش گوێم ، هەست و نەستمی هێنایە لەرزین ، روخسارم سوور هەڵگەڕا و دڵم زۆر بە خێرایی لێیئەدا و نەم ئەتوانی تەفسیری ئەو حاڵەتەم بکەم ،ئای هەناسە بڕکێ و ترسە یان خۆشی.. سەرت سورنەمێنێ لەوە لە ساتی شووکردنمەوە ئەوە یەکەم جارە مرۆڤێك هەست بە من بکات و لە سەدای دەنگمەوە هەست بە ئازار و مەینەتیەکانم بکات ، پاشان ڕەحمەت و بەزەیی خوا تەدارەکی کردم و بە پەلە تەلەفۆنەکەم داخستەوە ، هەست و نەستم تێکەڵی فرمێسك بوو ، نەم ئەزانی ئایا ئەوە فرمێسکی خۆشیە یان فرمێسکی ترسە ؟

لە ڕاستیدا دڵم خۆش بوو ، چونکە کەسێکم بینیەوە کە هەست بە ئازار و غەمەکانم دەکات ، دوای ئەوەی هەمووان دەستبەردارم بوون ، هەتا نزیکترین کەس لێمەوە کەمێردەکەمە، وەهەروەها زۆریش ترسام ، چونکە ئەمە یەکەمین جارە لە ژیانمدا پیاوێك بەو شێوەیە قسە بکات لە گەڵمدا ، بۆیە پەنام بردە بەر بێدەنگی و وەك ئەوەی رابکەم لەو فیکر و ئەندێشانە ، بەڵام ئەو بێدەنگیە سەر لەنوێ زەنگی تەلوفۆنەکە پچڕاندیەوە ،وەك زەنگێك وابوو کە دەیکێشا بە دڵی برینداری تێکشکاومدا ، یان وەك ئەوەی بەرگریکەرێ شورای داوێن پاکی ناو دڵم وێران بکات ، بۆیە لە ناخمدا ململانێ دەستی پێکرد ، ململانێ لەنێوان

خێـر و شـەڕدا و لـە نێـوان ڕووسـوری و حەیاچـووندا و لـە نێـوان دەسـتپاکی و ناپاکیـدا و لـەنێوان عـەقڵم کـە دەیقـیڕان بـە سـەرمدا و دەیـووت قـسە مەکـە لەگـەڵی و لـە نێـوان دڵـم کـە هـاواری لێـدەکردم و دەیووت قسەی لە گەڵدا بکە ، بەڵکو ئەو بەختەوەریەی تۆ بە دوایدا دەگـەڕێت لای ئـەو بێـت ، لـە کۆتایـدا بێنـەوایی و بێبـەش بـوونی سۆزداری زاڵ بوو بەسەر بانگی ئیمان و عەقڵدا و هەستم بە خۆم نەکرد کاتێ نەبێت تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و پێم وت : بەڕێز تۆ چیت ئەوێت لەمن

به دەنگێکی ناسك و سۆزدارانەوە وتی من هیچم لە تۆ ناوێت بەڵام لـەناو پەراسـووەکانمدا دڵـی مـرۆڤێکم هـەڵگرتووە کـە گرنگـی بـە مەینەتیـەکانی کەسـانی تـر دەدات و بە ئازارەکـانی ئەوان خەفـەت بار دەبێـت ، ئایـا مـن هەڵـەم لـە گرنیگـدانم بـە خـەڵکانی تـر ؟ ئەگـەر وایـە تەلەفۆنەکە بەڕوومدا داخەرەوە .

منیش خێرا پێم وت : نەخێر تۆ هەڵـەنیت ، بەڵکو ئەمە هەستێکی بەرزە لە تۆوە .. بەڵام .. پێی بڕیم و وتی : من لە بێدەنگی تۆدا گوێم لە ئـازار و خەفەتـە ، لـە خەمەکانتـەوە گـوێم لـە قـسە و ئاگـام لـە نارەحەتیەکانتە ، قسە بکە و خەمەکانت سووك بکە .

یا شێخ لە راستیدا بێدەنگ بووم و هیـچم نـەوت ، بەڵام بەرگـە گـرتنم وردە وردە لاواز و بێهێز بوو .

پیاوەکە بەردەوام بوو لـە سـەر قسەکانی: ئـەو گوڵـە بۆچی دەگـری و بێتاقەتە ، ئەم دەنگە ناسك و خۆشە بۆچی ماتـەم و سـەرگەردانە ، ئـەی چۆلەکە جوانەکەم بجریوێنـە و باسـی خـۆتم بـۆ بکـە تـا دڵـە رەسـەنەکان

گوێت لێبگرن ، ئەو کاتە دەمبینیت کە گوێم و دڵم جێی ئەو هەموو خەمانەی تۆی تیا دەبێتەوە ..

وتی :/ یاشێخ لێت ناشارمەوە لە ناخی خۆمدا بەراوردی ئەو کەسە نامۆیەم کرد کە دڵی خۆی بۆ کردمەوە تا گوێ لەخەم و ئازارەکانم بگرێت لە گەڵ مێردەکەمدا کە هەر کاتێ هەوڵم ئەیا دانیشم لەگەڵیدا تا خەم و ئازارەکانمی بۆ باس بکەم ، پشتی تێدەکردم و وازی لێ ئەهێنام لەگەڵ خۆمدا قسە بکەم .

شەیتان یاری بە جوانیم کرد ، ئەو کەسە نامۆیە گوێ لە ئازارەکانت دەگرێت و بۆ مەینەتیەکانت ئازار دەچێژێت ، بۆچی لە بەرامبەر چاکەکانیدا بە رەقی وەڵامی دەدەیتەوە ؟

قسەی لەگەڵدا بکە و ئەو رزگار کەری ئەو حاڵەی تۆیە ، ئاگات لێبێت لە دەست نەچێت و هەتا هەتایە دەست ناکەوێتەوە .

هەستم نەکرد کاتێ نەبێت ئەو شەپۆلە کاریگەرە رایکێشاوم بۆ لای خۆی و دەستم کرد بە قسەکردن لە گەڵی و سەرەتا باسی ئازار و خەفەت و خاڵیکردنەوەی مەینەتیەکان بوو ، بەڵام زۆر بەداخەوە قسانێکی تر هاتنە ئاراوە ، پەیوەندیەکان درێژەیان کێشا بۆ چەندین سەعات ، بەڵکو وام لێهاتبوو چاوەڕوانی مەوعیدی قسەکردنەکانم دەکرد بە تاس و شەوقێکی زۆرەوە ، کاتێ زەنگی تەلەفۆنەکە لێدەدا هەموو زەنگەکانی هەستم لە خۆشی و شادیدا لێیان دەدا... لە گەڵ مێردە سەرقاڵەکەمدا هەر بە لاشە دەژیام بە بێ رۆح و بەبێ عەقڵ و بەبێ هەست ، هەموو ئەو شتانەم گواستبویەوە بۆ پیاوێکی تر ، کە دڵی خۆی بۆ کردبوومەوە و هەموو ژیان و هەستمی داگیر کردبوو .

وتی: یا شێخ کارەکە گەشەی کرد ، مەوعیدێکم دانا لەگەڵیدا بۆ بینین ، بینینێك کە بۆ یەکەم جار کۆمان بکاتەوە لەگەڵیدا لە ماڵی خۆمان ، بینینێك کۆم بکاتەوە لەگەڵیدا لە ماڵی مێردەکەمدا و لە ژووری نوستنەکەیدا کاتێ ژوانەکە نزیك بوویەوە و سۆزی لۆمەی و ویژدان لە ناخمدا جولاّ و و بورکانی ترسی ئایندە لە ناخمدا گڕی سەند و پاڵنەرە خێریەکان لەناخمدا زیندوو بوونەوە ، لە خۆمم پرسی : پێکانم ئەبێت بۆ کوێ بچن ؟ بەڵکو ئەبێت بە چ ئاقارێکدا بچن ؟ وەلاّم بەرەوە ئەی دڵی شکاو ، ئایا ناترسیت لە سزای خوای گەورە ؟بەلاّم سۆزم و شیتانەکەم زاڵ بوون بە سەر هەموو بیرکردنەوەیکمدا ، تەنها خەونم بەوەوە دەبینی تینوێتی هەست و جەستەم بشکێنێت و بۆشایی دڵم و ویژدانم پربکاتەوە ، دەرگام بۆکردەوە .. ئەو ژوانە .. ژوانێکی چاوەروان کراو بوو بە شەوق و ترسێکی زۆرەوە ، ژوانێك ئەو لە لای خۆیەوە کورتی کردبوویەوە بۆ چەند قسەو سەرنجێك وەك ئەوەی بۆمی بسەلمێنێت لەوجۆرە کەسانە نیە کە رادەکەن بەدوای شەهەواتی لاشەدا تاوەکو زیاتر و زیاتر متمانەی پێبکەم .

ئافرەتەکە وتی : یاشێخ لێت ناشارمەوە کە بە راستی من ئازارێکی زۆرم ئەچەشت کە دڵی داگیر کردبووم وهاتبووە سەر جێگاکەم، چۆن نا ، ناپاکیم لە گەڵ مێردەکەمدا کرد لە ماڵەکەی خۆیدا و لەناو جەرگەی ژوورەکەیدا ، ناپاکیم لە راسپاردەکە کرد ، پەردەکەم هەتك کرد لە گەڵیدا تەقەمان دا لە دەرگای سەرشۆری ، لەگەڵیدا رۆشتم بەرەو نەهامەتی ، پەیوەندیەکان بەردەوام بوون، جارێکیان داوای لێکردم کە بیبینم، بەلاّم پێی وتم ئەو دەیەوێت ئەم جارەیان جیاواز بێت لە جارەکانی تر .

وتی : تۆ ئەزانی من چیم ئەوێت .. کاتێك رووبەند ( قناع ) ەکەی کەوتە خوارەوە لە روخسارە قیزەونە ناشرینەکەیەوە کەسایەتی ئەوم بۆ دەرکەوت ، گورگەکە حەقیقەت و راستەقینەیی خۆی دەرخست .

پێم وت ئێمە رێکەوتووین تەنها لە سەر قسەکردن، وە تۆ پێت وتم کە پاڵپشتی من دەبیت و دڵت دەکەیتەوە بۆ یارمەتیدانم لەم نارەحەتیەم ، چونکە مرۆڤێکی سۆزدار و میهرەبانیت .

بە گاڵتە پێکردنەوە پێی وتم : تەنها قسەکردن سوودی نیە بۆ ئەم رۆژگارە ، هەموو شتێك دەبێت نرخی خۆی هەبێت ، منیش داواکاریەکەیم قەبوڵ نەکرد و بە جێنێو و قسە پێ وتنەوە بەرپەرچم دایەوە ، بەلام ئەو بەهەندیْ کاسیەتی دەنگی هەرەشەی لێکردم کە پێشتر قسەکردنەکانی منی تۆمارکردبوو .. وە لە ژێر هەرەشەکردندا ناچاربووم داواکاریەکەی قبوڵ بکەم ، بۆیە هاتە لام وەك چۆن مێرد دەچێتە لای ژنی خۆی ..

ئافرەتەکە کەمێ بیدەنگ بوو و فرمێسکەکانی سڕی و پاشان وتی : هەوڵمدا هەڵەی مێردەکەم و کەمتەرخەمیەکەی و سەرقاڵیەکەی و بێبەشیم لەو چارەسەر بکەم ، بەڵام زۆر بەداخەوە بە هەڵەیەکی گەورەتر و تاوانێکی ناقۆلا چارەسەرم کرد کە ئەویش تاوانی ناپاکی ژن ومێردایەتیە .

تاوانێکی مەزنم ئەنجامدا ، سبەینێ چی بڵێم بە پەروەردگارم، چی بڵێم بە کەس و کارەکەم ، ئەی چی بڵێم بە کچانی هاوڕێم ؟ دان بەوەدا دەنێم کەمن تاوانبارم ، من دەرگام کردەوە بۆ مێش و مەگەز ، دان بەوەدا دەنێم کەخۆم دەروونی خۆم کوشت ، من کوژراوم و هەر خۆیشم بکوژم .

پێم وت : خوشکی بەرێزم بە راستگۆیانە پێم بڵێ ؟ ئایا لە گەڵ ئەو لاوە داوێن پیسەدا ئەوەی کە بە دوایدا دەگەڕایت لە سۆزی راستگۆیانەوە و لە هەست و ئەوین دەستت کەوت ؟

وتی: نا نە بەخوا دەستم نەکەوت و هیچ ئافرەتێك کە ناپاکی لەگەڵ مێردی یان کەس و کاری دەکات دەستی ناکەوێت ، ئەزانی یا شێخ بۆچی ؟ چونکە ئەو هەستە ناسك و جوانانە گەشە ناکەن و پێناگەن لە ژینگەیەکی پاك و خاوێندا نەبێت کە ئەویش ژینگەی زەواج و خێزانداریە، وە ئاو نادرێت بە ئاوی پاکژ نەبێت کە ئەویش ئاوی خۆشەویستی ژن ومێردە.

بەلاَم زۆنگاوەکانی ناپاکی و زبڵدانەکانی قسەکردنی ناشەرعیەکان، ئەوە کەشێکی ژەهراوی و گوناهاوی و پڕ لە میکرۆبە، کە ئەستەمە مانا جوانەکانی تێدا بژی یان سۆزە ناسك و راستگۆکان سەوز بێت تیایدا .

ئافرەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو پاشان وتی : یا شێخ من چی بکەم ؟ تکات لێدەکەم رزگارم بکە ، چی بکەم ئەو هەڕەشەم لێدەکات کە لە بەردەم مێردەکەمدا بە کاسیەتە دەنگیەکان فەزحم بکات .. پاشان دەستی کرد بە گریانێکی بەردەوام .. لە راستیدا دڵم ئازاری چەشت بۆ ئەو ئاهو حەسرەتە ، جەرگم پارچە پارچە دەبوو بۆ ئەو فرمێسکە گەرمانە ، دڵم هاتە جۆش بۆ ئەو راستیە تاڵانە کە لەناخیدا مەینەتی کۆمەڵگاکەمانی هەڵگرتبوو، کەزۆرێك لەتاکەکانی بەرگەردەلولی ئارەزوات کەتوون و بوونەت دیلی شەهوەت، دوایش چنینەوەکانیان درك و داڵ و برینداریە ...کە دڵ بریندار دەکات و ئەسرین دێنێ بە چاواندا پاشان پێم وت : خوشکی بەرێزم کشتوکاڵەکەت بریتی بوو

لەتاوان و ئێستاش خەرمانەکەت تالآوە ...بەلآم هێشتا فرسەت لە بەردەستدایە تا هەڵەکەت راست بکەیتەوە ، ئەوەی تۆ ئەنجامت داوە تاوانێکی گەورەیە بەلآم لەوە گەورەتر بەردەوام بوونت و سووربوونتە لەسەر ئەوتاوانە ..

خوشکی بەرێز نێوان خۆت و خوای خۆت چاك بکە ، خوای گەورەش ئەو مێردەت بۆ چاك دەکات، وە نێوان تۆ و نێوان ئادەمیزادەکان چاك دەکات ، بگەرێوە بۆ لای خواو تەوبەیەکی پاك و یەکجاری بکە ، خوای گەورە تۆبەی تۆبەکاران قبوڵ دەکات ، لەمپەری سەرەرۆیان کەم دەکاتەوە وخۆش دەبێت لەوانەی کە داوای لێبوردن دەکەن ..

خوشکی بەرێزم ئەو پەیوەندیە لە گەڵ ئەو لاوە داوێن پیسەدا بپچرێنە ، کە تەنها تێربوونی شەهواتە ئاژەڵیەکانی دەوێت لە تۆ و بەسەربردنی کاتە بەتاڵەکانی ، چۆك دامەدەو لە بەردەم هەرەشەکانی تەسلیمی و پەستانەکانی مەبە ، چی دەوێ با بیکات، دڵنیابە کە ناتوانێت ئەو کاسیەتانە بلآو بکاتەوە ، چونکە پێش ئەوەی تۆ زیانت پێ بگات ئەو زیانی پێدەگات .

قسەکردنەکان لە گەڵ ئافرەتەکە تەواو بوو ، بەلآم دەروونمی پرکرد لە ئازار و پرسیاری زۆر کە مرۆڤ بەرگەی نەدەگرت ، بۆچی هەق ئەناسین و و پشتگیری ناکەین ؟ بۆچی شوێن پێی پێغەمبەرمان ﷺ هەڵنەگرین لە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکانماندا ؟ بۆچی دڵەکانمان و عەقڵمان بێئاگا بێت تا وای لێبێت رەقتر بێت لەئاسن و ناڵێم بەرد ، چونکە بەردی وا هەیە بە ئاوی بەردەوام شەق دەبات ، پاشان کاتێك دروێنە دەکەین دەگرین بۆ ئەو رۆژگارانە و دەگرین بۆ بەخت و غەریبی رۆژگار .

دوای نزیکەی مانگ و نیوێك ئەو ئافرەتە جارێکی تر پەیوەندی کردەوە ، بەڵام ئەم جارە و ئەو جارەی تریان جیاوازیان زۆر بوو ، دەنگی هێمن و دامەزراو بوو ، لە دەنگ و قسەیدا نوری ڕێنمایی و ئیستقامەت و خۆڕاگری دەبینرا ، لە پیتەکانیدا دڵئارامی و بەختەوەری و هێمنی دەروونی دەبریسکایەوە ، پاشان پێ وتم : یا شێخ ژیانم بە تەواوی گۆڕا ..من سەر لەنوێ لە دایك بوومەوە ، بەراستی خۆری ڕێنومایی هەڵهات بە سەر تاریکستانی ژیانی بێنومێدیمدا و نور و ئارامی و دامەزراوەیی جێگەی گرتەوە ، کاتەکانم زیندوو کردووەتەوە بە گوێڕایەڵی خوای گەورە ، سوپاس بۆ خوا رزگارم بوو لەو رابردووە تاڵە ، هەرچەندە لەو پێناوەدا بەرەو رووی نارەحەتی زۆر گەورە بوومەوە ، کە پشت بە خوا لای خوای گەورەی پاداشت دەدرێمەوە ، بەڵام لە کێڵگەی دڕکاویدا گوڵ ناچێنرێتەوە .... مێردەکەم مامەڵەی لە گەڵمدا کەمێك باش بوو بوو ، بە هۆی ئەو گۆرانکاریەوە بە سەر ژیانمدا هاتبوو ، وە ئومێد و متمانەی زۆرم بە پەروەردگار هەیە کە سنووری نیە، کە ڕێگای بۆ ڕووناك بکاتەوە و ڕێنومایی بکات بۆ ڕێگای راست، و کۆ ببمەوە لە گەڵیدا لە دنیادا لە سەر خۆشەویستی و سۆزداری و لە قیامەتیشدا و لە بەهەشتی نەبڕاوەدا .

ئەم چیرۆکە شێخ ( نواف المرتقی ) گێڕاویەتیەوە

# کەسوکاری مێرد مردنە

خالید لەنوسینگەکەیدا بەخەفەتباریی و غەم و پەژارەوە دانیشتبوو.. (صالح)یش کەهاوڕێی بوو لەسەر کار هەستی بەو ماتەمی و پەژارەییە دەکرد لە ڕوخساریدا، لەنوسینگەکەیەوە هەستا و نزیک بوویەوە لە خالیدو پێی ووت: خالید ئێمە هاوڕێ و برای یەکترین پێش ئەوەی هاوڕێی سەرکاربین هەستم پێ کردویت نزیکەی هەفتەیەک دەبێت تۆ هەمیشە بیر دەکەیتەوە و زۆر بێزاریت و نیشانەی غەم و پەژارەیی لەڕووخسارتا دیارە، وەك ئەوەی غەمی هەموو دنیات هەڵگرتبێت.. تۆ باش دەزانیت خەڵك بۆ خەڵکە و هەموان برای یەکترن بۆ خوا.

خالید کەمێك بێدەنگ بوو پاشان ووتی: (صالح)ی هاوڕێم سوپاست دەکەم.. ئەمە هەستێکی جوانە... بێگومان من هەست دەکم پێویستم بەکەسێك هەیە غەممەکانم و کێشەکانمی لا باس بکەم.. بەڵکو یارمەتیم بدات لەچارەسەرکردنیدا..

خالید لەدانیشتنەکەیدا ڕێك بوویەوەو کوپێ چای بۆ صاڵحی هاوڕێی تێکردوو پاشان ووتی: (صالح)گیان خۆت باش دەزانی من نزیکەی هەشت مانگە ژنم هێناوەو خۆم و خێزانم لەماڵێکداین پێکەوە بەتەنها دەژین.. بەلام کێشەکە لەوەدایە برا بچوکەکەم (حەمەد) کەتەمەنی بیست ساڵە.. دواناوەندی تەواو کردووە و لەزانکۆ وەرگیراوە لێرە، دوای هەفتەیەك یان دوو هەفتە یەت بۆ ئێرە..

تادرێژە بە خوێندنەکەی بدات، لەبەر ئەوە دایکم و باوکم زۆر بەتوندی داوایان لێکردم کە (حەمەد) لەماڵی ئێمەبێت لەبری ئەوەی لەگەڵ هەندێ لەهاوڕێکانی لەشوقەدابیچت، چونکە دەترسان سەرەڕۆ بێت و

لەدەست دەرچێت.. وەخۆت دەزانیت ئەو شوقانە هەموو جۆرە مرۆڤێکی تیادا کۆبووەتەوە لەباش و خراپ و بەڕەوشت و فەوتاو.. وەك دەزانیت هاوڕێ سەرنج ڕاکێشە.. منیش زۆر بەتوندی ڕازیی نەبووم چونکە وەك ئاشکرایە لەلات گەنجێکی هەرزەکارو بوونی لەماڵی مندا مەترسییەکی گەورەیە.. هەموومان بەقۆناغی لاوی و هەرزەکاریدا ڕۆیشتووین.. باش دەزانین چۆنە.. هەندێ جار لەماڵ دەردەچم ئەو لە ژوورەکەیدا خەوتووە.. وە هەندێ جار بۆچەند ڕۆژێ لەماڵ دەردەچم بەهۆی بارودۆخی کارەکەمەوە.. و هەندێ جار.. و هەندێ جار... نایشارمەوە لەلات من پرسیاری زانایەکی بەڕێزی ئاینیم کرد لەم بارەیەوە.. ئەویش ئاگاداری کردم کە ڕێگا بەهیچ کەسێك نەیەم با برایشم بێت.. تابمێنێتەوە لەگەڵ من و لەگەڵ ژنەکەمدا لەماڵەکەدا.. وە باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ)ی بۆ کردم لەو بوارەدا کە دەفەرموێ ((الحمو الموت)) واتە ((هێوەر –شوبرا– مردنە)) واتە مەترسیترین شت بۆ سەر ژن خزمایەتی نزیکی مێردەکەن وەکو برای و مامی و خاڵی و کوڕەکانیان چونکە ئەو کەسانە زۆر بە ئاسانی دەچنە ماڵەوە و کەسیش گومانیان تێ نابات.. ئالێرەوە سەرگەردان بوون پێیان مەزنترو مەترسیدارترە.

پاشان شاراوە نیە لەلات کاك( صالح) کەپیاو دەیەوێ لەگەڵ ژنەکەیدا بەتەنها لەماڵێکدا بێ.. تا بەتەواوی بحەوێتەوەو بە شێوەیەکی باشتر بژین پێکەوە.. ئەمەش دەستەبەرنابێت ئەگەر (حەمەد)ی برام لەو ماڵەدا بێت، خالید کەمێك بێدەنگ بوو پاشان قومێکی لەچاکەیدا کەلەبەردەمیدابوو.. پاشان ووتی: کاتێ ئەمەم ڕوونکردەوە بۆ باوکم و دایکم و بۆچونی خۆمم بۆ شیکردنەوەو سوێندم بۆ خواردن بەخوای

مەزن من هەموو کارێکی خێروچاك بۆ براکەم دەخوازم.. ئەوان توڕەبوون لێم و لای خزمان هێرشیانکردە سەرم، تۆمەتباریانکردم بەوەی کە مافیانم نەداوە، وە بەوە وەسفیان کردم کە دڵم پیسەو نیەتم خراپە، چونکە گومانی خراپ دەبەم بە براکەم، لەکاتێکدا ئەو ژنی من وەکو خوشکی گەورەی خۆی تەماشا دەکات.. وە بەکەسێکی ئێرەیی پێبەر وەسفیان دەکردم و من چاکەی براکەمم ناوێت و نامەوێ خوێندنی زانکۆی تەواو بکات..

خراپتریش لەوە (صالح)گیان باوکم هەڕەشەی لێدەکردم و دەیوت: ئەمە فەزاحەتێکی گەورەیە لەناو خەڵکیدا.. چۆن براکەت لەگەڵ بێگانەدا بێت تۆش ماڵت لەوێ بێت.. بەخوا ئەگەر (حەمەد) لەماڵەکەی تۆدا نەمێنێتەوە من و دایکت لەمڕۆ بەدواوە تا دەمریت دەت بوغزێنین و ناتدوێنین و نەماندوێنیت.. ئێمە لەدنیاو لەقیامەتا بێ بەرین لەتۆ..

صالح کەمێك کێشای بەسەری خۆیداو پاشان وتی: بێگومان تۆ ڕای منت دەوێت لەم مەسەلەیەدا و زۆر بەڕاشکاوانەو ئاشکرا.. لەبەر ئەوە(خالید) ڕێگام بدە پێت بڵێم تۆ کەسێکی دوودڵیت و ئەگەرنا پێویست بەو هەموو کێشەو ناکۆکیە ناکات لەگەڵ دایك و باوکت.. ئایا نازانیت ڕەزامەندی خوا لەڕەزامەندی دایك و باوکەوەیە، وە توڕەبوونی خوا لەتوڕەبوونی ئەوانەوەیە، چی ڕوودەدات ئەگر براکەت لەیەك ماڵدا لەگەڵ تۆدا بژی؟ کاتێ تۆ لەوێ نیت هەڵدەستێ بە کاروبارو پێداویستی ماڵەوە بەهەر هۆیەکەوەبێت، کاتێ تۆ لەوێ نیت دەبێتە پیاوی ماڵەکە.

پاشان صالح کەمێك بێدەنگ بوو تا کاریگەری قسەکانی ببینێت لەسەر ڕوخساری خالید پاشان وتی: پاشان من لێت دەپرسم بۆچی گومانی

خراپ دەبەیت بە براکەت بۆچی بێ تاوانان تۆمەتبار دەکەیت بەبێ بەڵگە؟ ئایا بیرت چوو کە پەروەردگار دەفەمروێ (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنْ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ)الحجرات:١٢.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هەیە زۆر دووربکەونەوە لەگومان، بێگومان هەنێ لەگومانەکان تاوانن.

پێم بڵێ ئایا متمانەت بە ژنەکەت نیە؟ ئایا متمانەت بە براکەت نیە؟

خالید پێی بچڕی ووتی: من متمانەم بەژنەکم و براکەم هەیە، بەڵام..

صالح پێی بڕی و بە لۆمەوە ووتی: گەڕاینەوە بۆ گومان و خەیاڵی خراپ.. دڵنیابە خالید (حەمەد)ی برات دەبێتە شوانێکی دەست پاکی ماڵەکەت کاتێ تۆ لەوێیت و کاتێکیش لەماڵەوە نیت..

هەرگیز براکەت ڕێگا بە خۆی نادات نزیك بێتەوە لە براژنی خۆی چونکە وەکو خوشکی خۆی تەماشای دەکات. تۆ لەخۆت بپرسە (خالید).. ئەگەر (حەمەد)ی برات ژنی هەبوایە، ئایا تۆ بیرت لەدەستدرێژی دەکردەوە بۆسەر ژنەکەی یان زیانی پێبگەیەنیت؟

پێم وایە وەڵامەکە ئاشکرایە لەلات؟

خالید بۆچی براکەت و باوکت و دایکت لەدەست دەدەیت و خێزانەکەت پەرتەوازە دەکەیت لەپێناوی ئەندێشەو خەیاڵ و گومان و ئەگەرانێکدا کە بوونیان نییە.. عاقڵبەو باوك و داکیت ڕازیکە تاوەکو خوای گەورە لێت ڕازی بێت.. وە بۆئەوەی گومان و دوودڵیت نەمێنێت ڕێنماییت دەکەم کە (حەمەد) لەبەشی پێشەوەی ماڵەوە نیشتەجێ بکەیت، وە ئەو دەرگایەی بەشی پێشەوەو ژوورەکانی تر جیا دەکاتەوە دایبخەیت..

خالید ڕازیی بوو بە قسەکانی (صالح)ی هاوڕێی.. چارەی نەمابوو ڕازی بوون نەبێت بەوەی کە (حەمەد)ی برای بێنێتە لای خۆی..

دوای چەند ڕۆژێ (حەمەد) گەشتە فڕۆکەخانەو خالیدیش پێشوازیی لێکردو پاشان پێکەوە چوون بۆ ماڵی خالید تاوەکو (حەمەد) لەبەشی پێشەوە نیشتەجێ ببێت.. کار بەوشێوەیە گوزەرا.. ڕۆژگار بەویستی خوای گەورە بەسەرچوون کە هەر زاتی خۆی زانا بوو بە هەمووشتێ..

ئێستا ئێمە چوارساڵمان تێپەڕاندووەو خالید تەمەنی گەشتووەتە (٣٠) ساڵ و بووە بە باوکی سێ منداڵ..

(حەمەد)یش لە دواهەمین قۆناغی زانکۆدایەو خەریکە خوێندن تەواو دەکات.. خالیدی برای بەڵێنی پێداوە کە لەزانکۆ بیکات بە فەرمانبەر لە شوێنێکی گونجاودا.. وە هەر لەماڵیاندا بمێنێتەوە تا ژن دێنێت و لەگەڵ ژنەکەیدا بچنە ماڵی خۆیانەوە.

ئێوارەیەکیان خالید بە ئۆتۆمبێلەکەی دوای نیوەی شەو دەگەڕایەوە بۆ ماڵ.. بەیەکێ لەڕێگاکانی گەڕەکەکەی تەنیشتی ماڵەکەیاندا دەڕۆشت... لە دوورەوە دوو تارمایی ڕەشی بینی کە لەتەنیشت ڕێگاکەدابوون.. نزیك بوویەوە لێیان.. بینی پیرەژنێکی بەتەمەنە لەگەڵ کچێکدا کە کەوتووە بە زەویداو کچەکە دەناڵێنێ و هاوار دەکات، پیرە ژنەکەش هاوارو واوەیلایەتی: (خەڵکینە پیاو چاکان فریامانکەون ڕزگارمانکەن)، خالید سەری سوڕما لەو حاڵەتە.. حەزی دەکرد زیاتر نزیك بێتەوە لێیان و پرسیاریان لێ بکات بۆچی لەقەراغ ئەو ڕێگایەدان، پیرەژنەکەش ووتی کە ئەوان خەڵکی ئەم شارە نین تەنها هەفتەیەك نابێت نیشتەجێن لێرەو کەسیش لێرەناناسن و ئەم کچەش، کچی خۆیەتی و مێردەکەی سەفەری کردووە بۆ دەرەوەی شار بۆ ئیش

کردن.. ئازاری ژان و منداڵ بوون، پێش وادەی دیاریکردنی خۆی زۆری بۆهێناوەو کچەکەی خەریکە لەتاو سەختی ئازار دەمرێت، و کەسیش شك نابەن بیانگەیەنێتە نەخۆشخانە تا لەوێ کچەکەی منداڵی ببێت، پاشان پیرە ژنەکە بەچاوی پڕ فرمێسکەوە لێی دەپاڕایەوە و دەیوت: تکات لێ دەکەم، قاچەکانت ماچ دەکەم چاکەمان لەگەڵدا بکەو کچەکەم بگەیەنەرە نزیکترین نەخۆشخانە، خوای گەورە خێزانت و منالەکانت لەهەموو ناخۆشیەك بپارێزێت.. فرمێسکی پیرەژنەکەو هاواری ئافرەتەکە کەکەوتبووبە سەر زەویدا کاریان کردە سەر دڵی خالید، بۆیە بەهۆی پیاوەتی و جوامێری و یارمەتی لێقەوماوانەوە بەزەیی پیایاندا هاتەوەو ڕازیی بوو کە بیانگەینێتە نەخۆشخانە، هەستا بەیارمەتیدانی پیرەژنەکەو ئافرەتەکەیان خستە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە پاشان بەپەلە گەیاندنیە نزیکترین نەخۆشخانەی منداڵ بوون.. پیرەژنەو ئافرەتەکە بەدرێژایی ڕێگاکە دوعای خێرو سەرکەوتنیان بۆ دەکرد کە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵ و منداڵیەوە.

دوای کەمێك گەشتنە نەخۆشخانە، دوای تەواوبوونی ڕێو ڕەسمی یاسایی لەو جۆرە حاڵەتانەدا ئافرەتە برا بۆ ژووری نەشتەرگەریی بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری چونکە بەسروشتی منداڵەکەی نەدەبوو..

بەهۆی جوامێری و پیاوەتی و خاکیبوونیەوە خالید حەزی نەدەکرد بڕوات و ئەو پیرەژنە هەژارە جێ بێڵێت لەگەڵ کچە بێچارەکەیدا بەتەنها، تا دڵنیا نەبێت لەسەرکەوتنی ئەنجامی نەشتەرگەریەکەو لەدایك بوونی منداڵەکە بەسەلامەتی.. بە پیرەژنەکەی ووت :ئەم چاوەڕوانی دەکات لەهۆڵی چاوەڕوانی پیاوان و داوای لێکرد ئەگەر نەشتەرگەریەکە تەواوبوو منداڵەکەش بەسەلامەتی لەدایك بوو مژدەی پێبدات.. بۆیە

پەیوەنـدی بـە ژنەکەیـەوە کـرد لەماڵـەوەو هـەواڵی پێـدا کـە کـەمێك دوادەکەوێت و دڵنیای کرد کە دڵی هیچ نەکات.

خالیدی لەهۆڵی (چاوەڕوانی پیاوان) دانیشت و پشتی نا بەدیوارەکەوە ..بۆیـە خـەو زاڵ بـوو بەسـەریداو هەستی بەخۆی نـەکرد.. خالیـد نـەی زانی چەنێك بەسەر کاتەکەدا تێپـەڕیوە کە خـەوتووە.. بەڵام ئەوەی کە بەتەواوی لەیادی ئەمدا نەبوو کە هـەرگیز لەبیروهۆشیدا ناسڕێتەوە کە بەهۆی دەنگی قیـژەوە بەخەبەر هـات.. بینـی دوو پیـاوی ئاسـایش لێـی نزیك دەبنەوەو پیرە ژنەکە هـاوار دەکـات و بەدەستەکانی ئامـاژە بۆ ئەم دەکات و دەڵێ: ئەوەتا.. ئائەوەتا، خالید سەرسام بوو لـەو هەڵوێستە و لە شوێنی خۆی هەستایەوەو بەپەلە چوو بۆلای دایکی کچەکەو دەست پێشخەری کردوو بەتاسـەوە ووتـی: ئایا منداڵەکە بەسەلامەتی لـەدایك بوو.. پێش ئەوەی پیرەژنەکە هیچ بڵێت.. ئەفسەری ئاسایش لێـی نزیـك بوویەوەو پێی ووت: تۆ (خالید)یت ووتی: بەڵێ.. ئەفسەرە ئاسایشەکە پێی ووت دەمانەوێت پێنج خولەك بێیت بۆ ژووری بەڕێوەبەر..؟ هەموان چوونە ژووری بەڕێوەبەر دەرگاکـەیان لەسەرداخستن.. لـەوێ پیرەژنەکە هـاواری دەکـرد و دەیکێشا بـە ڕووخـساری خۆیـداو ڕوومـەت و قـژی خۆیی دەڕنـی و هـاواری دەکرد: ئەوە تاوانبارەکەیـە، داواتـان لێ دەکـەم دەسـت بـەرداری مـەبن بـا نـەڕوات.. ئـای داخـی گـرانم بۆکـچی خـۆم... خالیدیش سەرسام بوو بوو.. هیچ تێنەدەگەیشت چی ڕوودەدات.. هـەر سەرسـام و ئەبڵـەق بـوو بـوو تـا ئەفـسەرەکە پێـی ووت: ئـەم پـیرە ژنـە دەڵێت: تۆ زینات لەگەڵ کچەکەیداکردووە و بە زۆر شەرەفت تکانـدووەو سکی لەتۆ بووەو پاشان کاتێ کە هەڕەشـەی لێ کردوویـت کەنهێنییەکـەت ئاشـکرا دەکـات و هـەواڵ بـە پۆلیس دەدات، تـۆش بـەڵێنت پـێ داوە کە

بیخوازیت، بەڵام پاش ئەوەی کە منداڵەکەی ببێت، پاشان منداڵەکە دابنێن لەبەردەم دەرگای یەکێ لەمزگەوتەکاندا تا خێرخوازێك بیبات و بیگەیەننە دەست خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی...!!! خالید بەبیستنی ئەم قسانە ڕاچڵەکی.. دنیا لەبەرچاوی ڕەش بوو.. هیچی نەدەبینی لەبەردەم خۆیدا.. قسەکان لە قوڕگیدا وشك بوو بوون نەیدەتوانی قسە بکات و کەوت بەزەویداو لەهۆش خۆی چوو، دوای کەمێك (خالید) هاتەوەهۆش خۆی و دوو پیاوی ئاسایشی بینی لەگەڵیدان لە ژوورەکەداو ئەفسەرە تایبەتمەندەکە پێی ووت: خالید ڕاستم پێ بڵێ: ڕوخسارت و سیمات وانیشان دەدەن کە تۆ کەسێکی بەڕێزیت و ڕواڵەتت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تۆ لەو کارە قیزەونانەت ئەنجام نەیاوە..
خالید لەکاتێکدا ئازار سوێی بەدڵی بردبوویەوە ووتی: خەڵکینە ئایا ئەمە داپاشتی چاکەیە، ئایا بەو شێوەیە پاداشتی چاکە دەدرێتەوە، من پیاوێکی شەریف و داوێنپاکم، من ژنم هەیەو سێ منداڵم هەیە دوو کوڕم هەیە سامی و سعود و کچێك و نیشتەجێی ئێرەم لەگەڕەکێکی ئاسراودا.. خالید نەیتوانی خۆی بگرێت و فرمێسك بەچاوانیدا هاتە خوارەوە.. ئەوانە فرمێسکی زوڵم و بێزاریی بوون.. فرمێسکی داوێن پاکی و ڕەوشت جوانی بوون.. پاشان کاتێ خۆی هێورکردەوە.. خالید بەسەرهاتەکەی خۆی بەتەواوی بۆ ئەفسەرەکان گێڕایەوە لەگەڵ ئەو پیرەژن و ئافرەتەدا..
کاتێ خالید لەقسەکانی بوویەوە.. ئەفسەرەکە پێی ووت: ئارامبە.. من دڵنیام کە تۆ بێتاوانی بەڵام پێویستە کێشەکە بەڕێگای یاسایی چارەسەر بکرێت و پێوەیستە بەڵگەی بێتاوانیی تۆ دەرکەوێت و کارەکەش ئاسانە لەم جۆرە حاڵەتەی تۆدا.. ئێمە تەنها هەڵدەستین بە

هەندێ شیکاری پزیشکی تایبەت کە ڕاستیمان بۆ دەردەخات! خالید پێی بچڕی: چ ڕاستیەك، ڕاستی ئەوەی کە من بێتاوانم و شەریفم و داوێنپاکم.. ئایا بڕوام پێناکەن.. سەگیش چاکەی لەگەڵدا بکەیت چاك دەبێت لەگەڵت، بەڵام زۆرێك لەخەڵکی ناپاکی دەکەن و خراپەکار دەبن بەرامبەر کەسێ کە چاکەیان لەگەڵ بکات.. بۆبەیانی دەستیان کرد بە پشکنینی بڕێك لە سپێرم ی خالید و ناردیان بۆ تاقیگە بۆ پشکین و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی پێویست.. خالید لەگەڵ ئەفسەرە پسپۆڕەکەدا دانیشت کە لە ژوورێکی تردا بوو.. بەردەوام دووعای دەکرد و پەنای دەگرت بە خوا کە ڕاستی دەربکەوێت! دوای نزیکەی دوو سەعات ئەنجامی سەرسام هاتەوە.. شیکارە پزیشکیەکان دەریانخست کە خالید لەو تاوانە بۆ هەڵبەستراوە بێتاوانە.. خالید نەیتوانی لەخۆشیانداخۆی ڕابگرێت و لەسەر زەویەکە سوجدەی شوکری برد بۆ خوای گەورە، کە پەروەردگار بێ تاوانی ئەمی دەرخست،ئەفسەرەکە داوای لێبووردنی کرد کە بوونەهۆی نارەحەتکردنی و پیرەژنەکەو کچە سۆزانیەکەیان نارد بۆ پۆلیسخانە بۆ بەدواداچوونی کێشەکەو گرتنەبەری ڕێ و شوێنی تەواو...

خالید پێش ئەوەی بڕواتە دەر لە نەخۆشخانە سوور بوو لەسەر ئەوەی خواحافیزی لە پزیشکی پسپۆڕ بکات کە هەستابوو بە کارەکە، بۆیە چوو بۆ ژوورە تایبەتەکەی تا خواحافیزی لێ بکات و سوپاسی هەوڵ و ماندووبوونی بکات.. بەڵام پزیشکەکە پێی ووت: ئەگەر زەحمەت نەبێت چەند خولەکێك کارم پێتە بۆ شتێکی تایبەت.

پزیشکەکە کەمێك پەشۆکابوو پاشان خۆی ڕاگرت و ووتی: لەڕاستیدا لەمیانی پشکنینەکاندا کە ئەنجاممدا گومان دەبەن کە تۆ نەخۆشیەکت

هەیە!!. بەڵام دڵنیا نیم لەوە، لەبەر ئەوە دەمەوێ هەندێ پشکنین بکەیت لە سەر ژنەکەت و منداڵەکانت تاوەکو گومانەکە ببێت بەڕاستی؟؟

خالید کەمێك ترسی لێ نیشت و ووتی: تکات لێ دەکەم دکتۆر پێم بڵێ چیمە من ڕازیم بەقەدەری خوا، بەڵام گرنگتر لای من منداڵە بچوکەکانمە من ئامادەم لەپێناویاندا قوربانی بدەم، پاشان دەستی کرد بە گریان، پزیشکەکە دەستی کرد بە هێمن کردنەوەی و دڵنیا کردنەوەی و پاشان پێی ووت: من لەڕاستیدا ناتوانم ئێستا هیچت پێ بڵێم.. تا دڵنیا نەبم لە کارەکە.. لەوانەیە گومانەکانم لەجێی خۆیاندا نەبێ، بەڵام بەخێرایی ژنەکەت و هەرسێ منداڵەکەت بێنە.

دوای چەند سەعاتێك خالید ژنەکەی و منداڵەکانی هێنا بۆ نەخۆشخانە.. پشکنین و شیکاری پێویستیان بۆ ئەنجامدرا.. پاشان بە ئۆتۆمبێل ڕەوانەی کردنەوەو خالید خۆی گەڕایەوە تاکەمێك قسە لەگەڵ پزیشکەکەدا بکات.. کاتێ پێکەوە قسەیان دەکرد، مۆبایلەکەی خالید جەڕەسی لێدا، ئەمیش هەڵیگرت و چەند خولەکێك قسەی کرد و دایخستەوە، دووبارە کەوتەوە ووت و ووێژ لەگەڵیداو پزیشکەکە پێی ووت: ئەوەکێ بوو پێت دەوت نەکەی دەرگای شوقەکە نەشکێنیت؟!!

خالید ووتی: ئەوە (حەمەد)ی برام بوو.. لەهەمان شوقەدا لەگەڵ مندا نیشتەجێ یە، کلیلەکەی خۆیی وون کردووەو داوام لێ دەکات بەخێرایی بڕۆمەوە تا دەرگاکەی بۆ بکەمەوە.. پزیشکەکە بەسەرسامیەوە ووتی: لەکەیەوە ئەو لەگەڵ ئێوەدایە؟

خالید ووتی: چوار ساڵەو ئەو ئێستا لەقۆناغی کۆتاییدایە لەزانکۆ.. پزیشکەکە پێی ووت: ئایا دەتوانی بانگی بکەیت تا هەندێ پشکنینی

بۆ بكەین تا دڵنیاببین ئایا نەخۆشیەكە زكماكیە یان نا؟! خالیدیش وتی: زۆر بەدڵشادیەوە، سبەینێ دێینەوە بۆلات!!
لەكاتی دیاریكراودا خالیدو (حەمەد)ی برای ئامادەبوون لەنەخۆشخانەو پشكنین و شیكاری پێویست بۆ (حەمەد) ئەنجامدرا، پزیشكەكە داوای كرد لەخالید كە دوای هەفتەیەك سەردانی بكاتەوە تا ئەنجامی كۆتایی بۆ دەردەكەوێ و دڵنیا دەبێ لەهەمووشتێ..
خالید بەدرێژایی ئەو هەفتە پاراو بێتاقەت بوو.
لەكاتی دیاریكراودا هاتەوە بۆلای پزیشكەكە كە بەگەرمی پێشوازیی لێكرد.. داوای شەربەتێكی لیمۆی بۆ كرد تا مێشكی هێور بێتەوە.. پاشان ووردە ووردە باسی ئارامگرتنی بۆ دەكرد لەسەر نەهامەتی و كۆستەكان و دنیا هەر بەو شێوەیە بووە!! خالید پێی بری و وتی: تكات لێدەكەم دكتۆر لەمە زیاتر دەمارم مەسوتێنە، من ئامادەم هەر نەخۆشیەكم تووش بووبێت چونكە ئەوە قەدەری خوایە، ڕاستیەكەم پێ بڵێ؟
پزیشكەكە كەمێك سەری لەقاندو پاشان وتی: زۆرجار ڕاستیەكان ئازاراوی و تاڵ و ناخۆشن!!.. بەڵام دەبێ بزانرێن و بەرەنگاریان ببینەوە!!
ڕاكردن لەبەرەنگاربوونەوە چارەسەری كێشە ناكات و واقیعیش ناگۆڕێت..
پزیشكەكە كەمێك بێدەنگ بوو.. پاشان بۆمبەكەی تەقاندەوەو وتی.
خالید تۆ نەزۆكیت و منداڵت نابێت!!! ئەو سێ منداڵەش منداڵی تۆ نین بەڵكو منداڵی (حەمەد)ی براتن... خالید نەیتوانی گوێ لەو قسە جەرگ

بڕانە بگرێت... هاوارێکی بەرزی لێوەهات کە نەخۆشخانەکە دەنگی دەدایەوە، پاشان کەوت و لەهۆش خۆی چوو.

دوای دوو هەفتە خالید هاتەوە هۆش خۆی تا هەموو شتێك ببینێت لەژیانیداکە دارماوەو تێکشکاوە.. خالید تووشی ئیفلیجی نیوەیی بوو بوو، عەقڵیشی لەدەست دابوو، بەهۆی سەختی کارەساتەکەوە، وە ڕەوانەی نەخۆشخانەی نەخۆشیە دەروونیەکان کرابوو، تا ژیانی لەوێ بەسەر بەرێ هەتا مردن.

ژنەکەشی ڕەوانەی دادگای شەرعی کرابوو بۆ دان پیانانی تاوانەکانی و ئەنجامدانی سزای ڕەجم کردنی هەتا مردن.

(حەمەد)ی برایشی ڕەوانەی بەندیخانەکرابوو چاوەڕوانی سزای شەرعی دەکرد، تا هەقی خۆی وەربگرێت.

سێ منداڵەکەش ڕەوانەی خانەی چاودێریی کۆمەڵایەتی کران تالەوێ لەگەڵ دۆزراوەکان و هەتیوەکاندا ژیان بەسەر بەرن.

وە سونەتی خوا ( الحموالموت ) هەر دەمێنێت وهیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت

وەسیەت: خوشکی بەڕێزم ئایا نابینیت لەمیانی ئەم چیرۆکەدا چی ڕوویداوە ، سوێندت ئەیەم بەخوا ئایا دەخوازیت تۆ لە جێی ئەو بیت ؟ کەواتە بە وەسیەتەکەی پێغەمبەری خوا دروودی خوای لەسەر بێت کار بکە ، چونکە وەسیەتەکەی بۆ تۆیە کە هەرگیز ڕێگا نەدەیت خزمانی مێردەکەت بێنە لات و و سوعبەتت لەگەڵدا بکەن و سۆزیان بدەیتێ .. وە بە پێی پیویست قسەیان لەوگەڵدا بکە و با مێردەکەت ئاگادار بێت .. لەخوای گەورە دەخوازین کە ئافرەتانمان و هەموو ئافرەتی موسڵمان داپۆشراوکات ، وە هەموو ئافرەتێکی موسوڵمان ڕێنومایی بکات کە

هێشتا هەر شوێن مۆدیلە ڕۆژئاوایەکان کەوتوون کە بگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەیان و بالآ پۆشیەکەیان و شەرمەکەیان   والحمد لله رب العالمین

# نامەیەك لە كچێكەوە

ئەم نامەیە کە لە کچێکەوەیە تێیدا ئەڵێت : لە یەکێ لە کۆمەڵگە بازرگانیەکاندا گەشتم بە گەنجێك و ئەویش ژمارەی تەلەفۆنەکەی خۆی پێدام ، منیش ژمارەکەیم وەرگرت ، رۆژ بەرۆژ خۆشەویستی لەدڵمدا زیادی دەکرد ، پەیوەندیەکەی نێوانمان گەشەی سەند ، ئەو لە گەڵ کۆمەڵێ گەنجی تردا بوو، من پەیوەندیم پێوەکرد ، هاورێکانی وەڵامیان دامەوە ، داوام لێکردن کە دەمەوێت قسەی لە گەڵدا بکەم ، جارێکیان پەیوەندیم پێوەکرد بەڵام لەوێ نەبوو ، بۆیە دەستم کرد بە قسە کردن لە گەڵ یەکێکی تریاندا و داوای لێکردم پەیوەندی لەگەڵدا ببەستم ، بەڵام من رازی نەبووم ، بەڵام هەڕەشەی لێکردم کە بە هاورێکەم دەڵێت کە فلان کچ بە بێ ئاگاداری تۆ قسەی لەگەڵ کردم .

منیش داواکاریەکەیم قبوڵ کرد و ئیتر قسەمان لە گەڵ یەکتردا دەکرد ، ئەمیان زیاتر لەوەی پێشووتر شاعیری و رۆمانسی بوو ، پەیوەندیەکەم لە گەڵیدا گەشەی سەند ، و وای لێهات لە گەڵی دەچوومە دەرەوە ، دەیویست منەتبارم بکات و دەیووت واو وا دەکەم .

هەتا بە بەهاترین و بەنرخترین شتی خۆمی بەمێ .

رۆژگار تێپەرین و ناکۆکی کەوتە نێوانمان ، پەیوەندیەکە بۆ ماوەیەك پچرا ، پاشان پەیوەندیم پێوکردەوە بەڵام لەوێ نەوبوو ،کاتێ هەواڵیم پرسی یەکێکیان وەڵامی دامەوە وتی من دەزانم ناکۆکی هەیە لەنیوانتانا ، دەتوانم ئەو ناکۆکیە چارەسەر بکەم .. داوای لێکردم کە بیبینم .

ئەو رۆژە لە بەردەم بینای کۆلێژدا چوومە دەر لەگەڵی بەرەو قەراغی دەریا کەوتە رێ و نەرۆشت بۆلای هاورێکەم ، دەیەویست هەست و سۆزم راکێشی بۆلای خۆی ، بەڵام کاتێ قبوڵم نەکرد ، فڕاندمی و پێی وتم ئەگەر هەر کەس بەم شتە بزانێت وا و وا دەکەم ، وە دەستی کرد بە هەرەشکردن و گەڕاندمیەوە بۆ ئەو شوێنەیەی کە لە گەڵی رۆشتم ، وە فڕێیدام وەك زبڵێکی سەرە رێگا و لێیدا و رۆشت

دوای ئەوە قسەم لەگەڵ هاورێکەمدا کرد و پێم وت : کە هاورێکەی (ج) کەتنێکی ناوەتەوە ئەویش منی هێمن دەکردەوە و دەیووت هەقی تۆی لێدەکەمەوە .

رۆژێکیان یەکێکیان پەیوەندی پێوەکردم و وتی پێم : کە وێنە و قسە کردنی منی لایە و هەرەشەی لێکردووم ئەگەر لەگەڵیدا نەچمە دەرەوە .

چوومە دەرەوە لە گەڵیدا و چەند ساتێکی نەخایاند دەست بەسەریان کردین ، خۆزگە هەر لە سەرتادا دەستگیریان دەکردین بەڵام دوای چی ؟ تازە شەرەفم رۆشت وەك یاریەکی بێنرخم لێهاتبوو لە ناو گورگەکاندا .

ئەم چیرۆکە شێخ ( خالد الراشد ) لە شریتی

( احوال الغارقات ) دا باسی کردووە )

# ( مى ) دراوسێمان

ئافرەتێكیان وتی : ئافرەتێكی دراوسێمان هەبوو لەش و لار جوان و بالآ مامناوەند .. گەنم رەنگ بوو ..دوو لێوی ئەستور و لوتێكی وەك شمشێری هەبوو ، چاوەكانی گەورە بوون تا ئەو رادەیەی بەشێكی زۆری رووخساری داگیر كردبوو، لە گەلّ ئەو هەژاریەی كە لە گەلّ خێزانەكەی بەسەری دەبرد بەلاّم خەزی لە بۆن خۆشی بوو ، ژوورەكەی هەمیشە شوشەگولاّوێكی تێدابوو كە بەكاری دەهێنا لە گەلّ پاكەتێك بخوردی خۆمالّی .. لە گەل دوو شوشەی عەتری بچوك لە عەترە ئاسایەكان وعود و عەنبەر كە یەكێ لە دراوسێكانمان پێشكەشی كردبوو .. بەلّێ ئەو دراوسێیەمان ناوی (مى) بوو كە چاوەكانی هەمیشی كلیان پێوە بوو، وە قژیشی كە هەمیشە لە پێشەوە دەرچوو بوو زەیتی پێوەبوو .

مێردە راوكەرە هەژارەكەی كە ناوی (سالم) بوو .. ئەگەر بە هۆی راوكردنەوەكەیەوە رۆزیەكی دەستكەوتایە لە بازار دەیفرۆشت وشتێكی سوكەی لێ هەلّدەگرت و ئەویشی دەیدا بە پێویستی ژیانی رۆژانەیان .

سالم و مى دە مندالّیان هەبوو گەورەكەیان ناوی وەردە بوو بچوكەكەشیان ناوی رێحانە بوو و منالّەكانی تریشی كوڕ بوون .

مى شوێنی خۆی كردبوویەوە لە ناو دلّی دروسێكاندا، راهاتبوون هەموو بەیانیەك یەكتری ببینن ، دەنگی لە ناو هەمووناندا بەرز دەكردەوە ،و حەز ی لە پێكەنین بوو بە دەنگی بەرز .. و قسەی ناشرینی بەمیان و بەریان دەوت .. هەموو رۆژێكیان بەو شێوەیە بەسەردەبرد .

ئەمڕۆ ( مى ) زۆر پێکەنى .. وەهەروەها قسە وتنى زۆر بەدراوسێکان ..
ئەوانیش پێدەکەنین و گاڵتەیان دەکرد، ماوەى بەیانیان کۆتایى هات بە
ئومێدى یەکتر بینینەوەى نوێ ..( مى ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوەیان بۆ
ئامادەکردنى خواردنى نیوەڕۆ .. بەلاّم ئەو ماسیانەى نەبینیەوە کە
مێردەکەى هەموو کات لە مەتبەخدا دایدەنا .. چاوڕوانى درێژەى کێشا
... سەعاتەکان بە قورسى تێپەڕدەبوون ... دالْغە و خەیالْ مى سەرقالْ
کردبوو، شەپۆل دەى هێناو دەیبرد ونقومى دەکرد ، کاتى ئیتر
ئارامگرتن لە سنوور تێپەڕى .. چووە دەرەوە تا بە دراوسێکان بلْێت
بەلْکو وەلاّمێکى دەست کەوێت و بۆ ئەو ئەندێشەو خەیالاّنەى کە
ئازارى دەدا .

پیاوانى لادێکە و گەنجەکانیان ڕۆشتنە دەرەوە بۆ هەوالْ پرسین
بەلاّم وەلاّم نەبوو .. خۆریش لار بوویەوە دواى ئەوەى خواحافیزى لە
گوندەکە کرد تا بحەوێتەوە لەو ماندووبوونە دوور و درێژەى ڕۆژ ..
هەرچى ڕووناکى هەبوو بردیەوە ..( سالم ) یش نەگەڕایەوە .. بەلاّم
دارو پەرودوى بەلەمەکەى گەڕایەوە . دواى ئەوەى دەریاکە قووتى
دابوو بۆ سنگە قوڵەکەى تا بیگوازێتەوە بۆ جیهانى نادیار ..

مى ومندالْەکانى دواى خواى گەورە تاکە سەرپەرشتیارى خۆیان
لەدەستدا . مەینەتى دەورەیدان ...، خەندە و پێکەنین گۆڕا بۆ ئاهو
حەسرەت وناخۆشى .

دوێنێ دەریا هیوا و ئومێد بوو ، ئەمڕۆ چاوەکان بەفرمێسکەوە بۆى
دەڕوانن .. سەرنجە ناخۆش و وەمەینەتیەکان پرسیار لە شەپۆلەکانى
دەکەن .. لەوێ خۆشەویستێك ئارامى گرتووە کەسێك نیە ڕزگارى
بکات، مرۆڤ ناتوانێت لەقەدەر ڕابکات، ئەو خۆشەویستەش ناگەڕێتەوە

.. .. خـــۆر پرسـيار دەكـات و ئەســتێرەكانیش بەدوایــدا دەگـــەڕێن . بەلەمەكەی بەشكاوی گەڕایـەوە .. بەڵام ...بەڵام ئەو و ئومێدەكانی لـە سینەیدا مانەوە .

هەموو خەونەكان لەبار چوون . لەوێ لە ماڵە پەرپوتەكەیدا شتەكان پێویستیان بە چاكردن و گۆڕین هەیە .. تۆڕ .. زەوی ..پاڵتاو .ئاوێنـەی شكاو... ( سالم ) بەو ئاوێنـە شكاوە تەماشای مووە سپیەكانی دەم و چاوە باریكەكەی دەركرد كە خەریك بوو ریش و سەری پڕ دەكرد... ئاوێنەكـەش چـاوەڕوان بـوو تـا دەم وچـاوە باریكەكـەی ببینێـت .. خۆشـیەكان لـەدڵی منداڵەكانـدا مـرد ..بێنـەوایی ڕۆژ بـە ڕۆژ پـەرەی دەسەند ...لە گەڵ یارمەتیدانی پیاو چاكاندا دەریاش لە پاڵ ماڵەكەدا سالمی پێچایەوە بە شەپۆلەكانی، بەڵام یادگاری و یاداشت وەستانیان بۆ نەبوو ، وە ڕۆح و دڵی خۆشەویستانی ئاگری دەسەند .

مـاوەی عیـددە تـەواو بـوو بـەڵام خەمـەكان كۆتایـان نـەهات، ژیـان دەگوزرا تا دەست بكاتەوە بە خولی نوێ و ژیانی تر ، توێشووی ڕۆژگار تەنها ئازار و ئارام برین بوو .

(می) شەوێكیان كە مانگەشەو بوو دنیای ڕووناك كردبوویـەوە بیری لە ڕێگایەك دەكردەوە لـە برسیەتی و ڕووتـی و ڕەجاڵی ئـەو هەتیووانـە كەم بكاتەوە . هەموو بیر و خەیاڵێكی ئەمدیو ئەودیو دەكرد ڕێگایـەكی بینیەوە كە پێی وابوو ئاسانە و بۆ داهاتی گیرفانیش باشە ..

( وەردە ) ی كـچە گـەورەی كـە خوێنـدنی ئامـادەیی تـەواو كردبـوو، جوان و پێكەوتەو باڵا بەرز بوو .. دوو چاوی سەوز و دوو لێوی باریكی پێوەبوو .. دەینێـرم بـۆ بەسـەربردنی شـەوە سـوورەكان وتیاچـوون.... (مـی) بـەو شـێوەیە لەگـەڵ خۆیـدا دوا .. شـەوێك لـەو شـەوانە ( وەردە)

ڕۆشت بۆ جیهانی نادیار، گەڕایەوە بە پارەیەکی زۆرەوە ، داوێنپاکی خۆی لە بازاری ئازاددا فرۆشت .. پاشان گەڕایەوە و پارەکەی کردە کۆشی دایکیەوە ..

ڕۆشتە سەر جێگاکەی .. فرمێسك بە خوڕ بە چاوانیدا دەهات تاوەکو ئەو حەیاچوونە بشۆرێتەوە .. روخساری بە پشتیە سپیەکە داپۆشی ..نەخەوت ... جیهانەکەی دەوروبەری نوێ و تازە بوو، لەمەولا هەموو شەوێ کاری لە بەردەمدایە ، کەچی هێشتا یەکەمین ڕووداو هێناویەتیە لەرزین ..

شەوێکی تر می لە کچەکەی پاڕایەوە پارەی زیاتری بۆ بهێنێت ..(وەردە ) بە سەرسامیەوە روانیە دایکی وپاشان ڕۆشت .

بەڵام شەوی دووەمی کەمتر قورس بوو بەلایەوە ، ئەو شەرمەی کە هەیبوو خستیە ناو خۆڵی تیاچوونەوە ... بە خێرایی خۆڵی تینوو ئەمی خوارد و تا بەرهەمێك بێنێتەبەر کە هەر لە سەری شەیتانەکانی دەکرد .. بەو شێویە ( وەردە ) بە تەواوی داڕنرا لە رەوشت و هەتا وای لێهات پسپۆڕ بوو لە بواری هونەری شەوە سوورەکاندا ..

دە ساڵ بەو شێوەیە تێپەڕی ( وەردە ) حەزی لەسەری پیاوان بوو براکانی گەورە بوون و بوونە خاوەنی پارەو پولێکی زۆر، گواستیانەوە بۆ شار، دوای ئەوەی خانویەکی نوێیان دروست کرد... هەموو براکانی ژنیان هێنا و بڵاوەیان کرد، هەموویان دەستیان کرد بە ژیانی نوێیان لە ماڵدا تەنها وەردە ودایکی مابونەوە ..می دنیای بەجێهێشت تا بگات بە ئایندەی خۆی .. ماڵەکە بەتەواوی چۆڵ بوو .

ئێستا وەردە تەمنی چل ساڵە و لاشە سیس و داچۆڕاو و روخساریشی رووناکی تیا نەماوە .. تەمەنی بەرەو زەرد بوون دەچوو،

شەوانی سوور بۆ ئەم هیچ سوودیی نەمابوو ، گەڕا بەدوای برا کانیدا ، ماڵی لە بازرگانیەکدا خەرج کرد کە هەر شتێکی هەبوو لە دەستیدا ..وگەڕایەوە ماڵەوە، نەیدەتوانی بڕواتەوە ماڵەوە .. لەناو باخچەکەدا وەستاو وتەماشای خشتی خانوەکەی دەکرد ، هەر خشتێك لەو خشتانە پارەی داوێنپاکی پێدراوە هەموو خشتێك تیاچوون و حەیا چوون وکۆیلەیی دەهێنایەوە یاد .. بۆ غەیری خوا .. هەموو خشتێك ئەمی دەکوشت بەهەزار شمشێری ژەهراوی، بە بیر و هۆشە شەکەتەکەی تەماشای شریتی یادگاریەکانی خۆی دەکرد کە پێش مردنی باوکی چۆن بوون ، لەگەڵ ئەو هەژاری و دەردی سەریەدا پاکیزەیی و داوێنپاك بوو .تەماشای ژیانی خۆی دەکرد پێش مردنی، ژیانی ماڵ و دەوڵەمەندی و سەروەت و سامان و ژیانی مردن و دەردی سەری .. نزیك بوویەوە لەدیوارەکەو دنیا لەبەرچاوی تەسك بووبوویەوە .. هەستی کرد کەمردن لە ئان و ساتدایە بۆی .. دەنگی بانگی مەغریبی هاتە بەر گوێ و بانگی لە رۆحەکان دەکرد بۆ نیگای موناجات و و تەسبیحاتی نوور .. ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوو .. وەك ئەوەی پێشتر گوێی لەو بانگە نەبووبێت .

ئازارەکان زۆریان بۆ هێنا بوو کە خەریك بوو هەناسەی لێ دەبڕی .. وەك ئەوەی چل ساڵ چووبێتە سەر تەمەنی لەماڵ چوویە دەرەوە بەقەراغ رێگاکاندا دەرۆشت .. بە پاڵ ماڵێکدا دەڕۆیشت،دوو منداڵ دەهاتنە دەرەوە لەماڵەکە، یەکێکیان بە قەدی درەختێکدا سەرکەوت و دووەمیشیان ویستی سەربکەوێت... یەکێکیان بەوی تریانی وت : ئایا ئەزانی ئەو ئافرەتە کێیە ؟ ئەو ئافرەتی شەوانەیە.... ئەویان وتی: بۆچی وای پێ دەڵێت ؟ لەوانەیە جنۆکە بێت ! پێدەکەنی .. ئەزانی

ریشمان لێدەرنەهات، بەڵام بەخێرا راکەینەوە بۆماڵەوە تا سیحری لێنەکردووین .

فرمێسک بە چاوانی وەردەدا دەهاتنە خوارەوە، قسەکان بەرگوێکەوتن ... قسەی منداڵەکان ئەمی هێنایە لەرزین .

ئەی ئەبێت گەورەکان سەبارەت بەم چی بڵێن ؟ شەرەف و داوێنی پاکی خۆی فرۆشت ، ئێستاش بەرەو ئایندەیەکی نادیار هەنگاو دەنێت . زۆر رۆیشت تاگەیشتە ئەو گۆڕستانەی کە مەزارگەی دایکی لێبوو ، لە سەر گۆڕەکەی دانیشت و بە دڵێکی کەف و کوڵەوە بانگی کرد : ئایا تۆ شایەنی ئەو ناوە پیرۆزەی ؟!

تۆ منت بەرەوەو هەڵدێر برد ، خانوویەکەم بۆ نیات نایت ئەوە ئێستا چۆڵەوانەیە و رەشەبا یاری پێ ئەکات.. رەشەبا خۆی ئەکێشێ بە پەنجەرەکانیدا و لەناو ئەو ماڵە بێدەنگەدا دەیکات بە زرم و کوت ..خۆزگە پیشەی من کارەکەرێ بووایە لەماڵاندا .. رۆژێك تێر دەبووم و رۆژێك برسی .. بەڵام زۆر سەربەرزانە سەرم بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان هەزارن رێگای تر هەبوون کەمن بەرەوە هەڵدێر نەبات .

ئەگەر پرسیار لە خۆشکەکانیشم دەکەیت پەروەردەم کردن بە تەمەنم و پاکیزەیم و داوێنی پاکیم...کەچی ئەوان دەستبەرداری من بوون و و ئەو تەمەنەی کە لە پێناو ئەواندا بە زایەم کرد فەرامۆشیان کرد...ئەوانە منداڵی تۆ بوون دایکە .

ئاواتەخواز بووم رۆژێ لە رۆژان مێردێکم هەبێت و سەرپەرشتی و چاودێریم بکات ، تا ببمە حۆری بەهەشتەکەم ... و خانمی کۆشکەکەم ... ئای چەندە تامەزرۆی بیستنی وشەی دایە بووم لە زاری منداڵێکمەوە و بە سۆز و بەزەییەوە بینێم بە سینگمەوە ، خواردن و

خواردنەوەی بەمیَ و ئیشی بۆبکەم و بیلاویَنمەوە ... ئەویش شنە شنم بۆ بکات و دلَم پڕکات لە ئاسودەیی ..و لەم پایزیی تەمەنەدا بێتە کۆمەك بۆ من .

من لە زەوی خوای گەورەدا کەسێکی سەرەڕۆم .. و لە ئاسمانەکەیشیدا نەفرەت لێکراوم بە هۆی مەزنی تاوانەکەمەوە .

نە زەوی دەمگرێتە خۆی و نە ئاسمانیش ئەمخاتە ژێر باڵی خۆی ، تۆ خۆت لەزەتت لە دایکایەتی بینی کەچی منت خستە نادانەوەو و بێبەشتکردم لە دایکایەتی ..

دەڵێن دایك قەلاَی منداڵەکانیەتی .... بەهاترین شتی خۆی دەبەخشیَ لە پێناو بەختەوەرکردنیاندا .... ووتویانە : دایك لانك و سۆز و رۆحی خۆشەویستیە بەدرێژایی مێژوو ... ووتوویانە دایك سێبەر و بەهەشتی جگەرگۆشەکانە.... سەبارەت بەدایك دەڵێن و دەڵێن .. ئەی من چی بڵێم سەبارەت بە تۆ؟

چۆن فڕێت دامە باوەشی مەرگەوە تاوەکو تەمەنم بە زەلیلی بەرمە سەر... من پێش تیا چوونم لە دیدی خۆمەوە کەسێکی مەزن بووم، بەلاَم پاشان بە هۆی سەختی رووداوەکەوە فیکر و هۆشم حەیران مابوو ... دایکە لە سەر دەستی تۆ پاکیزەیم لە دەستدا ، کلیلەکەی بەدەستی تۆ بوو... بێرەوە هۆش تا گویَ لە ئازاری رۆحم بگریت .. تا تیماری برینی دڵی پارچە پارچەم بکەیت .. دایکە بێرەوە هۆش ..و تا ژیاننامەم و یادگاریەکانم پاك بکەیتەوە.... ئاە .. تەمەنم لە نێو ئامێزی پیاواندا فەوتا...تیاچووم و سەرگەردان بووم ئەی دایکی راکشاوم چ تاونێك بوو کردت بەرامبەرم بە هەق و ماڵی من . بێرەوە هۆش خۆت و شتێك بکە .... رۆژێك لە رۆژان هەستم بە ماناکانی قودسیەتی

خۆشەویستی و سەربەرزی نەکردووە ... چۆن بڕوا بکەم تۆ ئەو دایکەیت کە گەردوون گۆرانی بۆ دەچڕێت .

نەخێر تۆ ئەو دایکە نیت : وەبەراستی تۆ هۆکاری دەردی سەری و نەگبەتی بوویت بۆمن ، دەپاڕێمەوە کە خوا نەتخاتە بەر رەحمەتی خۆی و لە تاوانەکانی منیش نەبورێت .

ئاە چارە چیە ، هەموو شتەکان لەم جیهانەدا پشتیان کردووەتە من .. کوا قودسیەتی دایکایەتی بتپارێزێت لە ئاگر و تاریکاییەکان ، ئایا دایکایەتی بریتیە لە منداڵبوون و منداڵ خستنەوە ؟ یان لەجیهانی منداڵەکاندا لێپرسینەوە و چاودێری گرنگە.

وەردە بەردەوام شین و واوەیلای بۆ چارە رەشی خۆی دەکرد تا لە هۆش خۆی چوو .

بۆ رۆژی دوایی .. مەلای ئەو شارە وەفاتی کرد و هێنایان بۆ سەر قەبران لەوێ وەردەیان بینی وەکو کەسێکی هەڵتۆقیوو دانیشتبوو ، لاشەی وەکو بەرد رەق بوو بوو.....لەوێدا گیانی دەرچوو بوو..کاتێك ویستیان بیشۆن لە دەستماڵە ئاوریشمیەکەیدا شتێکی پێچراوەیان بینیەوە تیایدا نوسرا بوو (نێوانی من و دایکم دوور بخەنەوە تا چەندە ئەتوانن وەك چۆن دایکم نێوان من داوێنپاکی و پاکیزەیی و روناکی دوورخستەوە) .. ئەوە دواهەمین تکای منە ، و داواکارم لە خێرخوازان .. وە من تەوبە دەکەم بە هەموو خانەیەکی جەستەم .. پەشیمانم لە تەمەنی رابردووم .

وردە وەك داواکریەکەی خۆی دوور لە گۆڕی دایکی ناشتیان تا وەسیەتی پێش مردنی بە چەند ساتێ بەجێبهێنن .

دەڵێن پیاوێك ویستویەتی ئەو خانووە بکڕێت کە وەردە بەجێی هێشتووە بۆ خوشك و براکانی ، کاتێك بە باخچەکەدا گەڕا بوو ...نزیك بووبوویەوە لە دیوارێك کە بە تەنیشت دەرگای ماڵەکەوە هەڵکۆڵرابوو کە بەراستی مرۆڤ هەژێن و ئازاراویە :

الام مدرسة اذا اعددتها اعددت شعبا طيب الاعراق

پیاوەکە ویستبوی خانووەکە بکڕێت، بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕابوویەوە ... بۆیە پەشیمان بوویەوە لە کڕینی خانووەکە و وازی لێهێنا تا ببێتە پەند بۆ ئەوانەی کە چاویان دەبینێت .... تەواو

ئازیزە بەرێزەکانم چی بڵێین بە نموونەی ئەو جۆرە دایکانە ؟ ....... چی بڵێین بە (وەردە) ؟ ..... چی بڵێین بە خوشك وبراکانی ؟ کێ و بەهەڵەداچوو و تاونبارە ..... تکاتان لێدەکەم وەڵامم بەنەوە؟

# (ريما) و عاشقەكەی

نزيكەی ساڵێك دەبێت ئەم بەسەرهاتە روويداوە ...

هەموو سەرگوزەشتەكەتان بۆ دەگێڕمەوە بەڵكو سودمەند بێت بۆ خوشك و برا موسوڵمانەكانم .....

كچێك وتی : كچێكی هاوڕێم هەبوو لێرەدا بە رەمزی (ريما) ناوی دەبەم ، بەردەوام هۆگری چیرۆكی خۆشەويستی و رۆژانەی ئەويندارى بوو ، بە تەواوی سەرقاڵی كردبوو ، نەيدەويست ئيش بكات يان بخوێنێت.. دەيووت دنيا تەواو دەبێت بێڵن با بە ئارەزووی خۆم لەزەتی دنيا ببينم ، بەڵێ دنياكەی ئەو بە خێرايی تەواو بوو، عاشقێكی هەبوو بەڵام زۆر كاريگەر بوو پێی بە هۆی ئەو ناپاكيەی لە گەڵيدا كردبووی و پەيوەندی پێوە نەئەكرد .

بە هەر حاڵ دوای ئەوە پەيوەندی پێوە نەما ،پەيوەنديەكی تری بەست لەگەڵ كوڕێكی تردا ، بەو شێوەيە هەموو كاتەكانی بە دڵداری دەبردە سەر ...رۆژێكيان بەهۆی پێداگيری زۆری عاشقەكەيەوە كە بچێتە دەر لە گەڵيدا ريما داوای لە تاقە خوشكەكەی كرد كە بۆی بپۆشێت كاتێ ئەم شەو لە گەڵيدا دەچێتە دەرەوە ، وە بەڵێنی دا بە خوشكەكەی كە پاش دوو سەعات دەگەڕێتەوە .. خوشكە گەورەكەی رازی بوو كە هەر ئەو بوو ئەو رێگە تاريكەی نيشان دابوو .

بەوشێوەيە خوشكەكەی دەرگاكەی داخست تاوەكو خێزانەكەيان وابزانن ريما لە جێگەكەيدا خەوتووە و ريما بە درێژايی شەو نەگەڕايەوە ، وە خێزانەكەشی وا گومانيان دەبرد كە ريما خەوتووە، بەڵام ئەوەی كە روويدا بوو ئەوە بوو كە ريما لە گەڵ خۆشەويستەكەی

بە ئۆتومبیل خەریکی گەران بوون بە هۆی ڕووداوێکی ئۆتۆمبیلەوە وەرگەرا بوو (ریما) ش بێ هۆش بوو وە تووشی جەڵدەی دەماغ بوو بووبوو، کورەکەش پشتی شکا بوو، سکی یەکالا بووبوویەوە و ریخۆڵەی هاتبووە دەرەوە .

دوای ئەوەی گەیاندبوویانە نەخۆشخانە ریمای خۆشەویست خرایە ژێر چاودێری وردەوە ، کوڕەکەش لە پاڵیدا بوو ریمای بچوکی تەمەن بیست و یەك بەهار لەناو ئەو ئامێرە پزیشکیانەدا مابوویەوە کە نەیان دەزانی کێیە ؟ پاشان پەرستارەکان دەستیان کرد بە پشکنینی جانتاکەی تا بیناسنەوە... بۆیە ژمارەی ماڵەوەیان دۆزیەوە .. بەخێرایی پەیوەندیان بەخێزانەکەیەوە کرد و وتیان پێیان کچێکمان لایە بەم ناونیشانە.

براکەشی وتی : بەڵێ ئەوە خوشکمە .. وتیان : بێزەحمەت وەرن لاشەکە بەرنەوە لەنەخۆشخانە !!

کارەسات ئا لێرەدا بوو کۆتایی رێگای هەڵە کە لەوانەیە کوژەر و مرێنەریش بێت ..( وجاءت سكرة الموت بالحق ذلك ماكنت منه تحيد ) ( ق . ١٩ ) واتە ( نارەحەتی و بێهۆشی مردن دێت لە گەڵ راستیەکاندا پێی دەوترێت ئەمە ئەو مردنەیە کە تۆ خۆت لێی لادەدا و خۆت لێدەپاراست) .

خوشکەکەی پێی وتم : زۆر بەبێ ئارامانە چاوەڕوانیم دەکرد خوشکەکەم زۆر دواکەوت .. بۆ بەرەبەیان لەنەخۆشخانەوە تەلەفۆنیان کرد و ووتیان وەرن لاشەکەی بەرنەوە ، چوومە سەر شەقامەکەو لە سەختی کارەساتەکە دەمقیژاند و پۆشاکەکانی خۆمم دادەڕنی .

چەند رۆژێك پێش مردنی ریما پێی وتین وا هە ست دەكەم جیا دەبمەوە لێتان ، لەوانەیە شوو بكەم .. وە بەتەواوی دوو رۆژ پێش مردنی شەونوخونی دەكێشا لەگەڵمدا، میكیاجی دەكرد و سەمای دەكرد و دەیووت : تەواو من خوا حافیزیتان لێدەكەم و بەم زووانە شوو دەكەم .

بەڵێ هەر وابوو ریما رۆشت و بەلآم ...

بەهەرحاڵ هەواڵەكە بەناو خەڵكیدا بلأوبوویەوە ، و دراوسێكانمان زانیان خوشكەكەم لەگەڵ كوڕێكی هاوڕێیدا وەفاتی كردووە، چونكە یەكێ لە خزمان لە نەخۆشخانە كاری دەكرد ، خوا فەزحی بكات هەواڵەكەی بەهەموو لایەكدا بلأو كردبوویەوە .

بەڵێ بەسەرهاتەكەی لەنێوانی خەڵكیدا بلأو بوویەوە لەتەعزیەكەدا تەنها خاڵۆژنی و دراوسێكان ئامادە بوون لەلای دایكە هەژارەكەی .

خوشكەكەی وتی : دوای ئەو رۆژە دڵم بەتەواوی مرد .. هێشتا دەتلێمەوە بە ئازارەوە و بیری دەكەم ... لەخوا داواكارم رەحمی پێ بكات و بەزەیی پێدا بێتەوە .

لە خەونەكانمدا زۆر دەیبینم بە ویستی خوا دەروازیەك بوو بۆ تەوبەكردنم ... وە هۆكارێك بوو بۆ رێنمایی كردنم كاتێ ئامادەی شۆردنی لاشەكەی بووم هێشتا عەدەسەكان لە چاوە جوانەكانیدا بوو (مەسكەرا)كەش روومەتی رەنگ كردبوو... (ریما ) ی خۆشەویستم لەخوا داواكارم لێت خۆش بێت ، بەراستی من هۆكار بووم ، لە باتی ئەوە ئامۆژگاریت بكەم هانم دایت بۆ ئەو كارە ... پەروەردگارا لەمن و لەویش خۆش بە ... پەروەردگارا لەهەردوكمان خۆش ببە... پەروەردگارا لە هەردووكمان خۆش ببە.

# سێ بە سێ تەڵاقت کەوتبێت

بانگخوازێك گێڕایەوە و وتی : ئەمە چیرۆکێکی راستەقینەیە و لە یەکێك لە بەشەکانی پۆلیسدا تۆمار کراوە .

دوو لاو .. کۆبووبوونەوە لە سەر سەرپێچیکردنی خوای گەورە و شەیتان پاڵی پێوە دەنان بەرەو خراپە ، کارەسات لەوەدابوو هەردووکیان ژنیان هەبوو .

یەکێکیان رۆژێك هەستا بە کارێك ؟ دوای ئەوەی ئافرەتێك پەیوەندی پێوە کرد .... و پەیوەندی حەرام لە نێوانیاندا دروست بوو رۆژێکیان بەڵێنی پێدا کە شەوێك دەباتە سەر لە گەڵیدا .

بۆ ئەوەی ماڵەوەی بۆ چۆڵ بکات ... داوای لێبوردنی لە خێزانەکەی کرد کە کاری هەیە و بڕواتەوە بۆ ماڵی باوکی ... خێزانە داماوەکەشی بڕوای پێکرد و رۆشتەوە .

گورگە ناپاکەکەش رۆشت بۆ لای ئەو ئافرەتەی کە بەڵێنی پێدا بوو ئافرەتەکەش وتی : دەمەوێت کەمێك لە باخچە دانیشین دوایی دەچین بۆ ماڵەوەتان، ئەویش رازی بوو .

دانیشتن لە باخچەکەدا و پاشان پێکەوە رۆشتن بۆ ماڵەوە و ئافرەتەکە داوای لێکرد کە خواردنی ئێوارەو و مەشروبات ئامادە بکات ..لەماڵەوە چووە دەرەوە بۆ یەکێ لە چێشتخانەکان و بڕێکیش مەشروباتی هێنایەوە ... کاتێ لە رێگا بوو . ئۆتۆمبیلی پۆلیسی هاتوچۆ وەستانی و پێی وت: تۆ ئاماژەکەت تێپەڕاندووە ، ئۆتۆمبیلەکەت بوەستێنەو و لەگەڵماندا سەرکەوە ... ئەویش ئۆتۆمبیلەکەی وەستان و سەرکەوت لە گەڵیاندا .

دوای ئەوەی گەیشتنە بنکەی پۆلیس .. پەیوەندی کرد بە هاوڕێ ئازیزەکەیەوە ... لە سوچێکی ناو پۆلیسخانەکەدا پەیوەندی بە هاوڕێکەیەوە کرد و وتی نێچیرەکەم هێناوەتەوە، ئەوەتا لەماڵەوە نانی ئێوارەش لەناو ئۆتۆمبیلەکەدایە و ئۆتۆمبێلەکەش لە فلان شوێندایە .

خواردنەکە بەرەو برۆ بۆ ماڵی خۆمان و گەشتەکە تەواو بکە و ...کاتێ کۆتایت بە کارەکە هێنا ئافرەتەکە بەرەوە بۆ ماڵی خۆیان .. من دەترسم ژنەکەم بگەڕێتەوە و ئەو کاتە کارەسات دەقەومێت .

هاوڕێکەی وتی ،مژدە بێت مادام لەناو تۆڕەکەدایە ! هاوڕێ بە وەفاکە چوو بۆماڵی هاوڕێ ئازیزەکەی... لیك بەدەمیدا دەهات بۆ ئەو ئافرەتە ... ! کاتێ چووە ماڵەکە کارەسات روویدا .. بۆ هەردووکیان . بەراستی مەوقیفێکی زۆر سەخت و ناهەموار بوو .. ئەبێت چی ببینێت ....ئەبێت چ زللەیەك بخوات ؟ ئای کە جەرگ بڕە !

ئایا دەزانی چی بینی ژنەکەی خۆی بینی کە لە وێ بوو !

ئەی لە گەڵ کێدا رادەبوێرێ و شەو دەباتە سەر ؟

لە گەڵ ئازیزترین هاوڕێی !

شریخەی کێشا و هاواری کرد سێ بەسێ تەلاقت کەوتبێت بەڵکو چوار بەچوار و بەڵکو هەزار ! ئیتر چ سوودێکی هەیە بۆ تۆ ؟

# مێردەکەم ومنداڵەکانم لە دەستدا

ئـەم چـیرۆکەتان بـۆ دەگێڕمـەوە لـە سـەرزاری خاوەنەکەیـەوە ، هەرچەندە درێژیشە بەڵام بەراستی شایەنی تێفکرینە بەحەسرەتەوە کە باس لەهەڵوەشانەوەی تەواوەتی خێزانێك دەکات .

ئەو ئافرەتـە دەڵێت من کـچێك بووم لەخێزانێکی بەڕێز و ناسـراو ، پـەروەردەکرابووم لەسـەر رەوشـت و پـەروەردەی ئیـسلامیانە ، لـەو ئافرەتانە نەبووم کە بەدوای گاڵتـەجاری و بەدوای شتی بێمانا بگـەڕێم رۆژێ شك نابەم هەستابم بەکارێك کە خـوام لە خۆم رەنجانـدبێت.... شوم کرد بە پیاوێکی بەڕێز ، خۆشی دەویستم و خۆشم دەویـست و بە تەواوەتی متمانەی بەمن هەبوو .

من ژنێکی نازدار بووم لە لای ، هـەتا کـەس و کارم و خزمـانم پێیـان دەوتم ، تـۆ زۆر نازدەکـەیت بەسـەر مێردەکەتـدا ، نازێـك کە پێـشتر هـیچ کچێکمان بەو شێوەیە نـەبینیوە ، بیرم نایـەت شتێکم لـە مێردەکـەم داوا کردبێت و رازی نەبووبێت لە سەری ، داوای هەرچیم بکردایـە لێـی بـۆی دەهێنام .

تـا رۆژێکیـان داوام لێکـرد ئەنتـەرنێتێکمان بـۆ دابـین بکـات . لـە سەرتادا وتی : نازانم ئایا شتێکی باشە ، ئەو شتە بۆتـۆ گونجـاو نیـە .. منیش نازی زۆرم بەسەردا کرد تا هێڵێکی ئەنتەرنێتی بۆ دابین کـردین و منیش سوێندم خوارد کە بە شێوازی خراپ بەکاری نـەهێنم ، ئـەویش رازی بوو ( خۆزگە رازی نەبووایە ) .

لە ماڵدا کاتێکی خۆشم بەسەردەبرد پێـی ، کاتێ مێردەکـەم دەچـوو بۆ سەر کارەکەی ، منـیش هـەموو رۆژێ کـارم پێدەکرد ، لەو کاتەشدا

که ئەو لەماڵەوە بووایە بەڵام نەیدەپرسی چی دەکەم ، چونکە متمانەی پێم هەبوو .

رۆژگار گوزەرا و رۆژێکیان هاورێیەکەم کە ئەنتەرنێتی بەکار دەهێنا باسی چات ( کە بریتیە لە کاری وتوێژی راستەوخۆ لە رێگەی ئەنتەرنێتەوە) ی بۆ کردم ، وتی بەراستی زۆر خۆشە ، خەڵکی قسە دەکەن تیایدا ، بە شێوەیەك چەندین سەعات تێ دەپەڕێ بەبێ ئەوەی هەست بەکات بکەیت ، بەڵێ منیش ( چات ) م کردەوە و خۆزگە نەمدەکردەوە ، لە سەرەتادا پێم وابوو تەنها قسەی سەرزارەکیە .

لەو کاتانەدا ئاشنا بووم بەکەسێك کە هەموو رۆژێك قسەی دەکرد و دەم دواند ، خاوەنی رەوشتێکی بەرز بوو کە پێشتر هیچ کەسێکم بەو شێوەیە نەبینی بوو .

چەندین سەعات دادەنیشتم لە سەر ئەنتەرنێت و پێکەوە قسەمان دەکرد، مێردەکەم دەهاتە لامەوە دەیبینیم و تووڕە دەبوو بەهۆی ئەو ماوە زۆرەی کە لەگەڵ ئەو ئامێرەدا بەسەری دەبەم ، لە گەڵ ئەوەی کە مێردەکەمم زۆر خۆش دەویست... خۆشەویستیەك کە هیچ شتێکی نەدەگەیشتێ ، بەڵام سەرسامیش بووم بەو کەسەی کە قسەم لەگەڵدەکرد ، تەنها سەرسام بووم ، رۆژگار تێپەڕین و قسەکان گۆڕان بۆ خۆشەویستی و ئەوینداری ، زیاتر لەمێردەکەم مەیلم هەبوو بە لایدا ، وام لێهاتبوو رام دەکرد لە تووڕەیی و غەزەبی مێردەکەم بۆ سەر ئەنتەرنێت و قسەکردن لە گەڵی ، جارێکیان ئاگام لە خۆم نەما و بە شەڕ هاتم لە گەڵ مێردەکەمدا ، ئەویش هاوبەشی ئەنتەرنێتی واز لێهێنا و کۆمپیوتەرەکەشی لە ماڵەوە بردە دەر .،

منیش زۆر تورە بووم لە مێردەکەم چونکە ئەوە جاری یەکەمە کە داواکاری من رەت دەکاتەوە ، وە بۆ ئەوەی سزای بدەم بڕیارمدا کە قسە لەگەڵ ئەو پیاوەدا بکەم کە پێشتر چاتم لە گەڵ دەکرد و قسەمان پێکەوە دەکرد کە ئەویش زۆر حەزی دەکرد قسەی لەگەڵدا بکەم .

لە شەوێکی شومارویدا پەیوەندیم پێوەکرد و بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ کرد ، لێرەدا ناپاکی من دەستی پێکرد لە گەڵ مێردەکەمدا ، چونکە هەرکاتێك مێردەکەم لە ماڵ بچوایەتە دەرەوە پەیوەندیم پێوە دەکرد و قسەم لەگەڵ دەکرد ئەویش بەڵێنی پێدام کە بمخوازێت ئەگەر حاشا لە مێردەکەم بکەم ،هەمیشە داوای لێدەکردم کە ببینم، داوای لێکردم کە یەکتری ببینین.. تا وام لێهات کەمەندکێشی حەز و ئارەزووەکانم بووم و ژوانەکانمان پێکەوە زیادی کرد هەتا کەوتینە گەورەترین گوناه ،کە ژن لە گەڵ مێردەکەیدا دەیکات کاتێ ناپاکی لەگەڵدا دەکات... پەیوەندی کەوتە نێوانمان ئەم پیاوەم خۆش دەویست کە بە چات ناسی بووم ، بریارمدا کە مێردەکەم تەلاقم بدات و داوام لێکرد کە تەلاقم بدات مێردەکەشم پرسیاری دەکرد بۆچی ؟

کێشەی زۆر کەوتە نێوانمانەوە ، وام هەست دەکرد ئیتر ناتوانم لە گەڵیدا بژیم، ئەمە وای لەمێردەکەم کرد کە گومان پەیدا بکات لە سەرم کار گەشتە ئەوەی جارێکیان پێی وتم کە ئەو ئاگای لێبووە کەمن قسە لەگەڵ پیاوێکدا دەکەم ، بۆیە لێپرسینەوەی زۆری لەسەر کردم منیش راستی شتەکانم پێ وت ، پێی وتم من تۆم ناوێت وحەزناکەم لە گەڵتا بژیم لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا مێردەکەم کەسێکی زۆر چاك بوو لە گەڵمدا ، فەزحی نەکردم و بە کەس و کارمی نەووت .

پێی وتم ، من تۆم خۆش دەوێت و ناتوانم بەردەوام بم لەگەڵت ( کچێ خوا داپۆشراوتکات ، بەس بڵێ بە کەس و کارت کە تۆ ناتەوێت لەگەڵ مندا بژیت ، وەتۆ دەست پێشخەریت کردووە کە بۆ یەکتری ناگونجێین ) .

لەگەڵ ئەوەشدا من رقم لێی بوو تەنها بە هۆی ئەو کێشە سادەیەوە کە ئینتەرنێت بوو ، هەڵسوکەوتی لەگەڵمدا خراپ نەبوو وە بەخیل نەبوو لەگەڵمدا ، بەرامبەر بەهیچ شتێك بۆمن کەم تەرخەم نەبوو ، تەنها لەبەر ئەوە وتی : نامەوێت ئەنتەرنێت لەماڵمدا بێت ، منیش کوێر بووم و ئەو هەموو شتەم نەبینی و دوای ئەوەی کار لە کار ترازا .

لە کۆتایدا مێردەکەم تەلاقی دام و منیش رووم کردە هاورێکەم و وام زانی کە دڵخۆش دەبێت بە تەلاق دانم لەمێردەکەم، بەلام ئامارژەکانی ئەو ناپاکە وەکو هەورەتریشقە وابوو بۆ سەر دڵم ... من قوربانیم دا بە مێردەکەم ومنداڵەکانم و بە هەموو بەختەوەریەکی ژیانم لە پێناوی ئەودا ... ئەویش بە وەلامەکەی هەناومی برد ..

وتی( من ئەگەر ژن بێنم ئافرەتی وەکو تۆ ناهێنم کە کەسی تر بناسێت بێجگە لە من، وەناسیبێتم لەرێگەی چاتەوە و لەتەمەنیشدا گەورە بێت، ئەگەر بمەوێ ژن بێنم کچێکی تەمەن بچوك ئەهێنم چۆنم بوێت وا پەروەردەی دەکەم، وە من ئافرەتێکی وەك تۆ ناهێنم وەکو تۆ پێشتر شووی کردبێت ! پاشان ناپاکی لەمێردەکەی خۆی کردبێت ! من چوزانم تۆش سبەینێ دەبیت بەژنی من ناپاکیم لەگەڵدا ناکەیت وەك چۆن ناپاکیت لەگەڵ مێردەکەتدا کر د؟

سوێندتان بۆ دەخۆم ئەو وتانە هەمان ئەو قسانە بوون وەکو خۆی بەمنی دەوت ، درۆناکەم و یەك وشەم بۆ زیاد وکەم نەکردووە ،من

ئێستا دۆش داماوم لەنێوان بیرکردنەوە لە خۆکوشتن و دەترسم خۆم بکوژم پیش ئەوەی نامەکە بگاتە دەستی ئێوە و لە خوای گەورە دەپارێمەوە کە ڕێنمایم بکات و دوورم بخاتەوە لە ڕێگای تاریکایی ،

خوشکی بەڕێزم : ئەمە نموونەیەکی واقیعیە و واقیع هەندێ جار تاریك و سامناکە... بەتایبەتی ئەگەر سادەیی و نیەت پاکی لە لایەنێکەوە بێت و پیسی و مەکر و نازیش لە لایەنەکەی ترەوە کۆبووبنەوە .... با لە خوای بالأدەست بپاڕێینەوە کە لەو تەنگەتاویە ڕزگاری کات و تەوبەکەی قەبوڵ بکات.... بەزەیی و لێبوردەیی خوای گەورە سنووری نیە ، کە بەڕاستی هەموو شتێکی گرتووەتەوە ...

# کچە خۆ حەشاردەرەکە

ئەمە چیرۆکی کچێکە ئۆتۆمبیلەکەی باوکی بە بێهودە و بەبێ مەبەست لێدەخوڕێت بە پۆشاکی پیاوانەوە.... خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە .

من ئافرەتێکی زانکۆم ، تەمەنم گەیشتوەتە بیست وسێ سالْ، لە ژیانمدا شتێك نیە جیام بکاتەوە لەکچانی تر ، بەڵکو خەریکە دەبمە وێنەیەکی کاربۆنی کچانی ئەم سەردەمە ، ئەوانەی کە خەمۆکی کوشتونی و لە وێستگەکانی ژیاندا راوەستاوون و چاوەڕوانی شەمەندەفەری زەواج دەکەن ، بە هیچ کارێك هەڵنەئەسام کە کارێکی بەرهەمهێن وەسف بکرێت .

بە رۆژ زۆربەی کات دەخەوتم ، شەویش رادەکشام لە سەر نوێنەکەم و کۆنترۆڵەکەم دەگرت بەدەستمەوە و لەبەردەم تەلەفزیۆنەکەدا شەوم دەبردە سەر تا خۆرهەڵهاتن خەریکی تەماشاکردنی کەناڵە ئاسمانیەکان بووم.. لەو نێوانەشدا تەلەفۆنم لەگەڵ هەندێ کچی هاوڕێمدا دەرکرد، ئەوانەی دەردەدار بوون بەهەمان دەردی منەوە ...

ئەمە کورتەی سەربوردێکی ژیانی من بوو کە پێویست ناکات باسی بکەم .

وتی: من فرسەتی ئەوەم دەقۆستەوە کە لەگەڵ کەسوکارم گەشتمان کرد بۆ دەرەوەی وڵات تا فێری شۆفێری ببم ، تا ئەو رادەیەی بە باشی فێری بووم ، لە گەڵ ئەوەشدا کاتێ باوکم دەخەوت فرسەتم دەهێنا و یان ئۆتۆمبیلەکەی ئەو یان هی ماڵەوەم لە حەوشەکەدا لێدەخوڕی، تەنها لەبەرئەوەی حەزم دەکرد لێی .

شەوێکیان لە سەرجێگەکەم راکشا  بووم ، بیرۆکەیەك بە مێشکمدا هات، وە بیرم لە چارەنووسەکەی نەکردبوویەوە .

بە رادەی ئەوەی کە بیرم لە راپەراندنی کردبوویەوە بە هەر شێوازێك بووبێت ، ...کارەکەرەکەم بانگ کرد و و داوام  لێکرد عەبا وپەچەم بۆ بهێنێ و تاخۆم ئامادەبکەم بچمە دەرەوە ، من چووم بۆ ژووری یەکێ لە براکانم و دیشداشە و چەفتە و عەگالێکم هێنا و گەڕامەوە ژوورەکەم و تا جلی گەنجانە لەبەر بکەم و هەموو ئاسەوارێکی کچێنی لە رووخسارم لابەرم ، پاشان نۆرەی ژوورەکەی باوکم هات کە بە ئەسپایی چووم و کلیلی ئۆتۆمبێلەکەم هێنا و ئۆتۆمبێلە چاکەکەیم هێنا  کە ئۆتۆماتیك بوو ،وە باشتر بوو لە ئۆ تۆمبیلەکەی ماڵەوەمان و کەشخەش بوو ، کە وای لێدەکردم پۆلیسی هاتوچۆ و خەڵکانی تر  سەیرم نەکەن .

کات سەعات نیوەی شەوی نیشان دەدا ، من بە رێگادا دەرۆشتم لە دەرەوەی ماڵ و بە ئۆتۆمبیلێك کە خۆم لێم دەخوڕی ،و جلی پیاوانەم لە بەر کردبوو لە سەرەتادا هەستم بە ترس و خورپە و دڵەراوکێ دەکرد بەڵام ئەو هەستە بەخێرایی رەوایەوە ، هەستم بە متمانە بەخۆکردن دەکرد ، کاتێ بە چەند شەقامێکی سەرەکیدا رۆشتم بە بێ کێشە ... لە باکوری شاردا لە یەکێ لە شەقامە بەناوبانگەکانی، لای ترافیك لایتێك وەستام کە سووری نیشان دەدا ، لە تەنیشتمەوە ئۆتۆمبێلێکی سۆپەر وەستا، هەرچەندە شوشەی دەرگاکەی داخرا بوو بەڵام رێگر نەبوو لە دەنگی مۆسیقاکەی کە لە ئۆتۆمبیلەکەیانەوە دەهات ، هەر کە تەماشام کردن بینیم هەرسێکیان تەماشای من دەکەن ، کەمێك شڵەژام ، ئەوان تەماشای منیان دەکرد و بە دەستیان ئاماژەیان بۆ کارەکەرەکە دەکرد ، ئەو کاتە من بە هەڵەدا چووم، دەبووایە کارەکەرکەم لە دواوە سوار

بکردایە لە تەنیشت منەوە نەبوایە، چونکە دانیشتنی ئەو بە تەنیشتی منەوە جێگای سەرنج بوو ، بە خێرایی ڕۆشتم دوای ئەوەی ترافیک لایتەکە سەوز بوو ، بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆماڵەوە ، سەر لە نوێ ترسم لێ نیشتەوە ، کاتێك ویستم پێچ بکەمەوە و بگەڕێتەوە ئۆتۆمبیلێك هات و ناچاری کردم بە خێرایی ئیستۆپ بگرم ، لە ئەنجامدا چەفتە وعەگاڵەکە کەوتە خوارەوە لە سەرم و قژم دەرکەوت .

ئەو ئۆتۆمبیلەی سێ لاوەکەی تێدا بوو زۆر دوور نەکەوتبوونەوە لە من ، تەنها ئەوەندەی لاوێکیان قژی منی بینیبوو ئاماژەی بۆ هاوڕێکانی کرد کە دوامکەون ، منیش ئۆتۆمبیلەکەم خێراتر کرد و ئەوانیش بە خێرایی بە دوامەوە بوون هەر کە گەیشتینە شوێنێك کە هێڵەکە زۆر دیار نەبوو، ئەوان پێش منیان دایەوە و ناچاریان کردم بوەستم ..

دوانیان دابەزین و بەراکردن بەرەو لای ئۆتۆمبیلەکەی ئێمە هاتن ، یەکێکیان ڕۆشت بۆ لای دەرگای ڕاست کە کارەکەرەکە دانیشتبوو ، پاڵی پێوە نا بۆ ناوەوە و لە پاڵیدا دانیشت و دووەمیشیان دەرگاکەی منی کردەوە و پاڵی پێوە نام بۆ ناوەوە دوای ئەوە پێی نا بە کلاج و بەنزیندا .. منیش بە دەنگی بەرز قیژاندم، بەڵکو کەسێك لە نزیکمانەوە بێت بە هانامانەوە ، چونکە جامی ئۆتۆمبیلەکەی داخستبوو ، وە دەنگی کاسێتەکەی زۆر بەرز کردبوویەوە ، و بە خێرایی بە دوای ئەو ئۆتۆمبیلەدا ڕۆیشت کە پێشتر هەرسێکیانی تێدابوو .

خەریك بوو توشی شۆك دەبووم و بەتاسەوە دەگریام، کاتێ ئۆتۆمبیلەکەم بینی بە خێراییەکی ناسروشتی بۆ دەرەوەی شار دەڕوات ، کە ئیتر خانوو و ئاوەدانی کەم بوویەوە، کاتێ شۆفێرەکە هەستی بەوە

کرد، ویستی هێمنم بکاتەوە و وتی توخوا مەترسە ، دڵنیابە هێمن بەرەوە، هیچ ئازارێکت پێ ناگات .

چەند خولەکێکی نەخایاند ئۆتۆمبیلی یەکەم لە بەردەم یەکێ لە شوێنەکانی حەوانەوەی دەرەوەی شار و ئاوەدانی وەستا... لەو ناوچەکەدا کە زۆر تاریك بوو لاوی سێیەم دابەزی و دەرگاکەی کردەوە و چووە ژوورەوە و ئاماژەی دا بە ئەوانیش بێنە ژوورەوە و پاشان دەرگاکەی داخستەوە ، ویستم بەرگری بکەم، زۆرم کرد لە ناو ئۆتۆمبیلەکەدا بمێنمەوە، بەڵام زۆری نەبرد بە هێزێکەوە رایکێشام ، بەڵکو هەڵیگرتم و بردمی لە ژوورە سەرەکیەکەدا فرێیدام و پاشان کارەکەرەکەشیان هێنا بۆ لام و دەگریا و ئەوان بە زەویدا رایان دەکێشا .. خۆم یا بەسەر پێلاوی یەکێکیانا کە وام هەست دەکرد لە دوانەکەی تر گەورەترە ، و ئەو هەڵدەستا بە ئاراستە کردنی فرمانەکان و ئەوانیش بە گوێیان دەکرد ، سەری بۆ سەرەوە بەرز کردەوە و رازی نەبوو قاچی ماچ بکەم و پاشان پرسی ئایا تۆ کچیت ؟ یان شووت کردووە ، قیژانم بە سەریدا: گوناهت دەکات لەخوا بترسە من کچم ... بە خوا کچم ، قسەکەی پێ بڕیم ... باشە ....تەواو ...تەواو مەترسە ..پاشان چوو بۆ لای دوو هاورێکەی و قسەی لە گەڵدا کردن و دیاربوو کە چەند رێنماییەکی پێدان کە پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە پێویستە چاودێری و پارێزگاری ئەو حاڵەتی من بکەن .

بە هەر حاڵ ... هەرسێکیان یەك بە دوای یەك هاتنە لام لە گەڵ ئەوەدا کە بەڵێنیان دابوو کچێنیم بپارێزن ، دوای ئەوەی شەهوەتیان خاڵی کردەوە .. گریام و لێیان پارامەوە کە بمگەڕێننەوە بۆماڵەوە ، بەڵام سوودی نەبوو ، دوای ئەوەی هەندێ خواردنیان خوارد کە لە

سەلاجەكەدا بوو ، يەكێكيانم بينی كارەكەرەكەی بردە ژوورێكەوە تا هەرسێكيان بە نۆرە بچنە لای ، لە گەڵ تێبينی ئەوەی هيچ كاميان باسی ئەوەيان نەكرد كە ئايا ئەو ژنە يان كچە ؟

سەعات دووی دوای نيوە شەوی تێپەراند ... لەو كاتەدا هەمووومان هاتينە دەرەوە .... دوانيان سواری ئۆتۆمبيلەكەی خۆيان بوون و سێيەميان كە لێپرسراويان بوو سواری ئۆتۆمبيلەكەی ئێمە بوو دوای ئەوەی كە سوور بوو لە سەر ئەوەی لە پاڵيدا دانيشم لە كورسی پێشەوە، دوای ئەوەی من و كارەكەرەكەمان لە دواوە دانيشتبوين .

لە رێگا پۆزشی دەهێنايەوە ، پاشان پرسياری ناوی منی كرد و ژمارە تەلەفۆنەكەم ...منيش وەلاٌم نەدايەوە .

گەياندينيانەوە ئەو شوێنەی ئێمەيان لێوە بردبوو ، داوام لێكرد كە كەمێك بۆ پێشەوە بڕوات بە مەبەستی نزيك بوونەوە لە ماڵمان، بەلاٌم پێم نەوت لە كوێيە ، پێی وتم : كوا ماڵتان ؟ منيش بە خێرايی وتم ئەوە ماڵی ئێمەيە ، ماڵێكی تەنيشت خۆمانم نيشانيا ، بە خێرايی ئۆتۆمبيلەكەی وەستاند و دابەزی و رايكرد بۆ لای دوو هاوڕێكەی لە ئۆتۆمبيلەكەی تردا ، كە بە دوامانەوە بوون، چەند چركەيەكی نەبرد بە تەواوی لە چاو ون بوون .

دامە پڕمەی گريان و هاوار ، بە هۆی سەختی كارەساتەكەوە خەريك بوو تێك ئەچووم ، لە گەڵ ئەوەدا لە بارێكی وادا نەبووم جارێكی تر ئۆتۆمبيل لێبخوڕم ، سەعاتيش لە سێی بەرەبەيان نزيك بووبووبوەوە ، بەلاٌم لە پڕ تووشی شۆكێكی تر بووم، لە كاتێكدا كە كليلەكەمان لە ئۆتۆمۆبيلەكەدا نەبينيەوە ، بۆيە بريارمدا ئۆتۆمبيلێكی كرێ بگرم دوای ئەوەی خۆم پێچابوو بە عابای كارەكەرەكەوە .

سواری ئۆتۆمبیلێکی (تەکسی) بووین... شۆفێرەکەی ئاسایی بوو بە گومانەوە تەماشای دەکردین پاشان بە زمانێکی زبری عەرەبی وتی: بۆچی هەموومان نەچین بۆ مالی من و لەوێ چایی نەخۆین لە گەڵ هاوڕێکانم ،و بۆ بەیانی کوێتان بوێ دەتان گەیەنم .

لەو کاتەدا هاوارم کرد و قیرانم بە سەریدا و دەرگای ئۆتۆمبیلەکەم کردەوە و ئەویش بە خێرایی ئۆتۆمبیلەکەی وەستاند و هاوریکرد تەواو ...تەواو دابەزن هەی ... قسەی زۆر ناشرین هات بە دەمیدا هەندێ ئۆتۆمبیلم بینی کە دیار بوو شتێکی ناسروشتی روویدا بوو لە شەقامەکەدا دەهاتن و یەکە یەکە نزیك دەبوونەوە لێمان .

هەریەکەیان دەیانووت پێمان لە خزمەتتاندا این ، هەتا خوا کردی تەکسیەك هات پیاوێکی گەورە لێیدەخوڕی کە چاکە لە سیمایدا دیار بوو .

بۆیە بە راستی گەیاندمیە ماڵەوە و لە دوایشەوە ژمارەیەك ئۆتۆمبیل چاودێریان دەکرد تا ماڵەوە .

لە گەڵ بانگی یەکەمی بەیانیدا گەشتمەوە ماڵەوە ،هەمووان خەوتبوون ، هەستم بە هیچ شتێکی ناسروشتی نەکرد ، هیچ کێشەیەکم نەبوو ، تەنها ئۆتۆمبیلەکەی باوکم نەبێت چۆن بیگەیەنمەوە ماڵەوە .

ئاماژەم دا بەکارەکەرەکە کە شۆفێرەکە خەبەر بکاتەوە و ئۆتۆمبیلەکە بچوکەکە بێنێتەوە تا پۆشاکەکانم دەگۆڕم و خۆم ئامادە و رێك دەکەم .

دوای نزیکەی چارەکە سەعاتێك گەیشتینە لای ئۆتۆمبیلەکەی باوکم ، بڕیارمدا خۆم ئۆتۆمبیلەکەی باوکم لێبخوڕم و بگەڕێمەوە بۆماڵەوە ، تاکەس لە ماڵەوە هەست نەکات کە ئۆتۆمبیلە بچوکەکە

نــــەماوە ، گـــەڕاین بـــە دوای سویــچی ئۆتۆمبیلەکـــەی باوکمـــدا و نەمانبینیەوە لە ناویدا و لـە دەرەوەش نەبوو بە خێرایی گەڕاینـەوە بۆ ماڵــەوە و سویــچە یەدەکەکــەمان هێنــا و خێــرا گەڕاینــەوە بــۆ لای ئۆتۆمبیلەکە .

جارێکی تر دنیا لەبەر چاووم تاریك بوویـەوە کاتێك کە ئۆتۆمبیلێك وەك ئەوەی لە دوورەوە هەستی بەئێمە کردبێت کە ئۆتۆمبیلی پۆلیسی ئاسایش بوون بەڵام بە دەوری ئۆتـۆمبیلێکی تـرەوە بوون ، خـەریك بـوو لە تاوا لە هۆش خۆم بچم ئەگەر خوای گەورە دەروی لێنەکردمایەتـەوە ، چونکە پۆلیسەکە چووە ناو ئۆتۆمبیلەکەیان و ناوچەکەیان بەجێهێشت هـەر کـە دوور کەوتنەوە ئۆتۆمبیلەکەمان وەستاند و بە خێرایـی بەرەو لای ئۆتۆمبیلەکـەی تـر ڕۆشـتین ، شـۆفێرەکە لێـی خـوڕی و تـا ماڵـەوە بردیەوە ناو حەوشەکە ، کە خەریکی ئەو کارانە بووین بانگی بەیانی دا و رووناکیمـان لـە ژووری باوکمانــەوە دەبینــی ، بـەڵام هەریەکـەمان بـە ئەسپایی ڕۆشتینەوە ژووری خۆمان تا بەیانی ، تـا نزیکـەی سـێ هەفتـە بـە سـەر ڕووداوەکـەدا کـەس پێـی نـەزانین ، تـەنها کارەکەرەکـە نـەبێت ، بەڵام شۆفێرەکە تەنها سەبارەت بـە ئۆتۆمبیلەکـە شـتی دەزانـی و هیـچی لە بارەی ڕوداوەکەوە نەدەزانی .

بێگومان من درێژەم بە بەسەرهاتەکە دا ، بەڵام بڕوام پێ بکـە حـەزم نـەدەکرد زۆرێـك لـە شـتەکان بـاس بکـەم بـە تایبـەتی ئـەو ئاسـەوارە دەروونیەی کە پێیەوە دەتلامەوە و لە ئەنجامی ڕووداوەکـەوە کـە توشـی بووم وە پرسیاری من ئەوەیـە کـە بێگومـان تاکـە داوی مـن بـۆ بەڵگـە لـە سەر ئەو تاوانبارانە ژمارەی ئۆتۆمبیلەکەیان بوو کە تێیدا بوون لـە گـەڵ بـوونی ناوێـك کـە بینـیم لـە سـەر دەرگـای شـوێنی حەسانەوەکە ، ئایـا

**هەواڵ بە باوکم و براکانم بدەم سەبارەت بە ڕووداوێك ؟ یان وازی لێبێنم و بگوزەرێ و هەوڵ بدەم لە بیری بەرمەوە .**

**وە واز لەو نەگریسانە بێنم وەك باسکی بابان بۆی دەرچن بە بێ سزادان و بگەڕێن بە دوای نێچیرێکی تردا ؟**

# کچێکی قۆناغی ئامادەیی

لاوێکی کوڕ بۆی گێڕامەوە و وتی : هاوڕێیەکەم هەبوو ،کە لەو لاوانە بوو بێهوودە دەژیا و پەیوەندی گوماناوی هەبوو لە گەڵ کچاندا ، وە باسی ئەوە دەکەم کە بێگومان دوای ئەوەی خوێندنم تەواو کرد بۆماوەیەك لە ماڵەوە دانیشتم ، ڕۆژێکیان لە کاتی خوێندندا ئەو هاوڕێیەم بەیانیەکیان لە کاتێکدا دەوامی قوتابخانە هەبوو هات بۆلام ، پێشوازیم لێکرد و هەستام تا ئەرکی میوانداری بەجێ بهێنم ، کاتێ تەماشای دەرەوەم کرد ئۆتۆمبیلەکەیم نەبینی:وتم ئەوە کوا ئۆتۆمبیلەکەت ؟ وتی لە پاڵ ماڵەکەتاندا شاردوومەتەوە ، منیش سەرم سوڕما لەو کارە !وتم ئەی بۆچی ڕاستەوخۆ لە بەردەم ماڵەکەماندا نەتوەستاند ؟ وتی کچێکی هاوڕێی نوێم لە گەڵدایە.. وتم : ئەی بۆچی نەتهێناوە بۆ ئێرە ؟

وتی: ئەو کچە قوتابییە لە قوتابخانەوە لە سەرەتای دەوامەوە هێناومە و چاوەڕوانی دەکەم تا کاتی چوونە دەرەوە دێت و زەنگ لێدەدات ، منیش لە بەردەم قوتابخانەکەدا دایدەبەزێنم و ئەویش سواری پاس دەبێت... لەماڵەکە چوومە دەرەوە بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە ، کاتێ ڕۆشتم کچێکم بینی کە لە بەهاری تەمەنیدا بوو، هێشتا ( ١٥ ) ساڵی تێنەپەراندبوو، پێم وت : چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە ؟وتی: فلان کەس منی خۆش دەوێت و بەڵێنی پێداوم بمخوازێت ، پێم وت : حەز دەکەم باش گوێ بگری لە قسەکانم ، هەرچەندە ئەو کوڕە هاوڕێی منە و هاوڕێیەتیەکی بەهێز لە نێوانماندا هەیە ، بەڵام ئەوە ڕێگا لەمن ناگرێت کە ئامۆژگاریەکت بکەم ، ئەگەر قبوڵی بکەیت ، وە گەرنا هەقم نیە

بەسەرتەوە ، ئەو متمانەیەت بێتەوە یاد کە کەسوکارت پێیان داویت ، ئەوان چاودێری توندیان نەخستووەتە سەرت .

بیریٚ لە سەر سەختی کارەکەت بکەرەوە کە پێی هەڵدەستی ، و باش بزانە کە تۆ لەسەر هەڵەیت ، وە هاوڕێکەی منیش هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە کە تۆ بخوازێت ، چونکە ئێمەی لاو ئەگەر کەسێکی وەکو تۆ ببینین بیر لە خواستن ناکەینەوە ، چونکە ئەو کچەی لەگەڵ کوڕێکی نەناسراودا دەڕواتەوە دەرەوە ، پێچەوانەی داب و نەریتی کەسوکاری دەجوڵێتەوە و شایانی ئەوە نیە کە بخوازرێت و ببێت بە ژن ، چونکە لەوانەیە ئەو کارەش لە گەڵ کەسێکی تردا ئەنجام بدات ..ئەمانە چەند وتەیەك بوون و باش بیری لێبکەرەوە و بچۆ بەڕێی کاری خۆتەوە .

وتی: دوای ماوەیەکی تر هەمان حاڵەتی دووبارە کردەوە ، هاوڕێکەم هات بۆ لام و وتی : ئایا ئەم جارەش کچەکەت لە گەڵدایە ؟ وتی: بەڵێ ، منیش چوومە دەرەوە پێم وت تۆ جاری یەکەم لەو قسانەی من تێنەگەیشتیت ، من بۆ دواهەمین جارت ئاگادارت دەکەمەوە کە بەم رێگەیەدا نەچیت، چونکە لە مەترسیدایت ، ئەگەر ئەم جارە رزگارت بێ لە دەست هاوڕێکەی من ئەوە بۆ جارێکی تر رزگارت نابێت ، ئەوەی دەیەوێت لێتی دەبات و لە قەراغ رێگادا فڕێت دەدات و لە تاو ئازار و مەینەتی دەناڵێنیت ، تۆ بێئاگایت ، تۆ شایەنی ئەوە نیت ببیت بە ژن، ئەوەی کە پێت دەڵێم یادی دەکەیتەوە ...

وتی ماوەیەکی زۆر تێپەڕی ، وە بەسەرهاتی ئەو کچەم لە بیرچوو ، بەڵکو بە تەواوی رووداوەکەم بیرچوویەوە ، وە نازانم دوای ئەو بینینە چی بەسەر هات ، رۆژێکیان کوری دراوسێکەمان هات بۆ لام و وتی :

ئەمە نامەیەکە خوشکەکەم هێناویەتی لە یەکێ لە کچەکانی هاوڕێیەوە وەریگرتووە .

کچەکە وتوویەتی :بیدە بە فلان کەس ... بەراستی سەرسام بووم لەوکارە و نکولیم لێکرد، بەلاَم کاتێ نامەکەم کردەوە سەرسامیەکەم نەما ، چونکە نامەکە لەو کچەوە بۆم هاتبوو کە پێشتر باسم کرد ، وتبووی بەراستی من سوپاسی ئامۆژگاریە بە هادارەکانی تۆ دەکەم کە پێشکەشی منت کرد ، بەراستی خەریك بوو ئەوەی تۆ دەت وت رووبدات .

لە جاری دواهەمیندا کاتێ لە گەڵ ئەو خراپ بۆ کراوەدا چوومە دەرەوە ، هەوڵیدا بەهادارترین شتی من بەرێت بۆ خۆی، بۆیە منیش گریام ولێی پاڕامەوە کە بمباتەوە بۆ جێگاکەی خۆم، دوای پێداگرتن و گریان و پارانەوە گەڕاندمیەوە بۆ قوتانخانە و بۆ ئەو شوێنەی کەمنی لێوە هێنابوو ، بەڵێ خەریك بوو شەرەفم بچێت ، خەریك بوو ببمە قوربانی یاریەکی قیزەون ، و سەری خۆم و سەری کەسوکارم بنێمە قوڕ و لیتەوە ، بەلاَم خوای گەورە پاراستمی .

# به بانگخوازی چوویه ناو دینه‌وه به عاشقی هاته ده‌ره‌وه

(س.م ) چیرۆکی خۆی ده‌گێڕێته‌وه بۆمان له ژووری وتووێژدا ده‌ڵێت : من کچێکی زانکۆ بووم و ته‌مه‌نم ( ٣٠) ساڵه ، چومه ناو پێگه شه‌رعیه‌کانه‌وه به ئامانجی بانگه‌وازکردن بۆ لای خوا ، حه‌زم زۆر له په‌یڤین بوو ، له‌و بڕوایه‌دا بووم موناقه‌شه‌ی دۆزی هه‌ستیار و گرنگی تێدا ده‌کرێت ، به پله‌ی یه‌که‌م گرنگ بوو به‌لامه‌وه، وه گرنگ بوو بۆ بانگه‌وازکردن.. بۆ نموونه که‌ناڵه ئاسمانیه‌کان و قۆرخ کردنیان بۆ بانگه‌واز و مه‌شروعیه‌تی زه‌واج له رێگه‌ی ئینته‌رنێته‌وه .

له نێو به‌شداربواندا لاوێکی کراوه‌ی زیره‌کی تێدا بوو ، هه‌ستم کرد زیاتر له‌وانی تر جێگیر بووه له دڵمدا ،هه‌رچه‌نده بابه‌ته‌کان گشتی بوون ، به‌ڵام به‌شداریکردنی هه‌ستێکی وای لا دروست ده‌کردم که ته‌نها ئاراسته‌یه بۆمن ، نازانم چۆن وشه‌کانی کاریان تێکردم ؟

چاوه‌کانم به‌رده‌وام به دوای دێڕه سیحراوی و ده‌ربڕینه جوانه‌کانیه‌وه بوون ، له کاتێکدا له ناخیشمدا سه‌رسورمانێکی زۆر خۆی حه‌شار دابوو ، دڵه سه‌هۆڵبه‌ندانه‌که‌می به هێمنی تێکشکاندبوو ، له گه‌ڵ گه‌رمی وشه‌کانی و ده‌ربڕینی هه‌ست و سۆزه‌کانی مه‌له‌ی به من ده‌کرد و له‌ناو خه‌ون و خه‌یاڵ و هه‌ڵفڕین به ئاسمانی بووندا .

جارێکیان باسی ئه‌وه‌ی کرد که تایبه‌ته‌منده له کاروباری ده‌روونیدا له‌و کاته‌دا هه‌ستم کرد که‌من زۆر پێویستم به‌و هه‌یه ، وه به غه‌ریزه‌ی مێینه‌یی ، ده‌مه‌وێ به ته‌نها چاره‌سه‌ری من بکات ،هات به بیرمدا که به‌ته‌نها هه‌تا هه‌تایه بیر له‌و بکه‌مه‌وه ، وه به‌بێ ئه‌وه‌ی هه‌ست بکه‌م به

کەمێك شەرمەوە داوام لێکرد میوانداری بکەم و راستەوخۆ هەڤپەیڤین سازبکەم لە گەڵی ، بەو شێوەیە هێنام بۆ جیهانی تایبەتی خۆم ، وە من لەوپەری دڵەڕاوکێدا بووم وەکو چۆلەکەی ناو ئاو هەڵدەلەرزیم ، عارەق بە نێو چاوانمدا بە خوڕ دەهاتە خوار ، ئارەقی شەرم ، وە یەکەمین جار و لەوانەشە دوایەمن جار بێت .

وام لێهاتبوو خەریك بوو وەك ئەو ئافرەتەم لێهات کە دەیەویست یوسف لە خشتە بەرێت ، کاتێ کێشەیەکم دەبوو بیرم لە یەکێکی تریش دەکردەوە ، ئەویش وەك نەریتی ئاسایی لە وشەی سەنا و خۆشەویستی و سۆزداری و هاندان و چاندنی گیانی هیوا و بەختەوەری بێبەشی نەدەکردم ، ئەو ئەگەر پزیشکێکی دەرونی نەبوایە ئەوە بێگومان کەسێکی بەهرەدار بوو، دەیزانی مێنیە چی دەوێت .

خولەکەکان درێژ دەبوونەوە بۆ چەندین سەعات ، هەموو جارێك وشەکانی وەکو دەرمانێکی سارێژکەر وا بوو بۆ سەر برینەکان ، کاتێ دەمبینی کەسێك بەشداری خەم و ئازارەکانمە و ئومێد و گەشبینیم پێدەبەخشی ، هەستم بەو پەڕی ئاسودەیی دەکرد ، هەمیشە بە سۆز و میهرەوە قسەی لە گەڵدا دەکردم و خەمی دەخوارد بۆ مەینەتیەکانم ، کە تەواو هەستێکی دڵئارامی پێ ئەبەخشیم و تا منیش لە میانیەوە سەرسامی خۆم دەربڕم بەرامبەری کە وەسف ناکرێت .

لە قسەو باسی سوعبەتدا لە گەڵی توشی ئیحراجی نەئەبووم بەڵام لە گەڵ مەکر و نازی تایبەتدا کە لە مێینەوە ئاراستە دەکرێت و کە ناز و مێنیەتی خۆی نمایش دەکات .

ڕۆژێکیان خزمەتگوزاری ئەنتەرنێت بە هۆی کێشەی تەکنیکیەوە لە کار کەوت منیش تەواو سەرشێت بووم ، بە تەواوی تووڕە بووم و دنیام لە بەرچاو تاریك بوو .

کاتێك خزمەتگوزاریەکە گەڕایەوە ئاسودەییش گەڕایەوە بۆ من ، بە پەلە چووم بۆلای و پەیوەندی من و ئەو گەشتبووە ئەوپەڕی ، هەوڵمدەدا کە بە هەر شێوازێك نیشانی بدەم کە بێگومان ئەم پەیوەندیەمان پێویستە لە سنورێکی دیاریکراودا بوەستێت ، وە من لەخودی خۆمدا هەوڵم دەدا تاقی بکەمەوە تا چەندە هۆگری منە ... پێی وتم ئەمن وتۆ ناتوانین نکوڵی لە پێویست بوونی یەکتریمان بەوی تر بکەین ، دوای ئەو پرسیاری گەرمی لێکردم کە هەست بە سۆز و نیەت پاکی ئەو بکەم .

بە بێ ئەوەی بزانم داوای ژمارە تەلەفۆنەکەیم کرد ، تا ئەگەر خزمەتگوزاری وەستا ڕێگایەك شك بەرم بۆ پەیوەندی کردن لە گەڵی ، چون ئەو پزیشکی من و شەیدایی و دێوانەیی من چارەسەر دەکات !!

ئەوەندەی نەبرد هەر ساتی نا ساتی سەماعە حەرامەکە لە نێو دەستمدا بوو ، وام لێهاتبوو ماچم ئەکرد ، لە ناخمدا هەموو بەربەستێکی ئایینی توابوەوە تیاما،هەموو پابەندیەك کە بانگەشەم بۆ دەکرد توابوەوە تیامدا ! دەروونم بووبوو بە مەملەکەتێك لە خراپەکاری و کردەوەکانمی دەرازاندەوە و پاڵی پێوە دەنام بەرەو گومڕایی و بە بەڵگەی ئەوەی من مەبەستم زەواجە لە کەسێك کە خۆشم دەوێت لە سەر سونەتی خوا و پێغەمبەرەکەی .

پەیوەندیەکان بە هۆی تەلەفۆنەوە بەردەوام بوون ، بەلاّم لە گەلّیدا چەندین سەعات درێژەی دەکێشا و پێم وت : ئایا ئەم پەیوەندیەمان ئەکرێ بە زەواج کۆتایی پێبێت ؟

تۆ ئەو مرۆڤەی کە بەتەواوی من هەست بەدلّنارمی ئەکەم لە گەلّیدا ؟!. پێکەنی و بە گالّتە و قەشمەریەوە وتی : بەلاّم من هەست بە دلّنارمی ناکەم ....و لێت ناشارمەوە بێگومان من ئافرەتێکی تر دەخوازم کە پێش تۆ ناسیومە ، بەلاّم تۆ وەك هاورێیەك وایت ، وە بۆ ئەوەش دەشێیت ببیت بە عاشق .

لەو کاتەدا بە تەواوی شێت بووم و هەستم کرد کە زۆر بە سوکی تەماشام دەکات و منیش پێم وت : تۆ زۆر سوك و نزمیت .

وتی : لەوانەیە چاو لە برۆ بەرزتر نیە ...هەستم کرد دەیەوێت زیاتر سەرشۆرم بکات و پێم وت : من شەریف ترم لە تۆ و لە ... پێی وتم: تۆ دواهەمین کەسیت قسە لە سەر شەرەف بکەیت !! لەو ساتا زۆر تێك چووم و لە هۆش خۆم چووم .... بە هۆی سەختی کارەساتەکەوە کاتی هۆشم هاتەوە لە نەخۆشخانە بووم .

بەلّێ خۆم لە نەخۆشخانە بینیەوە ، کاتێ هاتمەوە هۆش خۆم بە سەر راستەقینەیەکی تالاّ هاتمەوە هۆش خۆم ، لە کاتێکدا بە مەبەستی بانگەواز چوومە ئینتەرنێت و کاتێکیش بەجێم هێشت بۆ هیچ نەئەشام بۆ عاشقی نەبێت !!

چی روویدا ؟! شوێنی فیقهی شەیتانی نەفرەت لێکراو کەوتم بە ناوی بانگەوازەوە منی خستە ژووری گومراییەوە ، بە هۆیەوە وازم لە خوێندنی قورئان هێنا و نوێژەکانم دەفەوتان و خوێندنم پشت گوێ

خست و و ئاستم دابەزی ، ئای چەندە هەڵخەڵەتاو و دڵخۆش بووم بە بەختیاری لە نێتەوە دەستم کەوێت .

ژووری پەیڤین فیتنەیە ...خوشکانی بەرێزم ئاگاداری خۆتان بن لەوێدا ، هیچ خێرێکی تێدا دەستگیر نابێت ئەگەر بەربەستی ئیمانی دانەنێیت بۆ خۆت کە رێگای رۆچوون بەرەو ئارەزووەکانت لێئەگرێت .... ئێستا توشی شۆکێکی دەروونی بووم و تەنها خوای گەورە ئاگای لێیە ... وە دەخوازم لە خوای گەورە کە بە تەواوەتی لێم ببورێت و تەوبەیەکی یەك جارەکی دەکەم و .... لەهەرچی گوناهی رابردوومە خۆش بێت .

# کۆتایی چوونە ( چات )

ئەم بەسەرهاتە لە یەکێ لە کۆلێژە تایبەتەکاندا روویداوە و پاڵەوانەکەشی کچێکە کە دەچووە ژووری چات ( chat room )ەوە رۆژێکیان ئاشنا بوو بە کوڕێك و زۆر هۆگری بوو، وە وەك شێت حەزی لێدەکرد ، ئەویش هەمان هەستی هەبوو بەرامبەری ، ئەو کچە هیچی دەربارەی ئەو کوڕە نەدەزانی تەنها ناوی یەکەم و پیشەکەی نەبێت ، .. لە زانکۆ کاتەکانی بەتاڵی ئەقۆستەوە و دەچووە ژووری چاتەوە و بە نووسین لە گەڵ یەکتری دەدوان .

ئەم سەبارەت بەخۆی هیچی پێنەوتبوو . بەلاّم ئەو دەیویست ناوی خۆی پێبڵێت . یان ماڵیان تا بڕوات بیخوازێت ، بەلاّم ئەم هیچی نەوتبوو ، چیرۆکی خۆشەویستیەکەیان هەشت مانگ درێژەی کێشا .

رۆژێکیان لە کاتێکدا برای ئەم کچە لە دەرەوەی ماڵەوە بوو خوشکەکەی چووە ژووری براکەیەوە تا رێکی بکات بۆی .... چەند کاغەزێکی تایپ کراوی بینی لە پەڕاوگەکەیدا ... ئەو کاغەزی تایپ کراوانەی خوێندەوە .. بۆی دەرکەوت کە ئەو قسانە قسەی ئەمن و ئاراستەی خۆشەویستەکەی خۆیی کردووە ، وە ئەو شتانەیە کە بۆی نوسیووە ، هەر کە ئەو کاغەزانەی بینی تووشی حاڵەتێکی نائاسایی بوو ، بە هۆیەوە خستیانە ژووری چاودێری تایبەتەوە .

هەمووی لە بەر ئەوەی بۆی دەرکەوت کە ئەو کوڕەی ئەم وەك شێت عاشقی بووە ، کەس نیە بێجگە لە برا گەورەکەی نەبێت .

ئەمە کۆتایی کەسێکە لە رێگای چاتەوە خۆشەویستی و دڵداری بکات .

# ئەو كچەی گەڕایەوە بۆ لای خوا

ئەوە بوو پەروەردە كرابووم لە سەری وە وا گومانم دەبرد بەسە بۆ ئەوەی بمپارێزێت و دوورم بخاتەوە لە لەزەت و شەهوەتی دنیا ... بیرم چوو كە شەیتان سوورە لە سەر ئەوەی دوورم بخاتەوە لە هەموو ئەو شتانەی ئەگەر بۆی بلوێت تەنها بە ساتە وەختێكیش بێت .

ڕێگای من لە گەڵ شەیتاندا دەستی پێكرد بە چوونم بۆ ناو جیهانی ئینتەرنێت ، هەرچەندە حەزم لە شتێك نەدەكرد كە تێیدا خوا لە خۆم بڕەنجێنم ، نا نەبەخوا بەڵام شەیتان ئەو ڕێگایەی بۆ ڕازاندمەوە كە پێیدا دەچووم ، هەمیشە بە بیانووی ئەوەوە دەچوومە ئینتەرنێت كە گوێ لە سروود دەگرم و چیرۆكە بەسودەكان بخوێنمەوە ، چومە ناو ئەو جیهانە پڕ لە تەكنەلۆژیا و پێشكەوتنی زانستیەوە ، كە هەمیشە حەزم لێدەكرد ، ئایا بینیتان من زۆر تامەزرۆی ئەوە بووم .

من لە هەفتەیەكدا تەنها دوو ڕۆژ دەچوومە سەر ئینتەرنێت ، لە سەرەتادا كەسوكارم ڕازی نەبوون، چونكە زانیاری كەمیان هەبوو دەربارەی ، منیش پێم وتن : هەموو شتێك چاك و خراپی هەیە هەریەكە لە ئێمەش عەقڵی هەیە و دەزانێ چی دەستنیشان دەكات ، سوپاس بۆ خوا من پێویستم بە كەس نیە لەو جۆرە كارانە ڕێم نیشان بدات .

وام لێهات ڕۆژانە دەچووم بۆ ئینتەرنێت ، فێری ئەوە بووم چۆن پۆستی ئەلەكترۆنی بۆ خۆم دابنێم ، ڕۆژێكیان ماڵەوەمان هەموویان خەوتبوون بڕیارمدا بچمە پێگەیەكەوە كە پێك هاتبوو لە وتوێژ بە نووسین ... تەنها حەزم ئەكرد و هیچی تر ....وەك دەڵێن ( كل ممنوع

مرغوب ) هەموو قەدەغەکراوێك حەزلێکراوە ...چووەمە ئەو پێگەیەوە ... وە جیهانێکی ترم بینی ... لاوان ، کوران و کچان لە یەك شوێندا بە بێ چاودێری ، کەس بێدەنگ نابێت بۆ کەسی تر ، قسە لە بارەی هەموو شتێکەوە دەکرا ، هەموو شتێك .. لە سەرەتادا یەك پیتم نەنوسی نەك لە بەر ئەوەی نەمدەزانی بەڵکو تەنها حەزم دەکرد شتەکان بخوێنمەوە ، بارودۆخەکە بەدڵی من نەبوو بۆیە ئامێرەکەم کوژاندەوە و هاتمە دەرەوە و رۆشتم بخەوم .

بۆ هەفتەی دووایین وتم : بۆچی من و خوشکەکەم کە لە من منداڵتر بوو لە گەڵ کچەکەی خاڵمدا ئەو سایتە نەکەینەوە تەنها بۆ پێکەنین و کات بەسەر بردن ... تا نیشانیان بدەم چیم دۆزیوەتەوە .. لە گەڵیاندا کردمانەوە ، سەرەتا چەند وشەیەکمان ئاراستە کرد و بەشداری قسەکردنەکانمان کرد ... لەو کاتەدا نازناوی یەکێ لە وتوێژکەرەکان سەرنجی راکێشام کە کەم قسەی دەکرد و ئەگەر قسەشی بکردایە بە رێزەوە قسەی دەکرد .

لەو کاتەدا زۆر گرنگیم پێنەدا و ئامێرەکەم کوژاندەوە و رۆشتین خەوتین... دوای ئەوو بۆ هەفتەی ئایندە خۆم بەتەنها چوومەوە بۆ چات کردن ، خۆم رۆشتم بەهۆی پاڵنانی دەرونی و پاڵنانی شەیتانی نەفرەت لێکراو بۆ ژووری قسەکردنی تایبەت لە گەڵ ئەو لاوەدا ، لە سەرەتادا نەیویست قسەم لە گەڵدا بکات ، نەمزانی بۆچی؟ لەوانەیە جۆرێ بێت لە هەڵسوکەوتی کوڕانە کە وەك دەڵێن ، وە من نازانم هەموو ئەو شتانە بۆچی .

بە هەر حاڵ مامەوە لە قسەکردن بە شێوەیەکی خوشك و برایانە وەك وا دەڵێن ، وەك ئەوەی کە من پێویستم بە یەکێك هەبێت کە قورسایی

مـن كـەم بكاتـەوە ، لەوانەيـە بـە هـۆی نـەبوونی سـۆزداريەوە بێـت كـە هەموو كچێك پێويستی پێيەتی .

ئاه ، بەراستی بەهانەيەكی ناشرينە بۆ هەموو كچێك كە ئەو رێگايە دەگرێتەبەر ، بەڵام بە خوا ئەوە هۆكار نەبوو ، هەرچەندە من كاتیٚ كە تەمەنم منداڵ بوو باوكم وەفاتی كردبوو ، ئەوە هۆكار نەبوو ، بەڵكو شـەيتان ئـەو لاوەی نزيـك كردبوويـەوە لـە هـۆش و دڵمـدا ، وە بـە سيفەتەكانی جوانی كردبوو ، وەك ئەوەی لە بەردەممدا وەستا بێت ، لێرەوە هەستم بە ئاسودەيی كاتی دەكرد تەنها كاتیٚ قسەی لە گەڵدا دەكردم هەرچەندە دەلەرزيم و دەترسام يەكێك لە كەس و كارەكەم لە پڕ خۆيان بكەن بە ژووردا .

ئای كە گەمژە بووم ،لە ترسی خوا نا، من ئەو كاتە پێشەنگ بووم بۆ هاوڕێكانم و خوشك و براكانم ، هيچ گوێم بەو قسانە و شتی تر نەدەدا ، بەو رێگايەدا رۆشتم .. شەيتانيش پێی دەوتم : تۆ لە خەڵكی زۆر باشتريت ... يەكەم ئەوەی تۆ قسەی لە گەڵدا دەكەيت بە هۆی تەلەفۆنـەوە نيـە و گـوێی لـە دەنگـی تۆنيـە وتـۆی نـەبينيوە، ئـەو لـە شوێنێكی دوورە و لە شارێكی تر دەژی )

بە هەرحاڵ هەر لە سەرەتاوە من شتەكەم بە بچوك تەماشا كرد ، بە تێپەربوونی كات و و دوای چەند مانگێك باسێكی لە گەڵدا كردمەوە كە لە سەرەتاوە سەرسامی كردم ... بەڵام نەمدەتوانی داواكاريەكەی رەت بكەمەوە ، ئـەو شـەونخونی دەكێشێت لـە سـەر ئـەو ئـامێزە و رۆژانـە چاوەڕوانی منە سات لە دوای سات ... ئايا دەزانی داواكاريەكەی چی بوو ، دەيەويست لـە رێگـای تەلەفۆنـەوە قسەم لەگەڵدا بكـات .. لـە

سەرەتاوە وتم : نانا چۆن کەس کارەکەم گوێیان لە دەنگمەوەیە کاتێك قسەت لە گەڵ دەکەم .

بە هەر حاڵ دوای ئەوەی لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە قسەم لە گەڵدا کرد ، ئەو کاتە تەنها لە کەس و کارەکەم دەترسام ،سبحان الله چۆن شتەکان ژێرەو ژوور بووبوون ، من بە خۆمم دەوت ئەگەر لە ڕێگای ئەو ئامێرەوە بدوێت لە گەڵمدا باشترە لەوەی کە بەهۆی مۆبایلەوە قسەم لە گەڵدا بکات و کەس و کارم بزانن ، ئێستاش شەیتان پێم دەڵێت: ( تۆ لەخەڵکی زۆر باشتریت ) .

دوای دووهەفتە داوای ژمارە مۆبایلەکەمی کرد ، ئەو کاتە بە دەستی منەوە نەبوو ، تەمەنم شانزە ساڵی تێپەراندبوو ، سەبارەت بەوە زۆر ڕاڕابووم هەڕەشەی ئەوەی لێدەکردم کە دوور دەکەوێتەوە و وازم لێ دەهێنێت و مادام دوای ئەو هەموو ماوە درێژەی پێکەوە بەسەرمان بردووە متمانەی پێم نیە ، منیش زۆر ترسام لەوە، چونکە زۆر هۆگری بووبووم ، بۆیە بە خێرای ڕازی بووم ، بەڵام کێشەیەك هەبوو ، چۆن ؟ و لەکوێوە ؟ وتم : من ناتوانم ئەوە دابین بکەم بۆخۆم ، شەیتان بە نیازە گڵاوەکەی پێی وتم : چۆنە ئەگەر بە مۆبایلی خوشکەکەت قسەم لە گەڵدا بکەیت ؟

بۆیە لە ڕێگەی مۆبایلەکەی ئەوەوە قسەم لە گەڵدا کرد ، وێنای بکە، شەوەکان چۆن گۆڕان ، بەراستی ئێمە پێشتر بە ڕۆژوو دەبووین و خەتمی قورئانمان دەکرد ، من و خوشك و برا کانم و دایك و باوکم ڕەحمەتی خوایان لێبێت ، ڕەمەزان تێنەدەپەری هەریەکەمان گوێی لە ئەوی تر دەگرت تا بزانێت چەنێکی قورئانی لە بەرە ، ئای داد و بێداد بۆ ئەو ڕۆژانەی کە ئاوا بەسەر چوون .

بەو شێوەیە نزیکەی سێ ساڵ ماینەوە ، چوارەممان تەواو نەکرد من لە ئینتەرنێت شارەزابووم ، شتانێکی زۆر فێربووم ، وەکو زیادکردنی ناونیشانی ئیمێڵەکان لە سەر( ماسنجەر ) ی خۆم .

موعتاد بووبووم بە وتووێژە نامەییەکان ، هەر کاتێك سەرسام بوومایە بە یەکێکیان میوانداریم دەکرد بۆ قسەکردنی تایبەتی لە گەڵیدا ، جارێکیان لە گەڵ یەکێکیان رۆچووم لە قسەکردندا ، کارەسات لەوەدا بوو نزیکی گەڕەکەکەمان بوو ، باسی خۆمم بۆ کرد لە گەڵ ئەو لاوەدا کە هۆگری بووم ، وە هەموو شتێکم بە درێژی بۆ باس کرد ، تەواو خۆم فەزح کرد ، لاحول و لاقوه الا بالله .

لەو کاتەدا ئامادەییم تەواو کرد ، لە بەتاڵیەکی زۆر ناخۆشدا دەژیام چاوەروانی ئەوەم دەکرد لە زانکۆ وەربگیرێم تا کاروانی خوێندن و کۆشش تەواو بکەم ، حەزم لە قسەکردن بوو لە رێگەی ماسنجەرەوە لەو کاتەدا ئەو لاوەی نزیکمان بوو وتی : ئەو ئێستا دەیەوێت بە خێرایی بڕواتە دەرەوە و دەیەوێت بۆ جاری دووەم و لە نزیکترین کاتدا من ببینێت ، بەڵام نەیدەزانی لە چ کاتێکدا من لە سەر ئینتەرنێتم .

پێم وت : من نازانم کەی فرسەتم بۆ ئەلوێت بۆ ئەوە ، بۆیە لە رێی ئینتەرنێتەوە شەیتانەکە هاتەگۆ کە دواهەمین بیرۆکەی پیسی شەیتانی بوو ،چارەسەرێکی خێرای پێشنیار کرد ... پێی وتم : بۆچی لە رێگەی مۆبایلەوە پەیامێکم بۆ نانێریت ، منیش ئەو کاتە دەچمە سەر ئینتەرنێت کە تۆ دەچیتە سەری ... بیرۆکەکەیم بە تەواوی رەفز کرد .. بە هۆی نەشارەزاییم بەو کارە، لەو کاتەدا چونکە ساڵێك بەسەر ئەوەدا تێنەپەریبوو کە من مۆبایلم کریبوو .

بەلاَم ئەو پیسە بۆگەنە مۆبایلێکی پێشکەوتووی پێبوو کە ژمارەی مۆبایلەکانی دەردەخست .... با بە پەیامێکیش بووایە وەك ئاماژەیەك کارەسات لەوەدا بوو .. ژمارەکەی منی زانی ... هێشتا بە تەواوی بەلای کەمەوە لە رێگەی ئینتەرنێتەوە قسەمان نەکردبوو لەگەڵ یەکتردا و هیچ متمانەیەك لەو کاتەدا لەنێوانماندا دروست نەبوو بوو .

ئەوە یەکەم جار بوو کە قسە لەگەڵ یەکێکدا بکەم کە ئەگەری ئەوەی هەیە لە هەر سات و لە هەر کاتێکدا لە بەردەممدا ببینم ... ئەو کاتە نەمزانی چۆن هەڵسوکەوت بکەم ، ترس دایگرتبووم ، لە هەموو ساتێکدا مۆبایلەکەم بە دەستمەوە بوو ، تا نەکەوێتە بەردەستی کەسێکی تر .... کەس نەیئەزانی چ کاتێك پەیوەندی دەکات ، بوون بەدوانیش ، بەراستی حاڵەتەکەم پڕ بوو لە ترس و دڵەراوکێ نەوەك نهێنیەکەم ئاشکرا بێت ، تینووی دڵئارامی و بەختەوەری سروشتی بووبووم کە پڕ بێت لە داوێنپاکی و پاکیزەیی ، شەیتان خستبوومیە تاریکستانێکەوە تەنها بەگوێڕایەڵی خوای گەورە و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی دروودی خوای لەسەر بێت دەرباز دەبووم .دوای ماوەیەك دووەمیان هەڵی نامەوە تا بچمە دەر لەگەڵی، من بۆ ماوەی مانگێك بە هۆی ئەو داواکاریەوە دوورکەوتبوومەوە لێی ، بەلاَم ئەو بە قسەو شیعر و پەیام بەسەری دەکردمەوە ، بۆیە دڵی هێنامەوە جێ و شەیتانەکەی زاڵ کردەوە و بیرۆکەکەی لە دڵمدا نەك لە عەقڵمدا جوان کرد و عەقڵم لەو ماوەیەدا بە تەواوی بێئاگا بووبوو... لەو کاتەدا تەلەفۆنم بۆ کرد و پێم وت کە رازیم بەو داواکاریەی و بە تەواوی شێت بوو ، بڕوای نەدەکرد چونکە یەکەمین جار بوو من ببینێت .. بۆیە سوور بووم کە بەو رێگایەدا بڕۆم و قەناعەتم بە خۆم کردبوو کە تووشی هیچ

زیانێك نابم ،مادام نیازپاکی خۆی بەرامبەرم دەرخست ، بۆ ماوەیەکی کەم بە ئۆتۆمبیلەکەی گەڕاین و سوڕاینەوە و پێشنیاری کرد کە بچین بۆ یەکێ لە چێشتخانەکان تا شتێك بخۆین و منیش رازی بووم ، بە بیرمدا نەدەهات کە ئەو ئامانجی ئەوەیە بە تەنها لە گەڵمدا بێت ... ئەوەی کە دەبووایە رووی نەدایە روویدا ، لەو چەند ساتانەدا .. پێش ئەو هیچ پیاوێك دەستی بەر دەستم نەکەوتبوو ، کاتێ دەستی دا لە دەستم زۆر قورس بوو بە لامەوە بۆیە بورامەوە و لە هۆش خۆم چووم و بە زەویدا کەوتم ... ئاه ....ئاه لەو رۆژانەی کە تێپەڕین ، بە خوا مەبەستم وروژاندنی فیتنە نیە ، بەڵکو پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسێ کەدڵی بێئاگایە و ئیمانی کز بووە و شەیتانیش رێگاکەی بە جوانترین شێوە بۆ رازاندوەتەوە .

دوای ئەوە شەرمم کەم بوویەوە و موعتاد بوو بووم بە چوونە دەرەوە لە گەڵیدا و سەرسام بووم بەو کارە ، بێجگە لەو هاورێیەتیم لە گەڵ سێ کەسی تردا پەیدا کرد کە نزیك بوون لە گەڕەکەکەمانەوە تا وەکو بتوانم لە گەڵیاندا بچمە دەرەوە و هەندێ کاتیان لە گەڵدا بەسەر بەرم .. هەموو ئەمانە لە رێگای ئینتەرنێتەوە .

هەموو ئەو شتانەی کە بەسەرمدا هات بێجگە لە خوای گەورە کەسی تر پێی نەدەزانیم ... ئەمەش فەزڵێکی خوایە بەسەرمدا کە دایپۆشیوین بە هەرحاڵ دوای ماوەیەك یەکێکیان ناردیە خوازبێنیم سەیر نەبوو کە تەماحی هەبێت بە من ... هەموو جارێ کە خزمەکانمان و دراوسێکانمان کۆدەبونەوە ، گوێم لێ بوو کە دایکی فلان و دایکی فیسار باسی من دەکەن کە حەز دەکەن بمخوازن بۆ کوڕەکەیان .... یان بۆ کوڕی دراوسێکەیان یان .... یان .. یان ... ئەزانی بۆچی ؟ چونکە

من کچی ئەو باوك و دایکە بووم .... بە بۆچوونی ئەوان ... چونکە من تۆوێکی صالح بووم و لەماڵێکی صاڵحدا پەروەردە بوو بووم ...و گەورە بووبووم ..هێشتا کچێکی صاڵحە هەرچەندە باوکیشی وەفاتی کردووە و هەر لە سەر رێگای ئەوانە .. ئەمە بە بۆچوون و گومانی ئەوان ... نەیاندەزانی کە ئەو کچەی لە ژیانی دایك و باوکیدا صاڵحە .. ئێستە سەرەڕۆیە و لایداوە و لەگەڵ هەوا و ئارەزواتدا رۆچووە ..

بەراستی دوای کۆمەکی خوای گەورە ئەوە هۆکار بوو کەمن بە ئاگا بێمەوە و بەڵێنم دا بە خۆم ، ئەوەش پێش شوکردنم بە ساڵێك کە پێویستە بگەڕێمەوە بۆ لای خوای گەورە ... گوێم لە دەوروبەرم دەگرت سەبارەت بە سەر گوزەشتەگەلێك ،وەمن حەزم دەکرد گوێ لە بەسەرهاتی تۆبەکاران بگرم ، رۆژێکیان باسم دەکرد بۆ هاورێکانم بۆیە بەحەز و تاسەوە بووم بۆ بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد ئاسمان و زەویە ، وە بە حەز و تاسەوە بووم بۆ دیدەنی خوا کە رازی بێت و لێم تورە نەبێت .

وە بە حەز و تاسەوە بووم بۆ ئەو کەسەی کە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی و قورئانەکەی خستبووە دڵمەوە، وە بۆ بینینی ئەو کەسەی کە ئەو حەزەی خستبووە دڵمەوە کە ببم بە دایکێك بە نموونە باسی بکەن ، دایکێکی سالح .. دەمویست شوێن پێی ئەوان هەڵبگرم و کاروانەکەیان تەواو بکەم .. بەڵێنم بە خۆمدا لە سەر پابەند بوون و نوێژکردن و وازهێنان لە هەموو ئەو شتانەی ئەو لاپەرە رەشەی دەهێنامەوە یاد ، کە بە تەواوی دڵم و عەقڵمی داخستبوو ، هەناسەمی شاردبوویەوە منی کردبوو بە کچێك کە تەنها گرنگی بە خۆی بدات و

دووركەوتبوويەوە لە زیکر و یادی خوا ، وە هەمیشە حەزم لە کەناڵە ئاسمانیەکان و هۆگری گۆرانیەکان بوو .

سوور بووم لە سەر ئەوەی کە لە رواڵەتمەوە دەست پێبکەم ، بۆیە وازم لە دەستکاریکردنی بڕۆم هێنا و ئەوانەی دەوروبەرم دڵخۆش بوون بەوەو هانیان دام و ستایشی هەنگاوەکەیان کردم ، بەڵام نەیان دەزانی کە من لەوە مەزنتریش لە ئارادایە کە بێجگە لە خوا کەس نایزانیّ ، لە هەموو ئەوانە دوور کەوتمەوە بە مەبەستی رەزامەندی خوای گەورە ...
خوای گەروە فرسەتی زۆری پێدام لە سەر زەوی منی داپۆشی ، ئیتر تاکەی نوقمی تاوان بم، پێویستە ئەو ویژدانە بێتەوە هۆش و ببزویّ و هەولّ بدات بۆ گوێرایەڵی خوای گەورە ،لەسەرەتادا بریارمدا کاتێك تەرخان بکەم بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز کە هیچ شتی تر سەرقاڵم نەکات و سوور بووم لە سەر نوێژکردنی بەیانیان و هیچ رۆژیّ فەرامۆشی نەکەم ، سوپاس بۆخوای گەورە بە فەزڵی خوای پەروەردگار وازم لە هەموو ئەو لەزەت و بەختەوەریە کاتیانە هێنا ، خوای گەروە بەمێردێکی صالح قەرەبووی بۆ کردمەوە .

ئەوەی لەبەر خوای گەورە واز لە شتێك بهێنێت خوای گەورە بە باشتر بۆی قەرەبوو دەکاتەوە ، خوای گەورە راستی فەرمووە (إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ) الرعد ١١ واتە ( بەراستی خوا بارو حاڵی هیچ گەلێك ناگۆڕێت هەتا ئەوان بار و حاڵی خۆیان نەگۆڕن وە کاتێك خوا بیەوێت هۆزێك تووشی بەلاّ بێت هیچ بەرگرێکی بۆ نیە و

جگه له خوا هیچ یارمەتیدەرێك و پشتیوانێکیان نیە) ...له خوای گەورە دەپارێمەوە لـە مـن و لـە ئێـوەش خـۆش بێـت و سـڵاوات و سـەلام بـۆ پێغەمبەری خوا محمد ﷺ و لەسەر یاوەرانی .

# شۆڕە سوار

بەڕاستی کوڕێکی درۆزن و فێلباز بوو ، شایانی هیچ نیە لەمنەوە تەنها سەرزەنشت نەبێت ... خۆشەویستی و هۆگر بوونی منی بۆخۆی قۆزتەوە و شەرەفی لە کەدار کردم ، ناوی خێزانەکەمانی زڕاند و گومان و شکی لە هەموو بوارەکانی ژیانمدا وورووژاند .

( فەوزیە ) کە لە بەهاری تەمەنیدا بوو ، فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس مابوو ، فرمێسکەکانی دەسڕی و و بەدەنگێکی هێواشەوە دایە پڕمەی گریان و ووتی : بەسەرهاتەکەم لە سەر زاری خۆم بنوسن ، هەتا هەموو کچێکی بێئاگا وانەی لێوەرگرێت و هەموو کچێك کە لادەدات لە داب و نەریت و بنەماکانی خێزانی .

فەوزیە ئامادەیی تەواو کردبوو ، بەلاَم لە بەر کۆمەڵێك هۆکار نەچووبوویە زانکۆوە، بەلاَم قەرەبووی ئەوەی کردبوویەوە کە نەچووبویە گۆرەپانی بەرفراوانی زانکۆ ؟، هەمیشە فەوزیە ئاواتی ئەوە بوو شوو بکات و بچێتە ماڵی خۆیەوە و ببێت بە دایك و منداڵەکانی پەروەردە بکات و کۆرپە لە ئامێز بگرێت .

بەڵکو خەونە گەورە و بچوکەکانی خەریك بوو قەرەبووی بۆ دەکردەوە تەنها سەرقاڵ بوو بە خەونەکانیەوە هەموو رۆژێك ... بەڵکو هەموو سات و کاتێك .

لەپڕ لاوێکی کوڕ چووە ناو ژیانیەوە و فەوزیە دەڵێت : کاتێ حەماسەت گرتبووی وەك ئەوەی هاوار بکات تا هەموو ئەوانەی گوێیان گرانە بیبیستن )... لەرێی تەلەفۆنەوە ناسیم ، خوشکەکەی پێی ناساندم کە هاوڕێی تەمەن و یادگاری منداڵی بەستبوومیەوە پێیەوە .

ئێوارەیەکیان لە گەڵ خوشکەکەیدا قسە و باسمان دەکرد لە ڕێگای تەلەفۆنەوە وتی :ڕات چیە بەرامبەر بە براکەم ؟

وتم : بۆ چیەتی ...ئەویش وەك تۆ مرۆڤێکی زۆر چاکە .

وتی : مەبەستم ئەوە نیە

وتم :ئەی مەبەستت چیە ؟

بە بوێرانەوە وتی : ڕات چیە ئەگەر بێتە داوات .

فەوزیە هاواری کرد :نا نا هێشتا کاتی ماوە، من لە سەرەتای ڕێگادام و نامەوێت لەوەدا پەلە بکەم.

هەستم بە دۆش دامانی دەنگی هاوڕێکەم کرد ، وەك ئەوەی لۆمەم بکات ، هاوڕێی تەمەنم زویر کرد ، ئەو ئێوارەیە کۆتایمان بە قسەکردن هێنا ، دانیشتم بە تەنها بیرم دەکردەوە بیر و هۆشم جەنجاڵ بوو وەك ئەو کەشتیەم لێهاتبوو کە شەپۆلەکانی بەلای ڕاست و چەپدا دەیبەن .... بەراشکاوانە پێتان بڵێم ، بەبێ قەید و شەرت ڕەزامەندی خۆمم نواند .

ئیتر لە ڕێگای تەلەفۆنەوە چەندین سەعات قسەمان لە گەڵ یەکتردا دەکرد ، سەرسام و هۆگری قسە هەنگوینیەکانی بووبووم ، بە درێژایی تەمەنم قسەی وا خۆش و شیرنم نەبیستبوو ، پەیوەندی نێوانمان پەرەی سەند و نەخشەمان بۆ ئایندەمان و پاشەڕۆژمان لە خەیاڵی بەرفراوانماندا دەکێشا .

شێوەی ئەو ژیانی خێزانداریەی پێکی دەهێنین ...منداڵەکانمان.... ئەو گەشتانەمان کە کۆتایی نایەت .. سۆز گۆڕینەوە و بەرخودان و قوربانیدان .. پاشان ئارامگرتن .

ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی بەسەر ئەو خەونانەدا بڕیارمدا سنورێك بۆ ئەو پەیوەندیە لە لایەن خۆمەوە دابنێم ، پرسیارم لێمەکەن بۆچی ... چونکە ئەگەر هۆکارەکەتان زانی سەرتان سووڕ نامێنێت ( فاذا عرف السبب بطل العجب ) .

فەوزیە دەڵێت : کوڕەکە هەوڵی دەدا کە خاوم بکاتەوە لە سەر بڕیارەکەم و سوور بوو لەسەر ئەوەی کە پەلە نەکەم تێیدا و چاوەڕوان بم ، بەلاّم من هەر لە سەر رەوتی خۆم بووم .. من تۆم خۆش ناوێت و وازم لێبهێنە .

وەك هەموو لاوێکی خۆپەرەستی سەرەڕۆ شێت وهاربوو ... هەڕەشەی لێکردم ، ئەو پشیلە ماڵیە، بووبوو بە ئاژەڵێکی دڕندە و پیس ، دەستی کرد بە هەڕەشە لێکردنم لە رێگای ئەو وێنانەوە کە بە دیاری پێشکەشم کردبوو .. وتی دەست دەکەم بە بلاّوکردنەوەیان، بۆ ئەوەی لە کەدارم بکات ئەگەر لە بڕیارەکەم پاشگەز نەبمەوە، ئیتر زیاتر سووك بوو لەبەرچاوم .. ئەو ناپاکە کاری خۆی کرد و هەڕەشەکانی خۆی جێبەجیٚ کرد و وێنەکانی نارد بۆ باوکم .. وێنای بکەن !!

باوکم خەریك بوو بمکوژێت و هەوڵم دەدا بە چەندین شێواز و بەدەم گریانەوە وتم : باوکە گوێم لێبگرە سوێندت بۆ دەخۆم بێتاوانم ، ئەو گەمژەیە بەڵێنی زەواجی پێدام و منیش رازی بووم ، پاشان رەفزم کرد ، باوکی ئازیزم بڕوای پێنەکردم ، بۆ هەتا هەتایە باوکم متمانەی پێم نەما ، من ئێستا دەناڵێنم و لە نێوان دووئاگردام، باوکی خۆشەویستم کە هەموو هۆکارەکانی متمانەیی لە ژێر پێمدا راکێشا و لاوێکی پیسی سەرەڕۆ هێشتا بەڵێنم پێدەدات و پەیوەندیە بەردەوامەکانی

**بەدوامەوەیــە ، مــن بــە تــەنها نــا بــەڵکو خوشــکەکانم بــە هــۆی خوشکەکەیەوە هەموویانی لەمن کردووە .**

**بەوەشــەوە نەوەســتا .. بــەڵکو بــەردەوام هەڕەشــە لــە خــۆم و لــە دەوروبــەرم دەکــات و دەڵێــت پــەنا دەبەمــە بــەر ســیحر و جــادوو کــردن تاوەکو رازیم بکات لەسەر زەواج .**

**من هەموو رۆژێ هەزار جار دەمرم .**

**[لە جریدەی لعکاظا دەرچووە لە هەینی ١٦ای سەفەری ١٤٢٤ ک]**

# سەعاتی سفر

هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات کە ئەو کارە بەو چارەنووسەیدا ببات ، کارەکە تەنها بێهودەییەکی سادەبوو دوور لە چاوی کەس و کار .. زۆر دڵنیا بوو کە کەس پێی نازانێت !! بەڕاستی سەعاتی سفر هات .. گوڵێکی گەش بوو ..ئایندە لە بەردەمیدا دەخەنیەوە ، ڕێگای دەبڕی بۆ ڕۆشتن بۆ قوتابخانە و هاتنەوە لە قوتابخانە .

جلەوی سەرپۆشەکەی شلّ و شۆڕ کردبوو هەروا بە ئارەزووی خۆی یاری پێدەکرد، پەچەکەش بەملا و بەولادا دەچوو، دەمو چاوی دەردەکەوت ... بێگومان پارێزراو نەبوو لە چاوی ئەو گورگە مرۆڤانەی کە بە شەقامەکانەوە بوون بۆ ڕاوکردنی ئاسکێکی سەرەڕۆ .

زۆری نەخایاند هەتا ژمارەی تەلەفۆنی یەکێکیان لە بەردەمیدا کەوت ، ئەویش ڕاڕا نەبوو لە هەڵگرتنی .. ئاشنا بوو پێی... کوڕێکی هەرزەکار بوو، کە دوور بوو لە کەس و کاریەوە و بەتەنها لەو گەڕەگەدا دەژیا !.

تۆڕی خۆیی هەڵدا بۆ نێچیرەکەی ، حەزەکانی جوڵاند ، پەیوەندی گوناهاوی گەشەی کرد و لە نێوانیاندا گەورە بوو ... بۆچی نا ...کچەکەش کەس چاودێری ناکات ، لە خێزانێکە کە تەڵاق هەڵی وەشاندووەتەوە کە بەراستی تەڵاق بوغزاویترین حەڵاڵەکانی خوای گەورەیە ، وە ناکۆکی بەردەوام خێزانەکەی هەڵوەشاندووەتەوە ... بۆیە بووە بە دەوارێك کە کۆڵەکەیەك نیە هەڵی گرتبێت و پەتەکانی کەوتووە و هیچ سۆز و خۆشەویستیەك نیە پێکەوە گرێی بات ..

زۆری لێکرد بیبینێت ، دوای ڕاڕاییەکی زۆر ئەو داماوە ڕازی بوو ، خۆزگە ڕازی نەبوایە ، زۆر بە ئاسانی بووبە نێچیرێکی ناو ئەو داوە ودوای ئەوەی گورگەکە بردیەوە بۆ ماڵی خۆیان .. چەند ساتێکی نەخایاند داوێن پاکی و پاکیزەیی ئەو کچە داماوەی بە چەقۆی ناپاکی و دڕەندەیی سەربڕی !!.

ڕۆژگار تێپەڕین و ئەویش سکی پڕ بوو... بەرهەم و بەری تاوانەکەی چاوەڕوانی ساتی ژانە، تا کۆرپەیەکی ببێت کە شێواوە و پیس بووە بەخوێنی حەیا چوون ، نە ژیانی تیایە نە ڕۆح !! دایکی بۆی دەرکەوت و لەسەختی ڕووداوەکە دەیقیژاند چۆن کچە تەمەن پانزە ساڵەکەی سکی دەبێت و منداڵی دەبێت ؟!!

بە خێرایی ڕای کرد بۆلای باوکی و تا هەواڵی پێبدات و تەدارەکی کار و بارەکان بکەن ، بەڵام پاش چی .. ئەو کچە داماوە سەربڕاو خوێنی لێدەتکا !!ئەنجامەکەشی گورگەکە ڕەوانەی بەندیخانە کرا و کچەکەش خرایە خانەی چاودێری کۆمەڵایەتیەوە ...

سەرەتا لەچکێك و باڵا پۆشیەکی شل و شۆڵ و کۆتاییەکەشی ئەوە بوو خوێندتانەوە .........!!

# دانپیانانەکانی قوتابیەکی کچ

مامۆستا بەڕێزەکەم : ئەوەتا من خواحافیزی لە ڕۆژانی خوێندن دەکەم ، بەڵام خواحافیزی لە تۆ ناکەم، بەڵکو دەستم درێژ دەکەم بۆت تا فریام کەویت ، تکا دەکەم بە تەنها جێم نەهێڵیت ، بکەومە ناو تاریکایەکانەوە و ئاه و حەسرەت وەك خۆرە دڵم بخوات .

نهێنی خۆمت پێ دەڵێم و مەینەتی خۆمت بۆ باس دەکەم و ئازار و تیاچوونی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە ، بەسەرهاتی رابردووم زۆر راشکاوانە دەگێڕمەوە ، چونکە من راستگۆم و بۆ ئەوەی کۆمەکم بن .

داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر بوێر بم لە شکات کردنەکەمدا تا ئەو رادەیەی دەرم کات لە بازنەی بوێری بۆ شتێك کە حەزناکەم ناوی بنێم. لاپەرەیەکی رەش و شێواو دەخوێنیتەوە لە لاپەرەکانی ژیانم تەنها کە دێڕەکانی کۆتاییان نایەت .. کە ووشانێکن دەبێت بە فرمێسکی تۆبە و پەشیمانی نووسرابێتەوە.. گەڕامەوە لە رێچکەی سەرگەردانان . رابووم لە خەوی بێئاگایان.. ئازاری شۆك و کارەساتەکە بە ئاگای هێنامەوە و دەنگ و سەدای تۆ منی گەڕاندەوە .

بە راشکاوی وەڵامت دەدەمەوە ، خۆمت بە تەواوی پێدەناسێنم وەکو خۆی، وەك ئەوەی کە دەورووبەرەکەم ناسیومیان .. من ( رەشا ) ی تاوانبارم .. من (رەشا)ی سەرەڕۆم، خەڵکی ئاوایان پێ دەوتم کە پێناسەیەکی ناخۆشە سەبارەت بەمن ، من خوێنکارێکی تەمەڵ و بێزار بووم ، من خوێنکارێکی خەمۆك بووم.. (رەشا ) ...هەمیشە لە کورسیەکانی دواوەوە دادەنیشتم ، پشتم دەچەماندەوە و سەرم دادەنەواند ، لە گەڵ ئازارەکانمدا بووم ، یان لە ناو خەونەکانمدا مەلەم

دەکــرد ،لــە گــەڵ خــەون و ئەنێــشەکاندا دەفــڕیم و دەگــەڕام ، بــەڵام لەوانەکــەی تــۆدا لــە جیهــانی خەونەکانــەوە دەکەوتمــەوە نــاو جیهــانی ڕاستەقینەوە چونکە هەمیشە تۆ تـەنیایی منـت دەڕەوانـدەوە و جیهـانی خەونـەکانمت تێدەپەڕانـد و هەنـدێ وشـەت ئاراسـتە دەکـردن ، هـەموو دیـوارە ناماقوڵـەکانی بەســەر ســەرمەوە یــەکالا دەبوونــەوە و دەبوونــە سەراب و دەگەڕامەوە بۆ لای تۆ ، هەموو وانەیەك دەمامەوە لە گەڵ تۆدا ، تـۆ بـە چـاوەکانت و بـە بینـاییـت سـەرنجی هـەموانت دەدا ، هـەموو قوتابیەکی سـەرەڕۆت بە ئاگا دەهێنایـەوە ، هەموو قوتابیـەکی سستت چــالاك دەکــردەوە ، بــە هەڵــسوکەوتت و قــسە شــیرینەکانت هــەموو قوتابیەکی گۆشەگیری دەواند و دەهێنایە قسە .

بەڵام من هەر کاتێك تەماشات دەکردم سەرم بەرز دەکردەوە و پشتم ڕێـك دەکـردەوە و لـە جیهانـە ئەفسوناویەکەم دەهاتمـە دەر .. زۆربـەی کاتــەکانم لــە گــەڵ تــۆدا دەبــووم ، هەرچــەندە لــەلای زۆربــەی مامۆسـتا ئافرەتـەکان بێـزراو بـووم ، هـەیانبوو بـەردەوام سەرزەنـشتی دەکـردم ، هەشیان بوو قسەی لە گەڵدا نەدەکردم ، یان هەر تەماشاشی نەدەکردم ، لەترسی ئەوەی قسەیەکی ڕەق نەکەم یان سـەرنجێکی بێـزراوی ئاراسـتە نەکـەم ، تـەنها تـۆ هەڵـسوکەوتت دەکـرد لـە گـەڵ ڕەشـا ی بێـزراودا ، کەخاوەنی دوو چاوی سەخت و حـەیران بووکە ، لەگـەڵ سـوور بوونتـدا تۆم خۆش دەویست، سیفاتانێکی گـەورەم لـە تـۆدا دەبینـی کە لـە منـدا نەبوو .

خۆشم دەویستی هەرچەندە دڵی وشکەوە بووم مانای خۆشەویستی بەرامبەرەکەی نەدەزانی ، دڵێك بوو وشك بووبوویەوە لـە هـەموو هەست

و سۆرزێك ، تەنها هەست كردن بە رق و كینە و خراپە نەبێت لە گەڵ هەموو كەسێكدا ..

من ئەو دڵەی تۆم دەناسی كە رات هێنابوو لە سەر خۆشەویستی خەڵكی و رای دەكرد لە دڵە كیناویەوكان ، بەڵام وازم لێبێنە با بگەم پێت و پێویستم پێتە وەك چۆن زەوی تینوە و پێویستی بە دڵۆپە ئاوە.

رێگام بدە دڵی خۆم بۆ تۆ بكەمەوە وگوێ لە بەسەرهاتم بگرە :

پێش چەند ساڵێك من مرۆڤێك بووم وەكو مرۆڤەكانی تر ، كچێكی بەئەدەب و حەیا و حورمەت ، لە ئامێزی باوكم و سۆزی دایكمدا دەژیام و بە ئامۆژگاری و تێبینیەكانیان سەرپەرشتیان دەكردم ، گرنگیم بە وانەكانم دەدا و رێزی مامۆستاكانم دەگرت كە هەموویان ئافرەت بوون ،كەس و كارم و هاوڕێكانم خۆش دەویست .

تا ئەو رۆژە رەشە هات و باوكم سەفەری كرد بۆ مۆسكۆ بۆ بازرگانیكردن ، و كۆكردنەوەی سەروەت و سامانی زۆر .

ئای چەندە حسابم بۆ ئەو رۆژە دەكرد چەندە حسابم بۆ دەكرد چەندە خۆمم ئامادە دەكرد بۆ رۆشتن وگەرانەوەی ، كاتێكیش كاتی سەفەركردنەكە هات چوومە سەر جێگاكەم و پشتیەكەمم بە فرمێسك تەڕكردبوو ، خۆمم بە تەواوی خستە ناو دەریای خەم و خەفەتەوە ، دەمەویست بخەوم ، بەڵام نەمدەتوانی .

ئای چەندە سەختە ساتەكانی خواحافیزی ، بەتایبەت كاتێك ئەو كەسەی سەفەر دەكات نەڵێ سبەی و دوسبەی خواحافیز. یان لە هەفتەی داهاتوودا ، باوكم هیچ شتێكی نەوت .

بەڵکو لە وتوێژێکدا لە گەڵ دایکمدا بیانووی بۆ سەفەرەکەی دەهێنایەوە .

دایکیشم بە زمانێکی خەفتباریەوە وتی: بەڕاستی بەهۆی سەفەرە زۆرەکانتەوە ماندووت کردووم ، بۆ هەموو سەفەرێك دەڵێم هەفتەیەکە و تێدەپەڕێت و مانگێکەو دەگوزەرێ... خۆزگە ئەمە دواهەمین سەفەر بووایە ، بەڵام ئەم سەفەرت درێژە دەکێشێ و ساڵێکی تەواو لێمان وون دەبیت ، ئای چەندە ڕۆژگارێکی درێژو سەخت دەبن .

باوکم وتی : بەڵکو ئەو ڕۆژانە بۆمن درێژ تر و سەختترن .تۆ لێرەیت لە نێو منداڵەکاندا ، بەڵام من لەوێ تەنها و غەریبم .

دایکیشم هەوڵیدا دڵی باوکم بداتەوە و سەختی ئەو سەفەرەی بۆ ئاسان بکات و ووتی : مادام سەفەرەکە قورسە بەلاتەوە و تاقەت پڕوکێنە ئەی بۆچی سەفەردەکەیت ؟

باوکیشم بە وەڵامێك کە قەناعەتدار نەبوو وتی : ئافرەت ، پێداویستی ژیان وادەکات ، ژیان ئەوەمان لێداوا دەکات ، لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا ناگەین بەمرادمان ، کەواتە بەردەوام هەڵپەمانە و رادەکەین بەدوای پێداویستیەکانی ژیاندا هەتا دەمرین ، دایکم ووتی: من هەموو ئەو شتانەم لە ژیاندا ناوێت و دەمەوێت نزیکمان بیت ، دەمەوێت نزیکی منداڵەکانت بیت ، لەم ژیانەدا بێجگە لە تۆ هیچ شتێکم ناوێت ،تەنها تۆ نزیکی من ومنداڵەکان بیت .. ئەوەتا کچەکەت ڕۆشت بۆ ژوورەکەی ودەستی کرد بە رووخساریەوە وفرمێسك بەچاوانیدا داباری ،ئەو سەروەت و سامانە چ سودێکی هەیە بۆمان ئەگەر دوور بیت لێمانەوە.

باوکم وتی : بیرت نەچێت تۆ ژنی بازرگانێکیت ، پێویستە نرخی بەشێك لەو ژیانە خۆشەت کە تییادا دەژیت بدەیت .

دایکیشم بە دڵ سوتاوی و ناسکیەوە وتی : نابێت ژنی بازرگان نرخی زەواجەکەی بە دووری و سەرقاڵی مێردەکەی لە ماڵ ومنداڵی بدات .

دەنگی باوکم بەرز بوویەوە و بە توورەییەوە وتی : چی دەڵێیت ؟ ئایا من تەنها لەپێناوی تۆ و ماڵ و منداڵمدا تێناکۆشم .

زەنگ لێیدا . ئۆتۆمبیلەکە چاوەڕوانی باوکمی دەکرد و باوکم بە پەلە کەل و پەلەکەی هەڵگرت و بەپەلە خواحافیزی کرد : ئاگات لە منداڵەکان بێت و چاودێریان بکە ، بەتایبەتی ڕەشا کە هەرزە بووە ، ئەم منداڵانە راسپاردن و لە گەردنی تۆدان ، تۆش ئەو راسپاردەیە بپارێزە ...

دایکم وتی : چی ئەکەی بیکە ، بەڵام تکا دەکەم کەس رامەسپێرە تەدەخول لە کاروباری ماڵ و منداڵی مندا بکات ، ئەوەندە بەسە کە پارە و دەسکەوتەکانمان بۆ بنێرن .

باوکم وتی : چۆنت دەوێت با وابێت ، وا دەکەم، لە مۆسکۆوە پەیوەندیتان پێوە دەکەم .. خوا حافیز .. خوا حافیز .

باوکم ڕۆیشت و دایکم دەرگاکەی بەدوایدا داخست . باوکم ڕۆشت و لە گەڵ خۆیدا خۆشی ماڵەکەی برد و خوا حافیزی لە ماڵەکە کردو ئەو راسپاردەیەی کردە گەردنی دایکمەوە و راسپاردەی پێنج منداڵ کە من گەورەکەیان بووم.. دایکم شیاوی هەڵگرتنی ئەو راسپاردەیە نەبوو ، دەینالاند بە سکەکەیەوە و بووبوو بە بار بەسەریەوە ، خستبوویە جێگاوە و نەخۆشی خستبوو ، بە بەردەوامی نیمچە بێهۆش بوو، ئاگای

لــه دنیــا نــەبوو ، لەولاشــەوە لــە شــەو و ڕۆژێکــدا چــەند ســەعاتێك هەڵدەستایە و بە ئاگا بوو ..

باوکم شەکەتی کردبوو ،باوکم کە مانەوەی لەمۆسکۆ درێژەی کێشا ، ساڵێك و دوو ساڵ چاوەڕوانی بووین و لەگەڵ بەسەربردنی ڕۆژگارا پەیوەندی پێمانەوە کەم بوویەوە و ئیتر پەیوەندی پێوە نەدەکردین ، ئەگەر پەیوەندیمان پێوە بکردایە ڕای دەکرد لێمان .

بیستبومان کە ئافرەتێکی ڕووسی مارە کردووە و بیستبوومان سەرگەرمی ژیانی هەوا و ئارەزوات بووە ، لە بارەیەوە دەنگۆی زۆر هەبوو، ئەوەی گرنگ بوو بەلای منەوە ئەوە بوو کە باوکمان لە دەستدا .

ئا لێرەدا من بەرەو لاربوونەوە ڕۆشتم ، بیرم دەکردەوە کە تۆڵە لە باوکم بکەمەوە ، بەمنی دەوت ڕەشای هار و هاج .. بۆ ئەوەی منیش بەو شێوەیە بم ، ئەبێت ڕێگا بگرمە بەر پێی ڕازی نەبێت و با بۆ خۆشی پێی خۆش بێت .

کێ ڕێگای ئەوەم لێدەگرێت ؟ باوکم لێرە نیە ودایکیشم نەخۆشە و خزمانیشمان هەقیان نیە بەسەرمانەوە .

یەکەمین هەنگاوم ئەوەبوو پۆشاکی خۆمم تەسك کردەوە، بۆیە دەم پۆشی بۆ ئەوەی جەستەم بە سەرەنجەوە دەرکەوێت، نەك دایپۆشێت، هەموو حەزێکم ئەوە بوو خەڵك بە سەرسامیەوە تەماشام بکەن .

منیش وەڵامی سەرەنج و تێڕوانیەکانیانم دەدایەوە ،وەڵامی خەندەشم بە لەوە زیاتر دەدایەوە و وەڵامی وتەیەکەم بە ڕستەیەك دەدایەوە وکوڕان دەورەیان دابووم ... منیش پێکی ئەویندارییم بەبێ بەرامبەر دەدانێ ، لە گەڵ ئەم دەچوومە دەرەوە و لە گەڵ ئەو ئەویندارییم دەکرد .

لەسەرتادا ئەمە خۆش بوو بەلامەوە ، بەلاّم لە رێگادا توشی مەینەتی دەبووم ، هەوڵم دەدا هەندێ هاورێشم بخەمە سەر ئەو رێگایە ، هەندێ جار سەرکەوتوو دەبووم و هەندێ جار شکستم دەخوارد .

پاشان چی ؟

هیچ ...بێجگە لەمەینەتی و چارە رەشی نەبێت ، ئەو کوڕانەی سۆزی خۆمم پێدابوون منیان قبوڵ نەبوو ببمە هاوسەریان .. رایان دەکرد لە من کە گوایە من میکرۆبم و دەترسان پەلاماریان بدەم و خزمانیش منیان کردبوو بە سەرگوزشتەی سەرەڕۆیی و تیاچوون .

ئەوەی دوێنێ ئازارم ئەیا ئەمرۆ تاڵاوەکەیم چەشت ، بەرەو تیاچوون و بێهودەیی رۆشتم ... نەخێر . خۆزگە بەرەو نەمان بچوومایە بەڵکو بەبارێکی قورس لە تیاچوونەوە رۆشتم .

فەوتان .. غەریبی .. ئاه چەندە تاریکە رێگای سەرگەردانان... ئاه لەتاڵی ئەو پێکەی بێئاگایان بینی پێوە دەنێن... ئای لە زوڵمی باوکم ... تاریکی دایپۆشیوم وخنکاندوومی .. تاڵی ناخۆشی جەرگی سوتاندووم .

بەلاّم قسەکانی روناکیەك بوو تاریکستانی دەروونمی تێپەڕاندبوو ، وەك دڵۆپە ئاو وابوو هەستی بەسەختی تینوێتی من کردبوو ، رۆژێکی لە دایك بوونی نوێ بوو بۆ ژیانی من .

ئەو رۆژە بۆ شەوەکەی رۆژی لەدایك بوونم ، دانیشتبووم لەبەردەم تەلەفۆنەکەدا ، کاتم بەسەر دەبرد بە قسەکردن لەگەڵ لاواندا دوای ئەوەی براکانم خەوتن و دایکیشم ئاگای لەخۆی نەما بوو ، دوای ئەوە هێمنکەرەوەم خوارد .

ئەو شەوە دڵخۆش بووم و بەدەنگی بەرز قسەم دەکرد و پێدەکەنیم و گۆرانیم دەوت و لە قسەکردنەکەمدا شتێك نەبوو بە بێ دەنگ بوترێت ئەگەر پێبکەنیمایە پێی دەوتم پێکەنینەکەت ئەڵێی تەپڵ لێدانە و ئەگەر گۆرانیم بووتایە پێی دەوتم گۆرانیەکەت دەڵێی ئاشە ئەگەر قسەم بکردایە دەیوت حەزم لە قسەی هەنگویناویە ، لەبارەی هەموو شتێکی منەوە قسەی دەکرد گاڵتەی پێدەکردم منیش قسەکانیم قبوڵ دەکرد وام دەزانی سوعبەت دەکا بەو شێوەیە وەڵامی یەکترمان دەدایەوە تا دووکەڵ لە ژووری دایکمەوە سەرنجی راکێشام کە دەهاتە دەرەوە و هاوارم کرد و داوای فریاکەتنم کرد: دایکم خەریکە دەسوتێت دایکم دەسوتێت .

پێی وتم لەوانەیە بە گاڵتەی بووبێت : بۆ دۆزەخ خێر لەتۆ و دایکیشتا نیە .

سەماعەی تەلەفۆنەکەم فرێدا و بەپەلە رامکرد بۆ ژوورەکەی دایکم بینیم خەوتووە و پاشماوەی جگەرەکەی لە نێوان پەنجەکانیدا دەسوتا ئاگریش بەربووەتە چمکێکی نوێنەکەی ، پەنجەرەکان و دەرگاکانم کردەوە و هاورم کرد ، خەڵکینە فریامان کەون ، دایکم سووتا.. ئەوەندە هاوارم کرد تف لە دەمدا وشك بوویەوە.. تەنها گوێم لە سەدای دەنگی خۆمەوە بوو لە و شەوە تاریکەدا دەنگی دەدایەوە .

برا بچکۆلانەکانم رایان کرد بۆ لام بەترس و تۆقینەوە راپەری بوون لە جێگاکانیاندا و دەم و چاویان زەرد هەڵگەرابوو ، زەلیلی باڵی کێشا بوو بەسەریاندا... بە تۆقینەوە تەماشای دایکیان دەکرد پاشان بەپێ و پلە بچوکەکانیان رایان کرد بۆ مەنجەڵ و سەتڵی ئاویان هەڵدەگرت و دەیانکرد بە نوێنەکەی دایکمدا .

لەو کاتەدا دایکم چاوی کردووە و تەماشای روخساری خوشك و براکانمی کرد ، خەندە گرتی و هەستێکم تیا دروست بوو کە لە زووەوە ئەو هەستەم تیا نەمابوو... هەست کردن بە پێویست بوونی دایکێك بمپارێزێت.... بەرگری ئەو قسەو قسەلۆکانەی لەبارەمەوە دەکرا بکات ، لە گەڵ ئەو دەنگۆیانە... پێویستی بوون بە دایکێك رێنمایم بکات ، کەوتم بەسەر دەستیدا و باوەشم پێدا کرد و بەگوێیدا چرپاندم : دایکە گیان خۆشم دەوێیت دایکە گیان ئەی پەنهانی ژیانم پێویستم بە تۆیە .

لەوشەوەدا شەوی لەدایك بوونی نوێم دایکم نەخەوت تا بەیانی لە گەڵیدا مامەوە و قسەمان دەکرد پێکەوە .. شتانێکی زۆرم بۆ گێڕایەوە .. زۆربەیان بیستبووی لێمەوە ،قسەکان شنەبایەکی تەڕ بوون لە ماڵێکەوە خەریك بوو دەسوتا .. دوای ئەو شەوە تاریکستان و گەردەلولاویە رۆژ بوویەوە و برینەکانم کۆکردەوە و هاتم بۆ قوتابخانە ، سروودم دەچڕی و سروودێکم بە وتەی جوان دەچری تا نارەحەتی دەروونم سارێژ بکات و هەندێ لە برینەکانم تیمار بکات .

سەرەتای ئەو رۆژە بە وانەکەی تۆ دەستی پێکرد لەو وانەیەدا پێشوازیم لە یەکەمین تیشکی رووناکی کرد ، ئەوەت یاد دەهێنمەوە ، گومان نابەم بیرت چووبێتەوە، بەڵام ئەوەی کە روویدا دەیهێنمەوە یاد و باسی دەکەم تا بەو یادگاریە ئازار بچێژم .

هاتیتە پۆلەکەوە و سڵاوت لێکردین بۆ یەکەمین جار باشتر لە سڵاوەکە وەڵامم دایەوە، پاشان بێدەنگیەکی قوڵ باڵی کێشا بەسەر پۆلەکەدا و یەکێ لە هاورێکانم لێی پرسیت مامۆستا بابەتی ئەمڕۆمان چیە ؟

پێت وت :مادام تۆ پەلەتە بۆ بابەتەکە و تۆ پێشنیار بکە و دەست پێبکە ، قوتابیەکە پێشنیاری ناونیشانی بابەتەکەی کرد کە بریتی بوو لە ( باسکردن لە دیاردەیەکی خراپ کە لەناو کۆمەڵگەدا بڵاوبوویێتەوە )

هەستم کرد ناونیشانەکەت پێ باشە ، بۆیە چەندین پرسیارت ئاراستە کردین ، وەڵامەکانیش هەمە چەشن بوون ، هەندێکیان وەڵامی رووکارانە بوون و هەندێکیشیان زادەی ئیرادەو مەینەتیەکان بوون .

دەنگی تۆ هاتە بەرگوێم و بانگی دەکرد : بە بێ سوکایەتی و بەبێ سەرزەنشت (رەشا) بەخێرایی وەستام و سەرە شۆڕەکەمم بەرز کردەوە بۆ لای تۆ .

بە خێرایی وەڵامم دایتەوە : مامۆستا من سەرتاپا دیاردەیەکی ناتەندروستم.... لە کاتێکدا خەندە بە رووخسارتەوە بوو لێت پرسیم: رەشا چی ئازاری دەروونت دەدا ؟

پێم وتیت رقم لە خۆمە ، رقم لە خەمۆکی خۆمە ، رقم لە هەرەس هێنانم و گۆشەگیری خۆمە ، رقم لەفەوتانی خۆمە ، رقم لە سەفەرکردنی باوکمە ، رقم لە خەنە درۆزنەکانمە .

لەوکاتەدا لە چاوانتدا دوو هەورم بینی خەریك بوو فرمێسك ببارێنێت.. کاتێ کەوتت : ئەوە چیە (رەشا) مرۆڤی ئیماندار شتی وا ناڵێت .

پێم خۆش بوو کەسێك ببینم خەریکە لە پێناوی مندا دەگری ، قسەکانت وەك ئاوێك وا بوون بکرێت بە ئاگرێکی بڵێسەداردا و خامۆشی بکات ، بە تاس و شەوقەوە گوێم لە قسەکانت دەگرت ، (رەشا) ئافرەتی ئیماندار تیا ناچێت و نافەوتێت ، چونکە خوای گەورە

و میهرەبان ڕێگای ئاسایش و سەرکەوتنی بۆ دیاریکردووە ، بۆیە بە متمانەوە دەچێت پیایدا

چونکە دەزانێت کۆتایی ڕێگاکە چیە ، خوای گەورە ئێمەی دروست کردووە و هەر ئەویش دەزانێت چی باشە بۆ ئێمە ، با بە بانگەوازەکانی نەزانین... و جەهالەت هەڵت نەخڵەتێنن و ئیماندار نانەویٚ وهەست بە غەریبی ناکات و ناترسێت .

لێرەدا یەکێ لە کچانی ناوپۆلەکە پیٚ وتیت : چۆن ئیماندار هەست بە نامۆیی و ترس و گۆشەگیری ناکات لە کاتێکدا لە گەڵ کەسانێك دەژی کە دەوروبەری خۆیانیان فەساد و خراپ کردووە .

تۆ بەهەمان ئارامی و لەسەر خۆیی لات کردەوە : ئیماندار یەکەم جار دەست دەکات بە ئیصلاح کردنی خۆی و ئەو کاتەش دەبێتە پێشەنگ بۆ کەسانی تر بەگوفتار و بە رەفتار ، ئەگەر تێکەڵی خەڵکی بوو ،میهرەبان دەبێت لە گەڵیاندا وگرنگی بەکار و باریان دەدات و لێبوردە دەبێت لە گەڵیاندا بە باشترین شێوە هەڵسوکەوت دەکات .

لەگەڵ دوژمنەکانیدا دەتوانێت هەڵبکات و گریمان لەناو ترس و نامۆیدا دەژی ئەو ناترسێت و خۆی بەنامۆ نازانێت چونکە بە چاودێری خوای گەورە دەژی .

ئیماندار خەمۆك و بیٚ ئومێد نابێت، ئومێدی ئەم پەیوەستە بە خوای گەورەوە دەی لە دەرگای خوا بدە، بەردەوام لە دەرگا بدە ، دەرگای خوای گەورە لە رووی ئەو کەسانەدا داناخرێت کە مەبەستیان خوایە ... ئیماندار پەشیمان نیە لەوەی لەدەست چووە ومناهێڵێت ئازارەکانی رابردوو هەرەشە لە ئایندەی بکات ، دەچێتە ریزی رزگاربووانەوە ...ئایا وانیە رەشا ؟

قسه هێمن و راستگۆکانی ئارامی و ڕەزامەندی بلاْوکردەوە بەسەر هەمووماندا... بۆنی خۆش و هاوڕێیەتی لەناوماندا بلاْودەکردەوە ، تیشکی روناکی دەناردە تاریکستانی دەروونمەوە و بە ئومید تینوێتی رۆحمی شکاند  و ئومێد و ژیانی بۆ تەمەنی فەوتاوم دەگەڕاندەوە .

من ئێستا لە قۆناغی کۆتایی ئامادەییم وە خۆم ئامادە کردووە بۆ تاقیکردنەوەی بەکالۆری ، بەدەنگێکی نوێ و ئومێدیکی نوێ و لێبڕانێکی نوێ ، بەڵکو بەلەدایك بوونێکی نوێ ، دەستم درێژکردووە بۆت تا تۆش دەست درێژکەی بۆم و یارمەتیم بدە ، مامۆستا بەڕێزەکەم یارمەتیم بدە هەتا زیندووبم چاکەی تۆم لە یاد ناچێت .

سەرچاوە ( ایها المعاكس قف / القسم العلمی بدار الوطن )

# کارەسات

گواستنەوەمان لە گەڵ سەرەتای مۆڵەت بۆ خانوویەکی نوێ شتێکی ئاسایی نەبوو ، بەڵکو ڕووداوێکی کاریگەر بوو لە خێزانێکدا کە پێك هاتبوو لە باوك و دایك و سێ کچ .

شوێنەکە فروان بوو ... باوکم و دایکم لە بەشێکی تەواودا دەژیان و منیش لە ژوورێکی سەربەخۆ لە دوو خوشکەکەم جیا بوومەوە

دایکم بە باوکمی وت : کە دڵخۆش و ئاسوودە بوو : هەموو ناسراوانمان بانگهێشت دەکەین .. ئێستا هەموو بیانووەکانی پێشووت نەما ، ژووری میوان گەورەیە و ئەوەش شوێنی دانیشتنی ئافرەتانە و ئەوەتا بەجوانترین شێوە ڕازێنراوەتەوە .

تۆ و هاورێکانت لەو باخچە بەرفراوانەدا خۆشترین شەو بەسەردەبەن ، باوکیشم بە ڕازی بوون و ئاماژەی پێشوازیکردن وەڵامی دایەوە وەك ئەوەی میوانەکان هاتبن .. پاشان وەك ئەوەی شتێکی بیرهاتبێتەوە وتی: ئێستا لەگەڵ سەرەتای خانەنشیکردنم لە کار ....ماڵەکەمان پر دەکەین لە خۆشی و شادی و هاوڕێیەتی .

خێزانی بەڕێزم ئێرە دەبێت بە جێ ژووانی ئازیزان و هاوڕێیان... پاشان لای کردەوە بە لای هەمووان‌دا و بە خەندەوە وتی : ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بحەوێینەوەو دوای گەشتێکی درێژی کارکردن... چل ساڵ لە بواری کارەکەمدا خزمەتم کرد .

کاتێ باسی هەوڵدانی خۆی دەکرد و بەرهەمی چاندنەکەی دەچنیەوە وتی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەو هەموو ڕۆزیە زۆرەی پێبەخشیووم ، ئەوەتا برا گەورەکەتان مامۆستایە لەزانکۆ و

بـچوکەکەشیان خـەریکی خوێنـدنی باڵایـە لـە دەرەوەی وڵات ، کـچان ئێـوەش سـوپاس بۆخـوا خەریکـە خوێنـدن تـەواو دەکـەن ( هـەمووتان سۆمای چاوی منن ) و زیرەکی و رەوشتتان لە خۆتانا کۆکردوەتـەوە .. گەڕایەوە بۆ یادگاریەکان کە سوور بوو لەسەر یاد هێنانەوەیان .

چـوو بـۆ سـەر کورسـیەکە و لـە ناوەڕاسـتی باخـچەکەدا قاچـەکانی راکێشا و وتی: بەسەرهاتەکە دوورو درێژە .. بەراستی بە سەرهاتی چل ساڵە ، کـاتێ باسـی تەمـەنی خـۆی دەکـرد زۆری پـێ خـۆش بـوو کـاتێ تەمـەنی خـۆی دەژمـارد ... سـاڵ .. سـاڵ !! چـۆن بەسـەری بـردووە و هاوڕێکانی سەرکاری کێ بوون .. پاشـان بە چاوێکی پێکەنینـەوە لای دەکـردەوە بـە لای دایکمـدا و دەسـتی دەکـرد بـە باسـی بەسـەرهاتی هاوسـەرگیریان و لـە سـەرەتای دەزگیرانداریانـەوە .. ئێمـەش گوێمـان دەگرت و پێدەکەنین ، دایکیشم قسەیەك یان پرسیارێکی دەکرد .

بەختەوەریەك کە سنووری نیە باڵی کێشا بوو بە سـەر مـاڵی ئێمـەدا .. خۆشەویـستی بـاوکم بـۆ قـسەکانمان و سـۆزی بەرامبـەرمان و دابینکردنی پێداویستیەکانمان زیاتر جوانی کردبوو .

مانگەکانی هاوینمان لەو خانوە نوێیە بەسەربرد ، وەك ئـەوەی لـە جیهـانێکی تـردا بـین ، رۆژەکـانی بـە خۆشـی و شـادی تێدەپـەڕین ، بـە تایبـەتی ئـەو سـاتە درێژانـەی پێکـەوە دادەنیـشتین و باسـی هـەموو شتێکمان دەکرد .

لـە گـەڵ سـەرەتای سـاڵی نـوێ ی خوێنـدن هەسـتمان کـرد کـە پێویستمان بە کارەکەرێك هەیە ، چونکە ماڵەکە گەورە بوو ، دایکیشم پێویـستی بـە کەسـێك هـەبوو کـە هاوکـاری بکـات لـە کـارو بـارە زۆرو

دووباره بووەکانی ماڵدا ، بۆیە باوکم دوای دوو دڵی و ترس، رازی بو داواکاری هەمووومان قبولّ بکات و کارەکەرێك پەیدا بکات .

مەرجی ئەوە بوو مێردەکەشی بێنێت لە گەڵ خۆیدا و وتی : گرنگ نیە خەرجیان زیاتر دەبێت ، ئێوە لە هەموو سەروەت و سامانی دنیا گرنگترن لە لام ، بەڵکو ئێوە گوڵ و جوانی ئەم دنیایەن .

خانوەکە پاشکۆیەکی بچوکی هەبوو کەوتبووە گۆشەی پێشەوەی باخەکەوە ، ئێمەش کەمێك دەستمان پێدا هێنا و ئیتر گونجاو بوو بۆ پێشوازی لە کارەکەر و شۆفێرێك ...، باوکم هەمووانی ئاگادار کردەوە کە نابێت لە گەڵ شۆفێرەکەدا بچینە دەرەوە، مەگەر بۆکاری زۆر پێویست و لە گەڵ دایکماندا تا مەحرەم بێن پێی ، بۆیە چەند جارێك دووپاتی کردەوە تا هەمووان گوێیان لێبێت، پەنجەکانی جولاندنەوە وەك ئەوەی هەڕەشە بکات لەو کەسەی سەرپێچی بکات ، ئێمەش سەری رەزامەندی و قبوڵکردنمان راوەشاند .

ساڵی نوێی خوێندن دەستی پێکرد ،خوشکە گەورەکەم لە قۆناغی چواری کۆلێژدا دەی خوێند ، خوشکە ناوەنجیەکەشم لە قۆناغی سێی زانکۆ و منیش چوومە قۆناغی یەکەمی زانکۆ .

هەمیشە لە خەوندا بووم .. هەستم  بە خۆشی و ئومێد دەکرد هیچ خۆشیەك نەبوو بگاتە خۆشی ماڵمان و ژوورەکەم... تەنها فراوانی بیناکانی زانکۆ و گەورەیی هۆڵی وانەکان و جوانی و رێکی باغ وباخاتەکان نەبێت .

دڵم خۆش بوو بە کەشی نوێی زانکۆ و ، هەرچەندە سێ ئاستەنگ لە سەرەتای قۆناغی یەکەمی زانکۆوە بەرەو رووم بووبوویەوە .

یەکەم :سیستەمی سەعاتەکان و ڕێکخستنی موحازەرەو زانینی شوێنەکان .

دووەم : راهاتن لە سەر کەش و هەوای زانکۆ .

سێیەم : جیابوونەوە لە هاوڕێیانی منداڵی و هاوڕێیانی قۆناغی ئامادەیی، کە جوانترین ڕۆژەکانی ژیانم و خۆشترین و بەختەوەرترین ڕۆژەکان بوون .

لەوبەشەی کە هەڵم بژارد بوو دەستم کرد بە خوێندن و کە خوشکە گەورەکەم هانی دام بۆ ئەو بەشە ، بەڵام لە گەڵ تێپەڕبوونی هەفتەیەك هەستم دەکرد حەزم لەو بەشە نیە ... بەڵکو رقیشم لێی دەبوویەوە بۆیە بڕیارمدا بچمە بەشێکی ترەوە ... ئەو بڕیارەش خاڵی گۆران بوو لە ژیانمدا .

لە گەڵ ئەو گۆڕانەدا ئەوانەشم لە دەستدا کە لە بەشی یەکەمدا ناسیبوومن ... بۆیە نارەحەت بوو مانەوەی من بەتەنها لە نێوان موحازەرەکاندا ... بۆیە رامدەکرد هەتا وەکو قسە بکەم لە گەڵ هاورێکانم لە بەشەکەی پێشووتردا ،بەڵام نامۆییم لەو بەشە نوێیەدا درێژەی نەکێشا و تەنها چەند ڕۆژێکی کەمی خایاند .. هەتا وای لێهات دەنگی پێکەنینمان بەرز دەبوویەوە و زیاتر یەکتریمان دەناسی ، کاتێ وردە وردە هاوڕێکانی پێشووم لە یاد چوو، بەڵکو هاوڕێکانم لە قۆناغی ئامادەیی تا ڕۆژگار دووری خستینەوە لە بیرچوونەوە زاڵ بوو بەسەرماندا ..

کەشی گشتی لە گەڵ کچەکاندا خۆش بوو بەبێ سانسۆر بۆ یەکەم جار گوێم لە نوکتە و تەنزەوە بوو .. بەخێرایەکی سەیر هۆگری یەکتری بووین و وامان لێهاتبوو بووبووبینە هاوڕێی یەکتری و بەڵکو خەم و

خەفەتی خۆشمان بۆ یەکتری باس دەکرد ، بەڵام قسەکردنی تەلەفۆن و دەرخستنی نهێنیەکانی دەروون دیدەنی ئەو هاوڕێیەتیە بوون ، بەڵکو تام وچێژی ئەو هاوڕێیەتیە بوو ... لە پڕ .. شتێ روویدا کە بەخەیاڵدا نەدەهات .

لەناو ئەو کەشە جوان و خەونە سپیەدا پێم هەڵکەوت... سۆزەکانم هەویانکرد ... سەر ئێشەیەك توشی بیر و هۆشم بوو لەوکاتەوەی بۆ یەکەم جار ئەو لاوەم بینی .

لاوێك سیفاتی ئەدەب و حەیای هەڵگرتبوو ، ئەو تا ماوەی مانگێکە بە نارەحەتی و شەرمەوە چاو هەڵدێنێت بەمندا کاتێ لە زانکۆ چوومە دەرەوە دڵم تەپە تەپی دەکرد و چاویشم حەزی بەبینینی دەکرد .. ئەو شۆڕە سواری من بوو !!

لە ئارامی شەویشدا لە گەڵ خەونەکانم گەشتی دەکرد.. رائەمام و هەستم بە هەڵوێستەکان دەکرد و دەنگێك لە ناخمەوە هەر دەیووەتەوە : نەکەی ... دەست پێشحەری نەکەیت !کچی خۆم ئاگادار بە .. ئاگات لە خۆت بێت نەکەی بەو رێگایەدا بچیت !!

بەڵام بە ئاکارە جوانەکەی و هەڵسوکەوتی جوانی کەمەندکێش و گرفتاری کردبووم ! هێشتا یادی ئەو کاتە دەکەمەوە کە بۆ یەکەم جار بینیم ئۆتۆمبیلەکەی لە تەنیشت ئۆمبیلەکەمانەوە بوو ، بەڵام بە هۆی لوتف و ئاکارە جوانەکەیەوە چووە ئەو لاوە و رێگاکەی بۆ فراوان کردین .. بە چاو تەماشای منی دەکرد و وەك هەندێ لاوی تر هیچ قسەیەکی نەکرد ، ئای چەندە ئاکار و کردەوەیەکی جوانی نواند .

لە کۆتایی موحازەرەی کۆتاییدا بە پەلە دەچوومە دەرەوە ، و بەرەو گۆڕپانەکە دەچووم ، بە دڵە شڵەژاوەکەمەوە تاوەکو تەماشای بکەم ..

وا بزانم دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ تێپەڕیووە من ئەوم نەبینیوە .. بۆیە هەست و سۆزم گۆڕا و کەوتمە خەیاڵەوە ...

بەڵام وشەیەکی بۆندار کە بەر گوێم کەوت و ئەو ئاراستەی کردم هەموو ئەو شتانەی لە بیر بردمەوە کاتێ لە پاڵ ئۆتۆمبیلەکەیدا بوو ڕێگاکەی لە بەردەممدا فراوان کرد و وتی: فەرموو

سەدای دەنگی لە گوێمدا دەزرنگایەوە تا تێکەڵی دڵ و خوێنم بوو ( فەرموو ) .. بەو دەنگە سۆزاویەوە دەرگای خۆشەویستی و بەختەوەری بۆ کردمەوە . ئێستاش بە هۆی جوانی ڕەوشت و و ئاکاریەوە لە دڵ وهۆشمدا نزیکە .

فیڵم لەخۆم دەکرد ... تەماشاکردنی چ کاریگەریەکی هەیە ، یەك وشە چی دەگەێنێت ؟! ئایا من تا ئەو رادەیە لاوازم کوا متمانە بەخۆ ؟ پاشان بە گەورەیی و خۆبەلزانی کە شەیتان لە ڕۆحی فوی پیادا کردم .. وتم: ئایا من پوشێکی بەردەم ڕەشەبام تا یاریم پێبکات ؟! ئایا من بێ عەقلم ببمە نێچیرێکی ئامادە ؟. شەیتانیش لە جیاتی من وەڵامی دەدایەوە : من کچێکی پێگەیشتووم .. من کچێکی فێرخوازم .. چاکەی خۆم دەزانم و جیای دەکەمەوە و هیچ ترسێکم لەسەر نیە .

ڕۆژەکان بە خێرایی گوزەران هەتا بە چاوی خۆم بینیم کاتێ کە دەمبینی بزە دەیگرێ ... منیش بە خێرایی بە چاو رام دەکرد لێی ، بەڵام دڵم زیاتر عاشقی بوو بوو، حەزی دەکرد لە گەڵیدا بێت.. ئای خەندەکەی چەند جوان بوو ؟!

لەگەڵ هاتنی وەرزی زستاندا و لە ڕۆژێکی تەم و مژاویدا باران بەسەر هاتوچۆکەراندا داباری و ئەمیان بە خێرایی دەڕوا و ئەویان بە چەترەکەی خۆی دەپارێزێت لە بارانەکە ... وە لەو ڕۆژەدا کە بە

درێـژایی ژیـانم لـه بـیرم ناچـێتەوە .. وە بـە چـپەیەکی سـۆزدارانەوە و وشەیەکی گـەرم ... کـاتێ نزیك بوویـەوە لـە جـامی ئۆتۆمبیلەکە پاشـان پارچە کاغەزێکی دانـا و مـەودا درێـژەکانی نێوانمـانی بـڕی تـا گـەیشتە دەستی من !!

بە پەلە شاردمەوە .. بەڵکو بە پەلە هەوڵمدا بزانم چی تێدایە .. ئەو پارچە کاغەزەم هەڵگرت تا بلکێت بە هەست و سۆزمەوە !!

کـاتێ راکـشام لـە سـەر جێگاکـەم لـە ژوورەکەمـدا .. کاغەزەکـەم هـەڵگرت و ئـەوەی تێیـدا نوسـرابوو جارێـك و دووجـار و سـێ جـار خوێندمەوە .

زۆر بە پەشیمانیەوە دەگریام .. چۆن شتی وا بکەم ؟

ئایا خوای گەورە بەوە رازیە ؟ سبەینێ چـۆن لێپرسینەوەم لـە گەڵدا بکرێت لە سەر ورد ودرشت .... چۆن کاتێ دایـان هێڵامـە نـاو گـۆڕەوە ، چـۆن خـۆم بخەمـە نـاو سـەرگەردانیەوە .. ئـەی بـاوکم و ئـەی دایکـم و خێزانەکەم و ئایندەم .. ئەو کاتە دنیا دەزرنگایەوە لە گوێمدا ..

ئەسرینی ئیمان بە چاومدا ئەهاتە خوارەوە ، تـا تینـوێتیم بشکێنێت و پێویستی بوونم بە تەوبە و گەرانەوە بۆ لای خودا تێراوی بکات ...

قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد کاتێ دواهەمین فرمێسکم سری ، تـا ئـەم سنوورە بەسـە ... تۆبە بکـە پـێش ئـەوەی پەشـیمان بیتـەوە ، لـە گـەڵ تێپـەڕبوونی رۆژگـار و نـەبوونی چاودێری و لاوازی ئیمـان... گـەردەلول منـی بـەملا و بـەولادا دەبـرد ... هـەموو ئەوانـە سـاتەکانی شـادی و سەقامگیریان برد و کەوتمە ململانێیەکی دەروونی کوشندە و رارایـی لـە قسەکردندا .

بەو شێوەیە رۆژگارێکم بەسەر برد کە سەقام گیر نەبووم .. و خەوم لێنە دەکەوت ، بەڵکو بووبوومە هاوڕێی ئەسرین و بێزاری و ئێش وئازار و ناڵە لێم جیا نەئەبوویەوە .

دوای هەفتەیەك لە سۆزی خرۆشاوی و ساتە بەردەوامەکانی پەشیمانی... شەوێکیان بە تەواوی خەوم لێ زرابوو ، بە هۆی ئەو بەتاڵیە کوشندەوە بەتەواوی ئارامم لێ بڕبوو .... هەنگاوی یەکەمم لەو شەوەدا بوو ...

بێهیوایانە پەنجەم برد بۆ ژمارەی تەلەفۆنەکەی ... تا گەیشتمە ژمارەی کۆتایی ...لەو کات و ساتەدا وەستام و مایکی تەلە فۆنەکەم خستەوە شوێنی خۆی ، ... هەوڵی یەکەمم تێپەڕ بوو ، پاش ئەو دووەم و سێیەم ژمارەی کۆتایم تەواو نەکرد ، پاشان ئەو شەوە هەوڵێکی زۆرم دا گوێم لە دەنگیەوە بێت ... بۆ ئەوە قەناعەتم بە خۆم کردبوو ، .. تەنها گوێم لەدەنگیەوە بێت ... ئایا خۆی وەڵامم دەداتەوە یان نا .. ئایا حەزی لە شەو نخونیە یان نا ، ؟ عوزرێکی قەناعەت پێکەر بوو بۆ من ... کاتێ بەردەوام خەریکی ژمارەی تەلەفۆنەکەی بووم، بە خێرایی و بەهێزەوە هەتا گوێم لەدەنگیەوە بوو ... خۆشیی ساتی یەکەم جار گەڕایەوە بۆ دڵم، کاتێ گوێم لە دەنگیەوە بوو وتی فەرموو :

رۆژ لە دوای رۆژ تێدەپەڕی و منیش موشتاقی دەنگی دەبووم ... بە بێ هۆ و دوو دڵی پەیوەندیم پێوەکرد ، هەتا وای لێهات دەبووایە هەموو رۆژێ گوێم لە دەنگیەوە بووایە .... هەر کاتێ گوێم لە سەدای دەنگە سۆزدارەکەیەوە دەبوو ئیتر ئەو رۆژە زۆر بەختەوەر دەبووم .

وردە وردە لورەی گورگ رۆشتە دڵمەوە ..... ئەو دەنگە ناقۆڵایە بووبوو بە دەنگێکی ئاوازاوی و گوێم و هەست و نەستمی دەهێنایە لە

رزین .. بەڵێ ... دەنگی ئەو کورگە خۆش و ئاوازاوی بوو ، سۆز و سیحری دەباراند بە سەرمدا ...نەم دەزانی دەنگی گورگەکان ئاوایە هەتا بە گوێ ی خۆم نەمبیست و دڵمی نەهەژاند .. ئیتر لەو کاتەدا ترس و خۆفی خوا لە دڵمدا نەما کاتێ قسەم لە گەڵ پیاواندا دەکرد

شتێکی ئاسایی بوو بەلامەوە سەرابێك بوو لە ترسی رابردوو و توندوتیژی پەروەردە ، قسەم لە گەڵ خۆم دەکرد ، کۆتەکان ببەزێنە .. خۆت ئازادکە لە ئەندێشەکان ...ئەو شۆڕەسوار و نەشئەی ژیانی تۆیە...لەزەت ببینە لە لاوێتی و لە جوانی.. پێداویستی سۆزداری و دەروونی خۆت تێرکە .. سالأنی تەمەنت تێپەرێن و وەکو کچانی تر گوێت لە دەنگی خۆشەویستیەوە نەبوو ... شەیتان قیراندی بە گوێمدا : هەموو کچێ هاوڕێی کوڕی هەیە .. بۆچی لەو تاقیکردنەوەیە دەترسیت ... ئایا تۆ تا ئەو رادەیە لاوازیت ؟ چی دوات دەخات ؟ کوا ئەو بەربەستەی رێگات لێدەگرێت ؟ تێکی بشکێنە .. و لەناوی بەرە ، چۆنت دەوێ ئاوا هەنگاو بنێ ... بەسە ئیتر ئازاری دەروونت مەیە .

سرووشتی ژیانم گۆرا ... رۆژم بوو بە شەو و شەوم بوو بە رۆژ ... زەنگی تەلەفونەکە لە دڵمدا دەلەریەوە .. بەڵکو چەندین جار سەماعەی تەلەفۆنەکەم هەڵدەگرت و وام گومان دەبرد کە گوێم لە زەنگەکەوە بووە ... سووربووم لە سەر ئەوەی لە ماڵەوە بمێنمەوە و نەچمە دەرەوە بۆ سەردان و شاییەکان لە ترسی ئەوەی تەلەفۆنم بۆبکات و و منیش گوێم لە دەنگیەوە نەبێت، بەڵێ زۆر خراپ بووم لە گەڵ دەروونی خۆمدا ... هەتتا وازم لە کۆمەڵێ ئاهەنگ هێنا کە خوازیارم بم بچوومایە ، بەڵکو لەزەتم لە باخچە بچکۆلەکەمان نەدەبینی کە پێشتر گرنگیم پێدەدا و چاودێری گەورەبوونی درەختەکان وگەشانەوەی گوڵەکانیم دەکرد ...

خەندەی جوانی باوکم و شادی دایکی ئازیزم بوو بوون بە شمشێر و جێگامیان لەت دەکرد .. دەنگێک بوون سەرەکۆنەیان دەکردم .

بەڵکو گرنگتر لە هەموو ئەوانە نوێژەکانم بوو کە ئەنجامم دەدان بەبێ ئامادەبوون و ملکەچی دڵ .. وە هەندێ جار کاتی قسەکردنەکە دەکەوتە نوێژی مەغریبەوە و منیش هەڵنەدەستام بۆ نوێژ تا دوای بانگی عیشا نەبوایە .. وەك ئەوەی هیچیش نەبووبێت و ئەرزشتێکی نەبێت .

پێکەنینە جوانەکان ونوکتە خۆشەکانم لە گەڵ کەسوکارمدا و بە تایبەتی خوشکە ناوەنجیەکەم گۆڕابوو بۆ سەرەڕۆیی و هەمیشە بیرکردنەوەی بەردەوام ... پرسیارێك دڵمی هەژاند بوو : ئایا پەیوەندی کرد ؟ وە چی وت ؟ ئەی چی پێ بڵێم ؟ تۆ بڵێیت زویر بووبێت لێم ؟ چۆن دڵخۆشتر دەبێت ؟ بەچی نزیك دەبمەوە لێی .

خەمێکی پەیوستدار و بیرکردنەوەیەکی بەردەوام، و دڵەراوکێ و نائارامی .... تا وای لێهات تەنها ئەو لە دڵم و بیر هۆش و هەست و نەستمدا بوو ... لە دارێنەی دنیا تەنها ئەوم دەبینی !!

رۆژگار تێپەڕی و بارم قورستر بوو و سەدای دەنگیشی زیاتر دەچووە دڵمەوە ...لە گەڵیدا چووین بە رێگایەکی تاریك و خوارو خێچدا ، .. قسەکردن و تەلەفۆنکردن .. بینین و تەماشاکردن ، هەتا بە خێراییەکی سەیر کەوتمە ناو داوی فاحیشە ( زینا ) وە .. هەرگیز گومانم نەدەبرد کە ئاوام لێبەسەر بێت . رۆژێکیان هاتمەوە بە خۆمدا و کردەوەی خراپم هێنایەوە یادی خۆم و هەوڵمدا دوورکەمەوە لێی ، بڕیارمدا پەیوەندیم کۆتایی پێ بێنم لە گەڵی .. لە تاریکستانی سەرپێچیکردن راکەم بۆ رووناکی و گوێڕایەڵی .... و لە بەختەوەری

درۆینـه بـۆ ژیـانێکی دڵئـارامی و سـێبەرێکی هەمیـشەیی ... هەوڵمـدا کۆتایی بە هەموو شتێ بێنم .

پۆزشـم هێنایـەوە کـە سـەرقاڵی خوێنـدن و کاروبـاری ماڵـەوەم ، و خوشکەکەم لێمـەوە نزیکە و دەترسم گوێم لێبگرێـت لـە گـەڵ ئـەودا ... هەوڵمدا و تێکۆشانی زۆرم کرد بۆ ئەوە .

بە خۆمم وت : هەست و سۆزی من گرنگ نیە لـە پێنـاوی ئـەوەدا کـە دوورکەومـەوە لـە هەڵخلیـسکان ... کـاتێ وتووێـژمان زۆری بۆهـات و تـەواو بێتاقـەت بـووم و تـووڕە بـوم .. ئـەو لـە بۆسـەدا بـوو بـۆمن، بـە دەنگێکی خەمناکەوە یادگاریەکانی لە گەڵمدا دەگێڕایەوە .

وشـــەی ســـۆزداری و ئەویندار یـــەکانی دەوتـــەوە ، خـــەریك بـــوو فرمێسەکەکانی دەبارینە سەر رووەمەتی .. دیار بوو پیایدا کە سوورە لـە سەری وتـی : بەجێم مەهێڵـە ... چـۆن بـەبێ تـۆ هەڵکـەم ؟ دڵ رەق مەبە .... زاڵم مەبە ... ئازاری دووری و نەمانی ئارامی و شەوقی خۆی بۆ من دەرخست ، بەڵام من دانم بە خۆمدا گرت و وتم : ئەم پەیوەندیەم ناوێـت و یەك رۆژی تر درێژە ناکێشێت ...

کاتێ بینی سوورم لـە سـەر ئـەوە لەهجـە و ئـاوازی گـۆڕا و فرمێـسك نەما و کەڵبەکانی دەرکەوت و وتـی : چی دەکەیت بەو رابردووە جوانەت کە لەگەڵ مندا هەتبوو .. وە چی دەکەیت لـەو وێنانـە و لـەو شـریتانە .. بۆ کوێ رادەکەیت ... و بۆ لای کێ دەچیت ؟ تـۆ ناپاکیت دیـارە ئاشـنا بوویت بە کوڕێکی تر ؟

سـەر سـام بـووم لـە کـاریخۆم و سـاتەکانی لاوازی زاڵ بـوون بـە سەرمدا ... و فرمێسك بە چاوانمدا هاتە خوارەوە .. بۆیە گەڕامەوە سەر

رێگای جارانم بە زۆر و بە بێ حەز پێکردن و دوای ئەوە رەزامەندی و گوێڕایەڵیم نواند .

بە بێ بەزەییانە بۆ کوێی بووتایە کەمەندکێشی دەکردم و سۆزداری منی قۆزتبوویەوە و یاری بە برینداریم دەکرد ... لە کۆتایدا گەڕامەوە بۆ خاڵی سەرەتا و و بەڵێنە جوانەکان و پێم وت : کوا بەڵێنەجوانەکانت بە زەواج و بەختەوەری وماڵۆچکەیەکی بچوك و خەونە ئەرخەوانیەکان ..کوا ئەو کوڕەمان کە پێشنیارت کردبوو ناوی بنێین ( مَطَر ) باران ..بۆ یادگاری ئەو رۆژە باراناویە کە منت تێدا بینی.

لەو کاتەدا رێویەکە موراوەغەی دەکرد ..وەك مرۆڤێکی ترسنۆك و سەر شۆڕ پۆزشی هێنایەوە .. کاتێ خەندەیەکی زەردەوەبوو کەوتە سەر لێوی وتی : ئایا بارودۆخی من دەزانیت .. ئایا تا ئەمڕۆش هەر منداڵیت .. ئەوە بەسە کە تۆ لە چاوانی مندا جوانترین ئافرەتی ... ئایا ئەوە بەس نیە کە رۆحی من رۆحی تۆیە .

لەو ساتەدا .. خەڵتانی فرمێسکی شەرەفی بریندراوی بووم ، هەورێکی ماتەمی کوشندە سەری لێ تێك دام و بێئاگایم لە خوای گەورە سەرگەردانی کردم ..

من هۆکاری ئەو حەیا چوون و سەر شۆڕیە بووم .. تەنها بە تەماشاکردنێکی چاوانم و بە بێهودەییەکی پەنجەکانم رێگای ژیانی خۆمم کێشا و داوێن پاکیم سڕیەوە و شەرەفی خۆمم داڕنی و کەوتمە قوڕ و چڵپاوەوە لە تیاچوندا گەوزام ، بووم بە بووکە شوشەی بەردەستی .. هەتا ئەو رۆژەی کە من لە پاڵیدا بووم و پیاوانی ئاسایش دەستگیریان کردین، ئەنجا خەبەرم بوویەوە و لە مت بوونێکی قوڵ .. ئەو پەردەیەی بەوسەر چاوەمەوە بوو لام برد و بەتاسەوە وتم :

هەرچی لەدڵمدا بوو هەڵم ڕشت و هاوار بە دوای هاواردا کە بەراستی کارەسات بوو !بەراستی کارەسات بوو ! ئەو ملوانکە زێرە جوانەی کە باوکم بە دیاری پێدا بووم گۆڕیم بۆ زەنجیرێکی ئاسن و دەنگی سۆزداری دایکمم گۆڕی بۆدەنگی تۆقێنەری ئافرەتە بەندکراوەکان ، گوڵە کراوەکانم گۆڕی بۆ تەنیایی و غەریبی و تەسکیی بەندینخانە !! ژیانێکی خۆش لە گەڵ دایکم و باوکم و خوشکمدا .. بەختەوەری تیا نەما و ئیتر نایانبینم .. بەڵکو ئەو خۆرەی لە هەناوی ئاسماندایە نایبینم .. ژیان و گوزرانم بە تەواوی گۆڕا ...

لەو ڕۆژەی ڕوپۆشەکە کەوتە خوارەوە و ناوەکان گەڕانەوە بۆ شوێنی سەرەکی خۆیان ، لەو ڕۆژەدا بۆم دەرکەوت و دڵنیا بووم کە من بە ڕێگایەکی وەهماوی و تراویلکەدا دەڕۆم ... هاوڕێکەم و شۆرەسوارەکەم و خۆشەویستەکەم وەك پێشتر وام دەوت کە دروست نیە تاڵە قژێکم یان بەشێك لە نینۆکم ببینێت، وە ئەوەی من دەیکەم و جوانی دەکەم و باش دەکەم لە پەیوەندی و ڕاستگۆیی ، ئەوە زینا و فاحیشەیە .

بەڵام ئەمڕۆ ... حەقیقەت دەرکەوت ...: هەردووکمان زیناکەرین، ئەو خۆشەویستی و پەیوەندیە لەنێوانمان بوو ، زینا و داوێن پیسی بوو ، لە ئاکامیدا قەیرەو ڕەبەن شەلاقیان لێدەدرێت و ژن و پیاویش ڕەجم دەکرێن .

دنیایەکی نوێم بۆ دەرکەوت .. بەراستی کارەسات بوو بە ناو و بە کردەوە .. ئای ئەو شاعیرە چەند جوان باس لەو واقیعە تاڵە دەکات کە من بە ووردی تێیدا ژیا بووم

اِنَ المُعاكِسَ ذِئبٌ          يُغرِي الفَتَاةَ بِحِيلَة

واته: بێگومان چاوبڕکێکەر گورگە .... بە فێڵ ئافرەت هەڵدەخەڵتێنێ

بەڵێ ئەی شاعیر ساتی ماڵئاوایی کاریگەرە و کارەساتە ..

خوشکی ئازیزم : لە گەڵ تێپەڕبونی رۆژگاردا ، مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە ئەزموونی ژیان باس بکات بە خۆشی و ناخۆشیەوە و چاکە و خراپەکانی بۆ پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن .. بە تایبەتی لەم سەردەمەدا کە فیتنە و خراپەکاری ململانێیانە تێدا ، کە بەڕاستی سەردەمی لاوازی و هەڵخەڵەتاندنی ئافرەتانی موسوڵمان و بێئاگاکانە ، ئەمە تەنها بەسەرهاتی من نیە ، بەڵکو چیرۆکی هەموو ئەوانەیە کە گوێیان لە لورەی گورگەوە بوو .. چاوەڕوانی سکەکەی دەکات و لە گەڵیدا رۆشتووە .. وە لەوانەیە خوای گەورە فەرامۆشی کردبێت و دای پۆشیبێت و لەوانەیە سزاکەی دواخستبێت بۆ قیامەت . ئەمەی بەردەستت بە سەرهاتی من بوو کە بەڕاستی باسم کرد .. ئێوارەیەکیان نوسیم بۆ ئەم سەردەمە و بۆکەسێ لەم سەردەمەدا دەیخوێنێتەوە، وە هێشتا هەموو بەیانیە دەنگم بەرز دەکەمەوە من لە کوێم ؟چۆن هاتمە ئێرە ؟ کوا ژوورەکەم ؟ کوا خوشکەکەم ؟ کوا نازپێدانی باوکم ؟ تاکەی من لەم بەندینخانە تاریکەدا دەمێنمەوە ؟ تەنها یەك سەرپێچی خوای گەورەم کرد کەچی ناخۆشیەکان زۆرن بەڵێ ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ سورەتی نور/ ٣١ واتە﴿ ئەی محمد ﷺ بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ چاویان داخەن و بیپارێزن لە

سەیرکردنی نامەحرەم و عەورەتیان بپارێزن لە داوێن پیسی و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی بە دەرەوە دیارە وەك (دەموچاویان و دەستیان ) وە با سەرپۆشەکانیان بدەن بە سینگ و بەرۆکیاندا﴾ .

بەڵام تاوان و سەرپێچیم کرد و چاوم گێڕا هەتا ڕۆشت لەگەڵ سەرپێچیدا و کارەسات بە ئاگای هێنامەوە ، دوای ئەوەی هەنگاوەکانم بەرەو زەلالەت بردمی و پێم هەڵکەوت و کەسوکارم پەرتەوازە بوون ، بەختەوەری لە ژیانمدا کۆچی کرد ، گوڵەکانم مردن و خوشکەکەم زۆر بە توندی رقی لێم بوو، باوکی ئازیزیشم حاشای کرد لێم ... بە راستی هەموویان هەقیان بوو

منیش بە دڵێکی راستگۆیانەوە و دەروونێکی روو کردووە خوای گەورە هەنگاوەکانی تەوبە کردنم نا ..

شەوانی دەوروبەرم بێدەنگێکی کوشندە بوو .. یادگاریەکانی بە ویژدانمدا تەراتێنیان دەکرد... دەنگی بانگی هەمیشە زیندووش تێکەڵ بە دلم دەبوو ﴿ قُلْ يَاعِبَادِي الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ

]الزمر ٥٣

واتە ﴿ ئەی محمد ﷺ بڵێ ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی خۆتان زۆر گوناهبار کردووە ، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت ، بەراستی هەر ئەو لێبوردەیە و بەبەزەییە﴾ .

خوشکی بەڕێز لەوانەیە بەو ڕێگایەدا ڕۆشتبیت . گوێ لە دەنگم بگرە : بوەستە .. بوەستە.. تکا دەکەم بوەستە .

تا ئەو کار و کارەسات و مەینەتیە دانەبارێتە سەر دڵت وەك چۆن داباریە سەر دڵی من .. هەتا سبەینێ یان دوو سبەیی نەیەیتە پاڵ من . ئامۆژگاریم لە هەموو دڵمەوەیە بۆ هەموو کچ و ئافرەتی ... بوەستە ... بوەستە.. ئەوەتا من ئادکارەکانی مەینەتی و کارەسات دەبینم بەرەو لای تۆ دێت.. نەکەی بکەویت... نەکەی بکەویت .

خوشکی خۆشەویستت .... ( ئازار و مەینەتبار )

# دانپیانانەکانی کچێکی سەرەڕۆ

من کچێکی تەمەن بیست و سێ ساڵم .. بە حاڵەتێکی دەروونی سەختدا تێدەپەرم کە هۆکارەکەی هەڵسوکەوتی خراپی خۆمە، کە حسابم بۆ نەدەکرد .. بێگومان دان بە هەڵەیەکدا دەنێم کە رۆچووبووم تێیدا هەتا نوقمی دەریای پەشیمانی بووم ... باوکم وەفاتی کرد و بە مردنەکەی بۆشاییەکی دەروونی و سۆزداریی گەورەی بەجێهێشت ، بۆیە بۆ سەرقاڵکردنی خۆم پەنام برد بۆ ئینتەرنێت لە رێگای ئینتەرنێتەوە ئاشنا بووم بە کۆمەڵێك کوڕ و کچ .. چەندین سەعات قسەم لە گەڵدا دەکردن ، زۆری نەبرد ئاشنا بووم لەگەڵ لاوێك کە لە شارێك نیشتەجێ بوو نزیك لە شارەکەی خۆمانەوە .

وتوێژ و قسەکردنمان پەلوپۆی لێ بوویەوە ، پاشان داوای ژمارە تەلەفۆنەکەی کردم و منیش رازی نەبووم ، دوای پێداگرتنێکی زۆر ژمارە مۆبایلەکەی خۆمم پێدا .. ئیتر ئەویش پەیوەندی زۆری پێوە دەکردم ، دوای ئەوە داوای بینینی منی کرد، منیش دیسان رازی نەبووم .. دوای پێداگرتنێکی زۆر لە شوێنە گشتیەکاندا دەمبینی و بینینەکانمان زۆر بوون .. لەو کاتانەدا ئاشنا بووم بە لاوێکی تر ، کەسێکی بە سۆز و شارەزای پێگە نهێنیەکانی ئەنتەرنێت بوو ، هەر شتێکم نەزانیایە لەوەوە فێری دەبووم .. قسەکانمان وتوێژەکانمان زیادی کرد و ئەویش داوای ژمارە تەلەفۆنەکەی کرد دوای دوولی ژمارەم تیپێدا و پاشان داوای بینینی کرد.. منیش چوومە دەرەوە بۆ بینینی ، بەو شێوەیە من تێکەوتبووم و چی بکەم بەخۆم ؟! پاشان ئاشنا بووم بە لاوی سێیەم کە لە وان سوزدارتر بوو.. لە گەڵ ئەمدا

هەستم بە خۆشەویستی دەکرد لە کاتێکدا لە گەڵ دوانەکەی پێشوودا وام هەست دەکرد  وەك برام وان ، گوێم لە هەواڵیان دەگرت ، بەشدار دەبووم لە چارەسەری کێشەکانیاندا.. بەو شێوەیە پەیوەندیم درێژەی کێشا لە گەڵ ئەو سیانەدا ، هەتا خوشکەکەم بەم کارەی زانی ، بۆیە ئامۆژگاری کردم کە وازیان لبێنیم... منیش بەڵێنم پێدا بۆ ئەوەی بێدەنگی بکەم ... لاوێکی چاك هاتە داوام و منیش دڵم خۆش بوو، چونکە دەمبینی کە رزگارم دەبێت لەو پەیوەندیانەم لە سەر ئینتەرنێت.

بۆیە عەقدی زەواجمان بەست ومنیش داوام لە کوڕەکان کرد وازم لێبێنن و پەیوەندیم پێوە پچڕانن ... دوانیان رازی بوون و بەڵام سێیەمیان کە یەکەم یان بوو رازی نەبوو کە وازم لێبێنێت ..ئەو بیرۆکەکەی پێی باش نەبوو.. بۆیە وەك خوویەکی ئەوانەی کە پسپۆرن لە کۆمپیوتەردا هەستا بە چاودێری کردنی پۆستی ئەلەکترۆنیەکەم و ئەو نامانەی ناردبووم بۆ کوڕەکە و ئەو نامانەی ناردبوویان بووم بینینی بۆیە چاپی کردبوون و ناردبوونی بۆ ناونیشانی ماڵەکەمان ، کاتێ بینیم توشی شۆك بووم.. خەریك بوو دەمردم، بەپەلە سوتاندمن ، لە ترسی ئەوەی نەکەوێتە بەردەستی دەزگیرانەکەم کە خۆشمدەوێت و هەستم بە تاوانێکی گەورە دەکرد بەرامبەری .. لە ترسێکی راستەقینەدا دەژیام، هەر کاتێ زەنگی تەلەفۆن لێیبدایە یان مۆبایل یان نامەی تایبەت بۆم یان خێزانەکەم کە هەر باسێکیان لە گەڵدا بکردمایەتەوە وام گومان دەبرد بەو پەیوەندیەی منیان زانیوە .. وام هەست دەکرد چالاك نیم لە پیشەکەمدا کە مامۆستا بووم، وام هەست دەکرد شایانی ئەو پیشە پیرۆزە نیم ، وە شایانی متمانەی کەسوکارم نیم، بەراستی زۆر پەشیمانم ، پەشیمانم تکا دەکەم نامەکەم بڵاوکەرەوە

تاوەکو بێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ هەموو ئەو کچانەی کە بە بێهودانە بەدوای کۆمپیوتەردا دەڕۆن و بە دوای خۆشیدا دەگەڕێن و دەکەونە بۆسەی کەسانی نەفس نزمەوە

له کتێبی﴿ ضحايا الانترنيت﴾ وەرگیراوە

# کچی ئەنتەرنێتەکە

یەکێك لە کچان باسی خۆی دەکات و دەڵێت : من خوێنکار بووم لە کۆلێژی پزیشکی ، لە ڕێی ئەنتەرنێتەوە لاوێکم ناسی.. هەمیشە داوای ژمارەی مۆبایلەکەمی دەکرد ، بێگومان پێم نەیا ، هەتا زۆری بۆهات و بە ڕقێکی زۆرەوە وپێی وتم : بە دڵنیاییەوە تۆ کوڕیت و من سوێندت بۆ دەخۆم .... منیش لە وەڵامدا دەمووت بە خوا کچم .. ئەویش دەیوت چۆن بزانم ؟ یەك جار قسەم لە گەڵدا بکە و ئەوەم بۆ بسەلمێنە

منیش ڕازیی بووم و ڕۆژی تیا چوونم ئەو ڕۆژە بوو کە یەکەمین قسەم لەگەڵدا کرد و ووتم: ئەلو من فلاَن کچم ئایا دەمناسیت ؟ بە دەنگێکـــی هەنگوینیـــەوە وتـــی : ســـلاَو ســـلاَو... دوای ئـــەوە قسەکردنەکەمان سەرتای هەبوو بەلاَم کۆتایی نەبوو... تا وای لێهات زۆر ئەویندارى بووم و ئیمێڵی تایبەتی خۆمم پێدا و ئەویش وێنەی خۆی بۆ ناردم.. لاوێکی سپۆرت بوو.. زۆرم خۆش دەویست و هۆگری بووم، هەتا هەموو ئەوانەی کە دەهاتنە داوام جوابم دەکردن ، نزیکەی دوای سێ مانگ پێی وتم : دەمەوێت بتبینم.. منیش ڕازی نەبووم هەڕەشەی لێکردم کە دەستبەردارم دەبێت.. لەو کاتەدا شکستم هێنا و نەم توانی کۆنترۆڵی هەست و سۆزداری خۆم بکەم .. بۆیە ڕازی بووم، خۆزگە ڕازی نەبوومایە ، جێ ژوانمان لە یەکێ لە باخچە خێزانیەکاندا بوو ، بینیم و پێکەوە قسەمان کرد دەستی لێنەدام و تەماشاشی نەکردم، منیش متمانەم پەیدا کرد پێی ، هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات کە ناپاکیم لە گەڵدا دەکات .

ئـەوە دواهــەمین ژوانمــان نــەبوو.. جـارێکی تـر لەبـەردەم دەرگـای کۆلێژدا بەیەك گەیشتین و دوای ئەوە لە ئۆتۆمبیلەکەیدا دوای ئـەوە لـە شوقەیەکدا !! بەلاّم لە شوقەکەدا بەهادارترین شتی خۆمم لەدەستدا .. حەیا و شەرەفم لە دەستدا و پاکیزەییم لەدەستدا .

گەڕامەوە بۆ کۆلێژ و لەوێ دایبەزاندم و دوای ئەوە ڕۆشت.. بە خـوا گوێم لە دەنگیەوە نەبوو ، لای کەس و کارم دانم بە تاونی خۆمدا نـا ، بەلاّم بە هاوکاری کچێکی هاوڕێم و باوکی خوای گەورە پاداشتی خێری بداتــەوە.. ئــەوانیش موراعــاتی بارودۆخەکــەیان کـرد، بــەلاّم مــن بــە خەفەتباریــەوە دەژیــم.. هــەرکاتێ بەســەرهاتی خــۆمم دێتــەوە یـاد بــە شــێوەیەك دەگــریم ئەگــەر هــەموو جیهــان بــسوتێ بــە فرمێــسکەکانم دەیکوژێنمەوە ، داوات لێدەکەم دوعام بۆ بکەیت خوای گەورە تەوبەم لێ قەبوڵ بکات

# دوواهەمین هێشوو

ڕۆژێکی گەرمی هاوین بوو... ڕەشەبای گڕە لەوپەری سەختیدا بوو لە ( ریاض ) .. خوشکە بچوکەکەم ( جود ) پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوە .. ئۆفی کرد ، ئۆف ئۆف ئۆف خەریك بوو لەگەرمادا بخنکێت.

بە پەلە هەستامەوە تا پەنجەرەکە دابخەم ... و وتم ئۆه ! دەتەوێت چی بکەیت ، ئایا شێت بوویت بەم گەرمایە پەنجەرە دەکەیتەوە ؟

بێدەنگ بوو لێوەکانی خۆی مت کرد، پاشان بە قورسیەوە خۆیدا بەسەر جێگاکەی مندا ،، ئۆف ئۆف ئۆف ئەم ژیانە زۆر ناخۆشە .. ئێمە لە پشوودایین ... و خەڵك گەشت و سەفا دەکەن و ئێمەش لێرەداین ..

خەریك بوو قسە بکەم ، بەڵام خۆمم بێدەنگ کرد و خەریکی هەڵدانەوەی لاپەرەی کتێبە خۆشەکە بووم بە دەستمەوە... ( جود ) بە بێتاقەتیەوە تەپاوتلی دەکرد .. لە پڕ بازیدا .. وتی پێم ( فاتمە ) رات چۆنە بچین بۆ ماڵی مامم تا مەلەوانگەکە پڕکەین لە ئاو و لە گەڵ کچاندا مەلە بکەین ؟ رات چۆنە؟

هەردوو لێوم درێژ کرد بۆ پێشەوە .. چونکە سەرسام نەبووم بە بیرۆکەکەی و وتم پێی: نەخێر تاقەتم نیە ... تۆ دەزانیت ماڵی ئەوان کوڕی تیایە ، متمانەم بەوە نیە کە بەدزیەوە تەماشا نەکەن .

( جود ) : ئۆف ئۆف ئۆف .. تۆ گیریت .

بە هێمنیەوە تەماشام کرد و بەخەندەوە پێم ووت: ئازیزم .. ئەوەتەی هاتووینەتە ئەم ژوورە چەند جار وتت ئۆف .

جود: ئۆف ئۆف ئۆف هەتا لەسەر ئۆفیش لێپرسینەوە دەکرێین !

بەتوڕەییەوە چووە دەرەوە لە ژوورەکە .... (جود) بچوکترین ئەندامی

خێزانەکەمان بوو .. هەرچەندە جیاوازی تەمەنی نێوانمان شەش ساڵ تێنەدەپەڕی بەڵام جیاوازیەکە لە کەسایەتیدا زۆر زیاتر بوو ... وە بۆشایی نێوانمان فراوان بوو .

هەر لە سەرەتای چاو هەڵهێنانمان بە دنیا ، ئێمە خێزانی خۆمانمان دەبینی کە خێزانێکی پارێزراو وساڵحە و دایکیشم ئافرەتێکی لەخواترس بوو .. هەر لە منداڵیمانەوە لە سەر ئاکار و رەوشتی جوان پەروەردەی کردبووین ، وە هەروەها باوکیشم لە گەڵ سەرقاڵیەکەیدا بەڵام پەروەردە توند وتۆڵەکەی و خۆشەویستیەکەی لە یەك کاتدا کاریگەریی گەورەی هەبوو لە سەر رێك راوەستانمان .. بەڵام لە گەڵ خوشکە بچوکەکەماندا جیاواز بوو ، لە بەر ئەوەی دواهەمینی هێشوو بوو... دایك و باوکم نازیان دەیایە و و هەڵسوکەوتی تایبەتیان دەکرد لەگەڵیدا .

ئەوەتا کەسێك بوو کە مافی ئەوەی هەبوو کە تا نیوە شەو دانیشێت... هەتتا لە کات خوێندنیشدا .. وە هەروەها بە گریانەکانی و شکاتە بەردەوامەکانی توانیبووی ئەوان رازی بکات کە بیخەنە قوتابخانەی تایبەتەوە .. هەتا جلەکانی بەداخەوە دایکم رێگەی پێ ئەدا کۆمەڵێك پۆشاك بپۆشێ کە رێگەی بە ئێمە نەئەیا بیپۆشین .

من و خوشکەکەم تورە دەبووین و رێگریمان دەکرد ، بەڵام بەداخەوە بێسوود بوو ... بە ئاشکرا قەبارەی جیاوازی نێوانمان گەورەو دیاربوو ...لەوکاتەدا کە ئێمە لەزەتمان دەبینی لە گوێگرتن لە شریتی موحازەرە و وانەکان .. (جود) لە گەڵ گوێگرتنی گۆرانیدا نەبووایە نەیدەتووانی سەعی بکات .

ئەوەی جەرگی منی سوتاندبوو ئەوە بوو کە دایکم رازی بوو لێی و ڕێگری نەدەکرد ... هەتا باوکیشم هەمیشە وەك منداڵێکی بەسەرزمان تەماشای دەکرد .

لەراستیدا جود توانیبووی خۆی بخاتە دڵیانەوە.. هەمیشە هۆگری ئەوان بوو، بە بەردەوامی خزمەتی دەکردن و بە قسەیش نازی دەکێشان ... دیاریشی دەکڕی بۆیان ... لە راستیدا یان مەکرباز بوو .. یان زۆر بە سۆز بوو .... نازانم .

هەوڵی زۆرم دەدا کە ئامۆژگاری بکەم و ئاراستەی بکەم... بەڵام بێ ئومێد بووبووم لێی .... ئەو هەمیشە بەرەو رووم دەبوویەوە و منی بە کەسێکی ئاڵۆز و وشك دادەنا .... نەیدەویست بە یەك وشە ئامۆژگاری بکەم .

رۆژێکیان جود داوای لە دایکم کرد کە بڕوات بۆ شاری یاری لەگەڵ کچەکانی هاورێیدا .... چەند رۆژێ هەر داکۆکی کرد تا دایکم رازی بوو... کاتێ بەمەم زانی زۆر ڕێگریم کرد ... و بە دایکمم وت چۆن ڕێگای پێدەدەیت لە گەڵ کچاندا بچێتە دەرەوە کە نازانیت رەوشت و هەڵسوکەوتیان چۆنە .. تکات لێدەکەم چۆن ڕێگای پێدەدەیت ؟ بەڵام دایکم هێمنی کردمەوە و دەیووت شتێکی ئاساییە و شوێنەکەش هی ئافرەتانە .

منیش وتم : بەڵام دایکە ، ئەو هێشتا لە قۆناغی ناوەندیدایە چۆن بە تەنها خۆی بڕوات ؟

دایکم : کچم یادی خوا بکە ، بەو شێوەیە هەمیشە رارا مەبە ، شتەکە زۆر ئاسانە هەموو کچان بە تەنها خۆیان دەڕۆن .

منیش وتم : دایکە من کچانی هاوڕێیم بینیوە ڕۆژێکیان کاتێ ڕۆشت بۆ قوتابخانە ... بەخوا دایکە ئەگەر بتبینینایە دڵئارام نەدەبوویت .. هەتا بالاپۆشی دانیان پیادا نەئەنا ... بەڵکو لە گەڵ شۆفێرەکانیاندا نیوە خۆ دەرخستوو دەچونە ژوورەوە ... چۆن وازی لێ دێنیت لە گەڵیانان بچێتە دەرەوە ... ئەم چ پەیوەندیەکی بەوانەوە هەیە ؟

دایکم وتی :( فاطمە) .. تەواو واز لەم باسە بێنە .. هەمووی دوو سەعاتە پشت بەخوا دەگەڕێتەوە... ئەم هەموو بێتاقەتیەی بۆ چیە ؟ زۆر هەوڵمدا .. بەلام بێ سوود بوو ، ئیتر وازم هێنا ...بێدەنگ بووم دڵیشم لە ئازاردا گڕی دەکردەوە ... چونکە هەستم دەکرد کە خەریکە خوشکەکەم لە ژێر دەستماندا دەردەچێت ، ئەگەر ئەم کەمتەرخەمیە بەردەوام بێت ... هەر ئێستەش نا لە ئایندەیەکی نزیکدا ئەوە روودەدات .... بە هەر حاڵ (جود) ڕۆشت .... بە پێلاوەکانی تەقە و لەرزەی هەڵدەستان و بە شێوەیەك تەماشای دەکردم کە هەمووی سەرکەوتن و تەحەدا بوو .. ڕۆشت و ئەو تەنوورە جێنزە کورتەی لە پێدا بوو کە قایشێکی شۆڕی کانزایی پێوە بوو ... میکیاجیش روخسارە منداڵکارەکەی داپۆشیبوو لەناو عەبا تەسکەکەشدا خۆی شاردبوویەوە و بەنازەوە ڕۆشتە دەرەوە.

ئێمە دانیشتبووین و خواردنی خۆشی ئێوارەمان دەخوارد کە نان و ماس بوو ..کاتێ دایکم تەماشای سەعاتی کرد وتی : سەیرە سەعات نۆ و نیوە و (جود) نەگەڕاوەتەوە ، باوکم لایکردەوە و وتی : وتوویەتی کەی دەگەڕێمەوە ؟

وتی : پێش نان خواردنی ئێوارە .واتە دەوروبەری هەشت .

باوكم وتی :وازی لێبێنه، لەوانەیە خۆش بێت و بیەوێت زیاتر یاری بكات .

من تەماشام دەكردن و بە تەواوەتی بێدەنگ بووم .. چونكە بڕیارم دابوو هەواڵی نەپرسم و هەرگیز ئیتر هەقم نەبێت بە سەریەوە .. كەمێك باوكم بێدەنگ بوو... پاشان وتی : وتی لە گەڵ كێدا دەگەڕێمەوە ؟
دایكم وتی : لە گەڵ كچانی هاوڕێیدا دەگەڕێتەوە ..وە شۆفێری خۆی هەیە ... هەستم كرد باوكم خەریكە هەست دەكات كە خەلەلێك لە ئارادایە .... وتی : دایكی عبداللە خوا جەزات باتەوە .. بۆچی پێشتر پێت نەوتم .... چۆن رازی دەبیت لە گەڵ شۆفێرەكەدا بڕواتە دەرەوە بە تەنها كە ئەو هێشتا كچێكی بچووكە .

دایكم : نازانم خوا رابەرداری بێت چۆن رازی كردم .

میلی سەعاتەكە بە خێراییەكی ترسناك تێدەپەڕی و نزیك بووبوویەوە لە سەعات دە .. پاشان یانزە و (جود)یش نەگەڕایەوە ..

دڵەراوكێ بە شێوەیەكی ترسناك بە ماڵەكەماندا بڵاوبوویەوە ، باوكم دەستی كرد بە هاوار كردن ... چۆن وازی لێدێنیت خۆی بە بێ ئەوەی ژمارەی مۆبایلی هاورێكەی وەربگریت ؟ ژمارەی كەس و كاری هاورێكەی، یان بە لانی كەمەوە ناوی هاوڕێكەی ؟ دایكم خەریك بوو دەگریا و دەیووت : ئەی بۆ تۆ لێت نەپرسی ؟ من چی بكەم ؟ بەسەر مندا هاوار مەكە، بەسە ئەمەی كە ئێستا بەسەرمدا هاتووە .

هەموو خوشك و براكانم هاتن ، هەتا عبدالله ی برام كە ژنی هێنا بوو و بانگیان كردبوو، ئەویش هاتبوو .

رۆشتن بۆ شاری یاری و بینیان دەرگاكانی داخراوە و باوكم بە تەواوی سەرشێت بوو ، شەكرەكەی بەرز بوویەوە و حاڵەتی تێكچوو گەیەنرایە نەخۆشخانە و هەموومان بە بێ هوودە بە دوایدا دەگەڕاین ..
لە سەعات یەكی شەودا .. براكەم هەواڵیدا بە پۆلیس .. بەڵام ، تاڵە داوێكیان شك نەدەبرد تا شوێنی بدۆزینەوە .. نە ناوی هاوڕێكەی .. نە ژمارەی مۆبایلەكەی و نە ژمارەی ئۆتۆمبیل ..و نە هیچ شتێك .. ئیتر چۆن بزانین لە كوێیە ؟ و پۆلیس چیمان بۆ دەكات ؟
هەموومان لە ماڵەوە ماینەوە و دوعا و نوێژمان دەكرد و لە خوای گەورە دەپاڕاینەوە و نەماندەزانی چی بكەین و جود وون بووە و دیار نەماوە و ... باوكیشم لە نەخۆشخانەیە .
لە سەعات چواری بەرەبەیاندا .. ژمارەیەكی نەناسراو پەیوەندی بە مۆبایلەكەی عبدالله ی برامەوە كرد .. كاتێ وەڵامی دایەوە ..
ئەو كارەساتە روویدا كە بە بیر و هۆشماندا نەدەهات .. برایەك لە فەرمانگەی پۆلیسەوە پەیوەندی بە براكەمەوە كرد تا پێی بڵێت كە خوشكەكەم لە گەڵ كوڕێكدا پێكەوە شەوی رابردوو لە ئۆتۆمبیلێكدا بوون .
وە خوشكەكەم بە هۆی سەختی رووداوەكەوە لە هۆش خۆی چووە و پێش كەمێك هاتووەتەوە هۆش خۆی و ئەم ژمارە مۆبایلەی پێیاوین ... كاتێ براكەم مۆبایلەكەی داخست لە سەر زەویەكە دانیشت و دەموچاوی پێچایەوە بە بەشماخەكەیەوە و دەستی كرد بە گریان ... دایكم هاواریكرد .. ئەوە چیە ؟ قسە بكە ؟ئایا بە مردوویی لە نەخۆشخانەیە ؟ قسە بكە .. قسە بكە .

بەو حاڵە ناخۆشەوە براکەم بە دەنگێکی پیاوانەوە کە هێزێکی ئازاراوی دەیتلاندەوە فرمێسك بە چاوەکانیدا چۆڕاوگەی بەستبوو وتی: خۆزگە بمردایە ، خۆزگە بمردایە .

من زانیم چیان پێ وتبوو، من هەستم پێکردبوو پێش ئەوەی پیمان بڵێن ، بەڵام بێدەنگ بووم ، بە خێرایی دایکمم گرت و خوام دەهێنایەوە یاد و ئەویش لە نێوان دەستمدا پەلە قاژەی دەکرد ، بە پەلە ئاوم هێنا و دەم و چاوی بشۆم ، فرمێسك تێکەڵی ئاوەکە بوو .

دوای کەمێك ، عبدالله رۆشت تا بیهێنێتەوە... دوای ئەوەی دایکم سوێندی دا کە نەیکوژێت.... دوای ماوەیەك .... خوشکەکەم هاتەوە ... رووخساری شێواو و وەك مردوو وابوو... فرمێسك ئاسەواری خۆی بەسەر روومەتیەوە جێهێشتبوو . دەلەرزی .. کاتێ ئێمەی بینی . بە پەلە خۆیدا بە سەر قاچی دایکمدا ... دایکە لێم ببورە بە خوا هیچم نەکردووە ... بە خوای مەزن .. بە خوا... دایکیشم بە هێزەوە بە قاچی پێداکێشا .. بە توندی قیژاندی بەسەریدا: بڕۆ ژوورەوەکەی خۆتەوە .. بڕۆ نامەوێت هەی سوك و سەلیم رووخسارت ببینم .. باوکت بە هۆی تۆوە لە نەخۆشخانە گیان ئەیا .. خۆزگە بمردیتایە و هەی ناپاك ئەمڕۆ بەم شێوەیە تۆمان نەبینیایە ..

هەموومان هەستمان بە قیزەونیەکی سەیری خوشکەکەمان دەکرد .. نەمان دەویست قسەی لە گەڵدا بکەین ، یان هەر روخساری ببینین، یان بۆنی بێت بەسەرماندا .. بۆ سبەینێ دایکم بە ناچاری بردی تا شیکاری سکك بوونی بۆ بکات ، ئەویش دەگریا و دەیقیژاند و سوێندی دەخوارد کە هیچی نەکردووە ، بەڵام دایکم تەنها دەیویست زەلیلی بکات و وای

لێبکات کە هەست بە نزمی رەفتارەکەی خۆی بکات ، و سەرنجی ئێمە بۆی .

باوکم چەند رۆژێك لە نەخۆشخانە مایەوە و حاڵەتەکەی ناجێگیر بوو .. لە بەر ئەوە هەواڵەکەمان بە باوکمان نەوت ، وتمان تووشی رووداوێك هاتووە ... بەلاَم زانی ... بە هۆی رووخساری پیس بوومان بە حەیا چوون زانی.. وە لە ماتەمیمانەوە کە بۆنی دڵە بریندارەکانی هەڵگرتبوو

دوای ئەوەی تەندروستی باش بوو هاتە دەرەوە .. بە تەواوی لەوە دڵنیا بوو کاتی ٚبینی کە چۆن هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکەین و چۆن وەکو نیوە بەند کراو وا بوو لە ژوورەکەیدا ...ئەویش بە یەك وشە قسەی لە گەڵدا نەکرد ..من شتی زۆرم لە باوکمەوە دەبینی ، پیاوەتی و جوامێری بە تەواوی تێك شكا بوو .. وە شانازی کردن بە منداڵەکانیەوە ... نەدەچووە دەرەوە .. ولە گەڵ کەسدا کۆنەدەبوویەوە تەنها حەزی دەکرد لە گەڵ دایکمدا دانیشێت و بۆ هیچ شوێنێ نەچێتە دەرەوە .

ماتەمیەکی گەورە ماڵەکەمانی داگرتبوو .. هەتا خوشکە شووکردوەکانمان زۆر سەردانیان نەدەکردین .. وەك ئەوەی لەبەرەوڕووبونەوەی ماتەمی و خەفەتباری بترسن .

رۆژێکیان ، هەستم کرد کە پێویستە کارێك بکەم... ئەو ماتەمی و خەفەتباریەی بە تەواوی دڵی داگرتووین لایببەم و ئیصلاحی شتێك بکەم .. بە هێمنی چوومە ژوورەکەیەوە و بینیم بێدەنگە و لە سەر جێگەکەیەتی .. لەپاڵیدا دانیشتم و تەماشام دەکرد .. بۆ یەکەمین جار پێم وت : ئایا رێگام پێدەدەیت لێت بپرسم بۆچی وات کرد ؟

ماوەیـەكی زۆر بێـدەنگ بـوو .. كـاتێ بینـی سـوورم لـە سـەری و تەماشای دەكەم، بە ماتـەمینێكی زۆرەوە بزەیـەكی هێنایـە سـەر لێوی و وتـی : وام دەزانـی منـی خـۆش دەوێـت ، كـاتێ پیـاوانی پـۆلیس دوای ئۆتۆمبیلەكە كەوتن لە پڕ بینیم بە خێرایی وەستاو قیڕاندنی بە سـەرمدا كە دابەزم و بەڵكو بە هێـزەوە پاڵی پێـوە نام و دایبەزانـدم ، هەسـتم بـە خۆم نەكرد لەوكاتەدا نەبێت خۆم لە ناوەڕاستی شەقامەكەدا بینیەوە بـە تەنها و ئەویش رایكردبوو،منی بەجێ هێشتبوو .. ئەو سووك و نزمە .

ئایا پێشتر لە گەڵیدا چوویتە دەرەوە ؟

تەنها یەك جار .. لە قوتابخانەوە بردمی و پێكەوە نانمان خوارد و پاشان هێنامیەوە .

بۆ ماوەیەك تەماشام كرد و وتم : ئەی ئێستا هەستت چۆنە؟

– رقم لێیەتی ... رقم لە خۆشمە .

لە پڕ بە كوڵ گریا و هەنسكی هەڵدەڕشت .. هـەتا دڵـی منیشی پـڕ كـرد ....نزیـك بوومـەوە لێـی .. مـاوەی دوو مـانگ كـە بـۆ یەكـەمین جـار باوەشم پیا كرد و نام بـە سـنگمەوە ... دەسـتم هێنـا بـە قژە خاوەكەیـدا كە پێش ماوەیـەك زۆربـەی وەری بـوو ... هەسـتم بـە سـۆز و بەزەییـەكی زۆر دەكرد بۆی ..باوەشم پیاداكرد و و لەگەڵیدا دەستم كرد بە گریان.. پێم دەوت: ئازیزم رقت لەخۆت نەبێتـەوە ... دەرگـای تەوبە كراوەیـە .. خـوای گـەورە ومیهرەبـان چـاوەڕوانی تۆیـە و چـاوەڕوانی تەوبـەكردنی تۆیە و شـاد دەبێـت پێـی ، لـە نێـوان دەسـتمدا وەك كـۆتر هەڵدەلـەرزی و دەگریـا ودەیـوت : بـەڵام ئێـوە بێـزم لێدەكـەنـەوە ، تـەواو منتـان ناوێـت ، كەس منی ناوێت با تەوبەش بكەم ..

سەریم گرت و بەرزم کردەوە و لە چاوەکانیدا (جود) ی منالّیم بینی، وتم شتی وا مەڵێ ... هەموومان سەر لەنوێ خۆشمان دەوێیت و چاوەڕوانی تۆین ...تەنها رابردوو لە یاد بکە .. سەر لەنوێ دەست بە ژیانی نوێ بکە ، پاشان بە هێمنی پێم وت : من نامانەوێت لە پێناوی ئێمەدا رابردوو لە بیر بکەیت .. نەخێر ... دەمانەوێت لە پێناوی خۆتدا .. تا لاپەرەیەکی سپی و نوێ دەست پێبکەیت لە گەڵ پەروەردگارتدا .. لە گەڵ بەدیهێنەرتدا ، ئەوە پەیوەندی تۆیە بەوەوە ... نێوانی خۆت و ئەو زاتە چاك بکە ... ئەو کاتەش هەموو شتێکی نێوان تۆ و کەسانی تر چاك دەبێت .

دەنگی دەلەرزی: بەلاّم .. سومعە و شەرەفم تیا چوو .

بزەیەکم کرد و وتم : کێ شتی وا دەڵێت ، هیچ شتێ کۆتایی نایە مادام دەرگای خوای گەورە و میهرەبان کراوەیە ... تەنها دەستی خۆت درێژکە بۆی .... ئەو کاتە رەحمەت و بەزەیی و میهری ئەو دەبینیت .

بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا بە کاریگەریەوە تەماشای کردم و پاشان بزەیەك گرتی کە هێشتا چاوەکانی پر بوون لە فرمێسك .

﴿ گۆڤاری (الحیاة) ژمارە ٦٢ جمادی الاخر١٤٢٦ ك ﴾

# تۆم ناوێت وەك ژن بەڵكو وەك خۆشەویست

کچەکە وتی : لەناخمەوە هاوار دەکەم لە کچانی هاورەگەزم و لە هەموو کچێك بە ئاشنا بوون ، پەیوەندی بەستن بە کورەوە لە رێگای ئەنتەرنێت ، ئەوەی لە سەرەتادا روودەدات لەزەت و خۆشیە و بەلأم کۆتاییەکەی حەسرەت و پەشیمانیە... ئاگاداربە و پاشان ئاگادربە نەکەی بەبێ هوودە ئەو ئامێرە بەکاربێنیت .

من خۆم و پاکیزەیم لە دەستدا بە هۆی خراپ بەکارهێنانی ئەم ئامێرەوە ، سەرەتا بە هەڵەیەکی بچووك دەستی پێکرد و پاشان گەورە و فراوانبوو هەتا لە کۆتایدا بوومە قوربانی، بەهۆی گەمژەییمەوە و نەزانینم و هەست نەکردنم بە چارەنووسی شتەکان ... ئەمەش بەسەرهاتی منە .. دەخوازم و تکا دەکەم کە ببێتە وانەیەك و سوود مەند بێت بۆ هەر کچێك کە ئەم بەسەرهاتەی من دەخوێنێتەوە.

لە سەرەتادا بەو ئامێرە بۆ ماوەی چەندین سەعات کاتم بەسەردەبرد، هەندێ جار سوودم لێدەبینی بۆ زیاتر شارەزا بوونم ، بە چوونە ناو کۆمەڵێ سایتەوە و بە ئامانجی یەکتر ناسین ودروستکردنی هاورێیەتی لە گەڵ کچاندا لە هەموو وڵأتێك ، تا بە هەڵە ئاشنا بووم بە لاوێك لە یەکێ لە وڵأتانی دراوسێ .. سەرەتا تەنها یەکتر ناسین و قسەی ئاسایی بوو، هەتا وام لێهاتبوو بەتەواوی عاشقی ئەنتەرنێت بووم لە پێناوی ئەوەدا، چونکە لاوێکی قسە خۆش بوو ، نوکتەی خۆشی باس دەکرد ، رۆح سوك بوو، بە شێوەیەك هەرکەسێ قسەی لە گەڵدا بکردایە بێتاقەت نەدەبوو، بۆ ماوەی سێ مانگ بەو شێوەیە ماینەوە . هەتا ژمارەی مۆبایلمان دا بە یەکتری ،وامان لێهات لە

رۆژێکـدا چـەند جـارێ پێکـەوە قـسەمان دەکـرد ،هـەتا کەوتـمـە داوی خۆشەویستیەوە .

پێـی دەوتم : مـن یەکـەمین خۆشەویـستم لـە ژیانیـدا ، وە مـن بـە تـەواوی بیروهـۆش ..و...ی ئـەوم داگـیر کـردووە... لـەو جـۆرە قـسە هەنگوینیانە کە خۆی دەیا لە رۆح و گیانم .. هـەتا وام لێهات بەبێ ئەو ژیـانم نـەدەبینی ، هەرچـەندە یـەکترمان نـەبینی بـوو .... پـاش ئـەوە وێنەمان گۆڕیەوە ، ئەو زۆر جوان بوو، ئەویش سەرسام بوو بە جوانی من ..چونکە من بە شایەتی ئەوانەی کە دەیان بینیم زۆر جوان بووم .
بـە هـەر حـاڵ سەبارەت بـەمن هـەموو شـتێکی دەزانـێ ... وە هـەروەها منیش ئاشنا بووم بە درێژەی ژیانی ئەو .. زۆر حەزی لە بینینم بوو، وە منیش هەروەها ، بەڵکو خوازیـار بـووم رووبەروو بیبینم ، بۆیە بۆ ئەو کـارە ژوانێکمـان رێکخـست لـە یـەکێ لـە وڵاتـە عەرەبیـەکان ، لـە گـەڵ دایکمدا گەشتمان کرد بۆ ئـەوێ بـۆ چارەسـەرکردن، ئـەویش لـە پێنـاوی منـدا فـڕی ... بـەڵکو لـە پێنـاوی بینینـی مـن رووبـەروو.. وە پـەرۆش بوونی خۆشەویستی و ئەوینداری لەو وڵاتەدا ... بۆیە یەکترمان بینی و پێکەوە چووینە دەرەوە و ...و..و ئەو شتەمان کرد کە خوای گەورەی لـێ دەڕەنجـانێ ..وە مـن بـیرم لـە خراپـی یـان ئاسـەواری ئـەو کردەوەیـە نەکردەوە .

وە بیرم لە سومعەی کـەس و کـارم و دایکـە نەخۆشـەکەم نـەدەکردەوە .. کە لە پێناو چارەسەرکردندا هاتبوو .

هـەموو ئەوشـتانە لـە بـیر و هۆشمـدا نـەمان و لـە ژێـر کاریگـەری و نەشـئەی خۆشەویـستی لـە گـەڵ ئـەو کـوڕە لاوەدا ... وە بـیری زەواج نـەهات بە بیرمـدا هـەتا ئـەو کاتـە نـەبێت کـە خـۆمم بینیـەوە زۆر هـۆگری

بووم و پێشنیاری بیرۆکەکەم بۆ کرد، بەلاَم ئەو شڵەژاو و رووخساری گۆڕا .. پێم وت: ئایا منت خۆش دەوێت ؟

وتی : بەڵێ بەلاَم وەکو ژن بیر لە تۆ ناکەمەوە .

پێم وت : بۆچی ؟ من تۆم خۆش دەوێت و تۆش منت خۆش دەوێت ... چ رێگریێ هەیە لە کۆتایی هێنانی خۆشەویستیمان بە زەواج و هاوسەرگیری ؟

وتی : لە ئایندەدا بیری لێدەکەمەوە .. و پەلە مەکە ، بەلاَم دوای ئەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵمدا گۆڕا .... بەڵکو رایدەکرد لێم . هۆکاری ئەو گۆڕانەم لێپرسی ؟وتی : وا باشە بۆ تۆ .

جارێکی تر باسی زەواجم لە گەڵیدا کردەوە ... قیڕاندی و وتی :من تۆم ناوێ وەکو ژن ، وە ئێستا وەکو خۆشەویستیش تۆم ناوێت... وون بە لەبەرچاوم ... سەرسام بووم لەو پەرچەکردارەی و لەو قسە بریندارکەرەی.. پاشان وتی : من پێم باش نیە بتکەم بە ژنی خۆم ، بەڵکو تەنها وەك خۆشەویست و عاشقێك تۆم دەوێ .... ئەگەر حەزدەکەیت ئەوە باشە ئەگەر حەز ناکەیت ئەوە هەزار جار نا .

خۆم نەگرت و زۆر تووڕە بووم .تفێکم کردە روخساری و پاشان کوپێکم هەڵگرت و هەڵمیا بۆی و گەڕامەوە بۆماڵەوە ، بە ئازارەوە زۆر بە کوڵ دەستم کرد بە گریان و دنیا لە بەرچاومدا رەش بوو ، لە گەڵ دایکم لە سەفەر گەڕاینەوە و خەفەتێکی زۆر دایگرتبووم ، خۆزگە کارەکە هەر بەوەندە کۆتایی بهاتایە و تەواو بووایە ، بەلاَم ئەو دەروون نزمە وازی لێنەدەهێنام و بەڵکو دەیەویست تۆڵەم لێبکاتەوە کاتێ تفێکم تێکرد و کوپێکم تێگرت ، ئەوەی زۆر بە سوکایەتیەکی گەورە دەبینی .. دەیویست رێز و حورمەت بۆخۆی بگێڕێتەوە... بەلاَم بە

ڕێگایـــەکی بۆگـــەن ،چـــونکە هـــەواڵی ئـــەو پەیوەندیـــەی بـــە وردی گەیاندبوویە براکەم لە گەڵ بەڵگەدا .

منیش بواری نکولی کردنم نەمابوویەوە .. هەموو شتێ ئاشکرا و دیار بوو چونکە بەوردی شارەزای وردەکاری ژیانی من و کەس و کارم بوو .

براکەم هات و بە دەنگێکی بەرز قیژاندی و بەهێزەوە قژی ڕاکێشام و زللەیەکی وا توندی لێدام ئیتر هیچم نەبیست ، دوای ئەوە ئیتر بێبەش کرام لە زۆر شت ... تەواونەکردنی زانکۆ و نەچوونە دەرەوە تەنها بۆ کـاری زۆر پێویـست نـەبێت لـە گـەڵ خوشـکەکانمدا .. مۆبایـل و ئەنتەرنێتەکـەی لـێ سـەندمەوە .. هـەتا سـەردانی کـچانی هاوڕێـشم قەدەغەبوو مەگەر لە گەڵ خوشکە گەورەکەمدا .

لـە زۆر شـت بێبـەش کـرام ، مـن ئێـستا تەمـەنم بیـست و یـەك ساڵە براکـەم ناهـەقی نیـە وایـە بەرامبـەرم ، مـن تـەنها لۆمـەی خـۆم دەکـەم ، ناپاکیم لەو متمانەیە کرد کەسوکارم بە منیـان دابـوو ، مـن شـایانی ئـەو متمانەیە نەبووم .. چونکە بوومە هۆی سەرشۆڕکردنی خۆم و ئـەوانیش ... بۆیە شایانی هەموو شتێکم کە پێم دەکەن ،

تـەنها دەڵـێم : نـەفرەتی خـوا لـەو ئەنتەرنێتـەی کـە هۆکـارە بـۆ سەرپێچیکردن لـە خـوای گـەورە و هۆکاری ئـەو مەینەتیـەی مـن بـوو ، ئامۆژگـاری هـەموو کـچێك دەکـەم کـە ئەنتـەرنێت لـە شـتی بەسـوودا بەکاربهێنن و دوور کەونەوە لە شتە خراپەکانی .

وە بێ هودە نەگەڕێت پیایـدا چونکە لـە کۆتاییـدا دەبیتـە قوربـانی کەسـێك کـە ڕەحمـت پـێ ناکـات و بـەزەیی پیاتـا نایەتـەوە ... بـەڵکو بـە

سوکی و نزمی تەماشات دەکات ... دەی ئێوەش پەند و ئامۆژگاری لە منەوە وەرگرن

﴿ لە کتێبی (ضحايا الانترنت) وەرگیراوە﴾

# بەڵێنە درۆینەکان

چیرۆکی ئەم کچە کاتێك دەستی پێکرد کە کەوتە ناو جیهانی دەریای ئەنتەرنێتەوە ، کە سات لە دوای سات و رۆژ لە دوای رۆژ لە سەر ئەنتەرنێت بوو ، کاتێ دەچووە ژووری چاتەوە و قسەی دەکرد لە گەڵ کوران و کچانی لاودا ، بیرۆکەیەکە خۆش بوو بەلایەوە، ئەمیان لە کەنەدا و ئەویان لە کەنداو و ئەوی تریان لەوبەڕی باکوور ، وای گۆمان دەبرد کە هەموو شتە بەسوودەکانی جیهانی کۆکردۆتەوە و فێری هەموو زمانەکانی جیهان دەبێت ، لێرەو لەوێ قسەی لەگەڵ کوڕاندا دەکرد و هەر یەکەیان خاوەنی رۆشنبیری و کەلەپورێکی جیاواز بوون ، ئەویش لە ژووری چات و ماسنجەردا شەکەت بووبوو ، ئاشنا بووبوو بە کوڕێك وەك کوڕانی تر ، بەڵام ئەو کوڕە سەرسامی خۆی دەربڕی بوو بەرامبەر بەم ، و هاوڕێیەتیەکەیان درێژەی کێشا بوو.. لە سەرەتادا پەیوەندیەکی شەریفانە بوو ، پاشان بوو بە هاوڕێیەتیەکی پاك و پاشان بەرەو سەرسام بوون و پاشان کەوتە داوێکەوە کە ناوی خۆشەویستیە ، نەیزانی چۆن کەوتە ناویەوە ، دوای ئەوەی وا گومانی دەبرد کە پارێزراوە و زەفەری پێنابرێت... بە باشی راهاتبوو لە سەر هونەری چاتکردن... بەڵام چار چیە کار لە کار ترازا ، ئەو لاوە و ئەم بوونە ئەویندراری یەکتر ، زۆربەی کاتەکانیان بە یەکەوە بەسەر دەبرد ، لە چەند سەعاتێکەوە بۆ چەند رۆژێك و بۆ چەند مانگێك و بۆ چەند ساڵێك ، بەسەرهاتێکی مەزنی خۆشەویستی کەوتە نێوانیانەوە، تا رێکەوتن لە سەر هاوسەرگیری ، دوای پێداگرتنێکی زۆر لە لایەن ئافرەتەکەوە ،

بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو کوڕەکە لەوپەڕی باکوری گۆی زەوی دەژیا و ئەمیش لەمپەڕی باشوور .

لە نێوانیاندا حەوت دەریای فراوانی قوڵ هەیە ، ئەی چۆن بە یەك بگەن و چۆن یەکتری ببینن ؟ دوای ئەوەی بەڵێنی پێدا بە زەواج کچەکەش تەواو متمانەی بە قسەکانی هەبوو ، کوڕەکە دانی نا بە شتێکدا کە تەواو کچەکەی هێنایە لەرزین و هەرەس هێنان ، هەستی بە بچووکی و لاوازی خۆی دەکرد ، دانی بەوەدا نا بۆ کچەکە کە ناتوانێ لە دەریادا مەلە بکات و چاوەڕوانی دەکات و دەیەوێت پەیوەندیەکەیان بەو شێوەیە بێت تا چارەنووسیان دەگۆڕێت و ڕووداوی سروشتی ڕوودەدات و ئەو دەریایە لە نێوانیاندا نامێنێت .

لە سەرەتادا وای زانی گاڵتە دەکات ، بەڵام کوڕەکە بەراستی بوو .. پێ وت : من خۆشم دەوێیت بەڵام چارە چیە ؟ئەگەر دەتوانیت دەریاکان ببڕیت، ئەوەمن چاوەڕوانی تۆم.. کچەکەش وتی: ئەی ئەو کەسەی ئابڕوی منت بۆ دەرکەوت و هەموو نهێنیەکانی منت زانی، بۆچی لە سەرەتادا دانت بەوەدا نەنا کە مەلە نازنیت ، بۆچی بەو شێوەیە چەندین ساڵە منت تەمادار کردووە و منیش چاوەڕوانی بینینتم، تۆ هانم دەدەیت بەردەوام لەسەر خۆش ویستنت ، فرسەتت لە دەستدام لە کەسانی تر بیر بکەمەوە ، وامزانی مرۆڤیت !! بەڵام گورگێکی دڕندەیت ..خوایە گیان کۆمەك و هاوکاریم بکەیت وتەنها پشت بە تۆ دەبەستم .. هیچی لە دەستەڵاتا نەبوو تەنها ئەوە نەبێت فرمێسك بڕێژێت بۆ ئەو کات و تەمەنەی کە فەوتاندی لە پەیوەندیەکدا کە شەیتان ڕازاندبوویەوە و هەڵی خەڵەتاندبوو تا بەردەوام بێت لە سەری .

وه‌لآمی ئه‌و ئه‌وه‌ بوو كه‌ خۆشی ئه‌ویت به‌لآم هه‌ر له‌سه‌ره‌تاوه‌ جه‌ختی له‌ سه‌ر به‌لێنه‌كه‌ی نه‌كردبوویه‌وه‌ ومادام ئه‌م هه‌ر سووره‌ له‌سه‌ر زه‌واج، پێویسته‌ چاوه‌روان بێ تا به‌زه‌ییه‌ك بێت بۆی .

ئه‌و لاوه‌ هۆكارێكی رابواردن بوو له‌رێی چاته‌وه‌ ...وه‌ فه‌وتاندنی كات و قسه‌ی هه‌نگویناوی و وای نیشاندابوو كه‌ خۆشی ده‌وێت و به‌لێنی پێدا بوو به‌لێنێك كه‌ به‌ زه‌واج نایه‌ته‌دی .. ئه‌ویش بڕوای به‌ قسه‌ هه‌نگویناویه‌كانی و ئاوازه‌ درۆزنه‌كانی كردبوو

له‌ كتێبی (ضحايا الانترنيت)

# ئەو ژوورانەی ژیانی ویران کردم

رووخساری وورد بوو ، بەلآم شێواو و کەم قسە بوو... لە خێزانێکی راقی بوو ،هەموان رەخنەیان لێ دەگرت کە گۆشەگیر و تەنهایە ، ئەم کچە هاوڕێیەکەی نوێمان بوو ، منیش حەزم دەکرد دەری بێنم لەو گۆشەگیریە و جارێکیان بە باسکردنی هەندێ شت و جارێکی تر بە پێشکەشکردنی هەندێ خواردن ، دەمویست بچمە ناخیەوە و بەلآم هەموو جارێك هەستم دەکرد بەربەستێ هەیە و رێگای ئەوەم لێدەگرێت ، ئاشنا بووم بە هەندێکی ، دایك و باوکی رۆشنبیریەکی بەرزیان هەبوو... مامۆستای زانکۆن و ئەمیش تازە خوێندنی تەواو کردووە و شووی کردووە و چاوەڕوانی رووداوێکی خۆشە ، هەموو ئەو شتانەی بۆی باس کردم ئەوە ناگەیەنن لە خەمۆکی و گۆشەگیری کە ئەمی تێدایە ،، رۆژێکیان بینیم لەبەردەرگای ژوورەکەمدا و رێك وەستاوە و ناجولێت ، منیش بە خۆشیەوە هەستامەوە لەبەری و بە سەرسامیەوە تەماشای دەکردم : ئەوە چیە .وتم: ئەوە کۆمپیوتەرە کە کاری لەسەر دەکەم.. تۆ باش دەزانیت کە ئەمە هۆکاری سەردەمەو وە من هەرگیز بێتاقەت نابم لێی...لە ماڵەوە و لەسەر کارەکەم لەگەڵمدایە .

وتی : ئەووی لەماڵەوەیە چی پێدەکەیت ، ئایا کاری ئێرەی پێ تەواو دەکەیت ؟ وتم: نەخێر ، بەلآم دەیکەمەوە تا ئاگام لە هەواڵ و بارودۆخی خەڵکی بێت لە رێی ئەنتەرنێتەوە ، لە پڕ بینیم شڵەژاو و تێك چوو ، پاشان بە تاسەوە وتی : سوێندت ئەدەم نەکەی من تۆم خۆش دەوێت و ئەم ئامێرە وێرانکەرە هەرەس بەخاوەنەکەی دێنێت ، سەرسام بووم لە قسەکانی ، و ترسەکەیم هێمن کردەوە و داوام لێکرد کە ئەڕۆم ، حەزم

دەکرد ستایشی ئەو جەخت کردنەی بکەم ، بەلاّم بێدەنگ بووم و سووربووم لە سەر کاری خۆم و وازم لێهێنا و دەمپرسی بۆچی ئەم ئامێرە وێرانکەرە و وە هەر ئەم ئامێرەیە کاروباری رۆژانەی خۆمانی پێ رایی دەکەین

بۆ رۆژی دوایی چووم بۆلای و سووربووم لەسەر زانینی هۆکارەکەی، سلاّوم کرد وئەویش تەنها وەلاّمی دایەوە و پاشان تکام لێکرد و دوایی لە پڕ پێم وت: بۆچی وا وەسفی کۆمپیوتەر دەکەیت کە ئامێرێکی وێرانکەرە و خاوەنەکەی دەڕوخێنێت ؟

بە تێروانینێکی پشکنینانەوە تەماشای کردم و پاشان وتی : ئایا دەچیتە لاپەڕی ماڵەوە ؟ وتم: بێگومان... لێوەکانی گوشی و روخساری کرژ کرد ، پاشان چەند وتەیەکی لە ژێر لێوەوە وت : کە لێی تێنەگەیشتم ، بەلاّم بۆنی هەڵچوونیان لێدەهات .

بە سۆز و بەزەییەوە تەماشای کردم و وتی : خوشکی بەڕێزم ئایا ئامۆژگاری لەخوشکێکەوە وەردەگریت کەخۆشی دەوێیت ، ئەو لاپەڕەیە رۆژێ لە رۆژان بیر و هۆشی منی داگیر کردبوو ، ژووری وتوێژەکان گرنگترین شت بوو بەلای منەوە کە لەوێوە ئاشنا بووم بە لاوێك کە بە قسەی زۆر رایکێشام بۆ لای خۆی، تا کار بەوە گەیشت بانگی کردم بۆ ژوورێکی تایبەت ، تا پرسیاری تایبەتم لێبکات ومنیش پرسیاری لێبکەم ، پەیوەندی نێوانمان زیادی کرد ، هەر یەکەمان بووین بە ئاوێنەی یەکتری ، هەرچەندە ئەو منی نەبینی بوو ، منیش ئەوم نەبینیبوو .

بەداخەوە باسی ئەو پەیوەندیەم لە گەڵ باوکمدا نەکردەوە و من بەردەوام دادەنیشتم لە گەڵیدا ، سەیر لەوەدا بوو کە ئەوان پرسیاریان

لەمن نەدەکرد : ئایا ئەمە هەڵەیە لەوانەوە یان هەڵەیە لە منەوە ؟ نازانم؟ بە هەرحاڵ پەیوەندیەکە پەرەی سەند، داوای لێکردم کە یەکتری ببینین.

بێگومان بە هیچ شێوەیە نەدەهات بە خەیاڵمدا کە پەیوەندیەکە بەو شێوە مەترسیدارە گەشەبکات و دڵنیای کردم کە بینینەکە لە شوێنی گشتیدا دەبێت و ، هەتا بمبینێت وەك چۆن لە مێشکیدا وێنەی کێشاوم ، دوای دوو دڵی رازی بووم و بینیم ، هەناسەیەکی هەڵکێشا و پاشان بەردەوام بوو .

کاتێ بینیمی وتی : وەك خۆی وای، چۆن لە ناخمدا وێنەم کێشابووی... دانیشت و وتی : لە دایك بووین تا بۆ یەکتر بین.. من دەمەوێ ببیتە ژنی من .

وتم : بەڵام هێشتا خوێندنم تەواو نەکردووە... وتی: قەیناکا ، دوای تەواوکردنی خوێندن زەواج دەکەین ، بەتایبەتی چەند مانگێکی نەماوە بۆ کۆتایی ساڵ.. خۆمان حازر کرد بۆ زەواج .

چۆن رازی کردم بە بیرۆکەی خۆی، نازانم ، باسەکەم لەگەڵ دایکمدا کردەوە: برایەکی کچێکی هاوڕێم دەیەوێت بێتە داوام .. بە ڕاستی شتەکەم پێنەوتن ، وە باسی رەوشتی باشی ئەوم کرد .

بووینە هاوسەری یەکتری ،خۆزگە نەبووینایە ، لە راقیترین ئوتێلدا... کەسێکی سەخی و دەست باوبوو لە کرینی جلی بوکێنی و دیاریەکاندا و ئامادەکردنی جیازی ، منی برد بۆ ئەو وڵاتەی کاری لێدەکرد ، زۆر بە ناسکی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردم و بەغیلیم بە خۆم دەبرد ، بەڵام دەروونم شتێکی تری پێدەووتم ، وردە وردە زۆری لێکردم کارێك بکەم هەتا هەست بە تەنیایی نەکەم... بۆیە بۆکارکردن چوومە دەرەوە ، کۆمپانیاکە بۆ جاری دووەم داوای لێکردم کار بکەم لە

لایـان.. منـیش سەرسـام بـووم بەهانـدانی مێردەکـەم ، بـەو بەهانـەی دەیهێنایەوە کە ئەوان متمانەیان بەکاری من هەیە و پێویستە لە نیازی باشی ئەواندا بم... رۆژانە کارم دەکرد لە بەیانیەوە بۆ ئێوارە ، چەند رۆژێـك تێپـەڕی بەسـەرمدا و بـە چـالاکی و لێبڕاوانـە کـارم دەکـرد ، رۆژێکیان زۆر هەستم بەماندوێتی دەکرد و داوام لێکردن مۆڵەتم بەن ، وەك نـەریتێکی ئاسـایی مێردەکـەم بـەیانیان دەیگەیاندمـە سـەرکار و ئێوارەش دەگەڕایەوە تا بماتەوە .. بەهەرحاڵ ئۆتۆمبیلێکی کرێم گرت و گەڕامـەوە بۆ ماڵـەوە و ویستم دەرگاکە بکەمەوەبە کلیلـەك ، کەچـی داخرابوو... لە دەرگاکەمیا و پاش ماوەیەك دەرگاکە کرایەوە ، شڵەژاو دیـاربوو ، هۆکـاری داخـستنی دەرگاکـەم لێپرسـی رایـدەکرد لـە وەڵامدانـەوە... چـوومە ژووری نوستنەوە پۆشاکێکی خـەوتنم لـە سـەر زەویەکە بینی... گرنگیم پێنەدا بەهۆی ماندووبونـەوە.. بـە قوڵی خـەوم لێکـەوت ... دوای حەوانـەوە رووداوەکـانم هاتـەوە یـاد و وەسوەسـە کەوتـە دڵمـەوە، پرسیاری هیچم لێنـەکرد و وام نیشاندا کە گـرنگ نیـە بەلامەوە ..سوور بووم لە سەر ئەوەی بمبـات بۆ لای پزیشك بۆپشکنین پزیـشکەکە مـژدەی پێـداین کـە رووداوێکـی خـۆش لەپیـشە ، بینـیم مێردەکـەم رووخساری گـرژ کـرد و بـە پێـچەوانەی ئـەو مێردانـەی بـۆ منـداڵی یەکـەم هەلهەلـە دەکێشن .... دیاربوو بـەلای ئـەوەوە ئـەو کاتـە گونجـاو نـەبوو... دوای چـەند رۆژێـك ئـازار لـێم نەدەبوویـەوە و بۆیـە مۆڵەتم وەرگرت و گەڕامەوە ماڵـەوە ، کاتێ گەڕامـەوە بۆ ماڵـەوە شـتێکم بینی سەری منداڵیشی سپی دەکرد ... ئای لـەو کارەساتە، چیم بینـی، وەستام تـا مێردەکـەم ببینـم لـە گـەڵ ئافرەتیکی سۆزانیدا.. هـەردوکیان نیمـچە رووت بـوون ... فرمێـسك هـەناوی گرتبـووم ، هـەوڵی زۆرم یـا

بیشارمەوە .. ئافرەتەکە سەری دەشاردەوە ، ئەویش بە هەردوو دەستی پاڵپشتی دەکرد ...... ماوەیەك بێدەنگ بووم.. پاشان تەماشام کردن ، هەردووکیانم بینی ،خۆزگە لە ژووری نوستنی خۆمدا نەمبینینایە ، و لە سەر نوێن و جێگای خۆم ، زەوی تەسك بووبوویەوە لەبەرچاوم و هەناسەم سوار بوو لە تاو ئەو دیمەنەی کە بینیبووم ، هیچ قسەیەکم نەکرد.. لە دەرەوە وەستام هەتا سۆزانیەکە چووە دەرەوە ، کەلوپەلی خۆمم هەڵگرت و کۆم کردەوە و مێردەکەشم یەك قسەی نەکرد.. بە یەکەمین فرۆکە گەڕامەوە بۆ لای کەسوکاری خۆم ، من قوربانی ئەو ئامێرە نەفرەت لێکراوەبووم ، کە یاری بە ژیانی خەڵکی دەکات و هەڕەشە لە ئایندەیان دەکات .

لە کتێبی ( ضحایا الانترنیت ) وەرگیراوە

# کچه یاریزانی کاراتی

له نیل له سەر کۆشکی ( بەنها ) ی بەرز پلانیان دانا تا رزگاریان بێت لەو منداڵەی کە چەند سەعاتێکە لە دایك بووە ، بۆیە فرێیان دایە نیلەوە ، بەڵام تاوانەکەیان لەو سنوورەدا نەوەستا ، بەڵکو زەنجیرەیەکی تر لە تۆمەت لەنێوانیاندا دەستی پێکرد ، چونکە ئەومنداڵە بێتاوانە لەم دنیای ئێمەدا نەژیا تەنها تەمەنێکی کورت نەبێت کە بە خولەك دەژمێردرێت .

دادگا بە پەلە راهێنەری کاراتیەکە و یەکێ لەو کچانەی لەو تیپەدا یاری دەکرد دەستگیر کرد و هەردووکیان کەوتنە دەستی پۆلیس ، لە دان پیانانەکاندا نهێنی پەیوەندیەکانیان دەرکەوت کە کەوتبووە نێوان راهێنەرەکە و ئەو کچەوە... تاوەکو سکی بووبوو لێ، پاشان لە بەشی پۆلیس زەواجیان کردبوو، وە پاش دوو سەعات لە زەواجەکەیان رزگاریان بووبوو لە کورەکەیان و کوشتیان !

تاوانەکە لە پارێزگای ( المنوفیە) روویدا ، بەڵام بۆچی ئەو دایك و باوکە پەنایان بردە بەر کوشتنی منداڵەکە، هەرچەند هەڵەکەی خۆیان بە زەواج راستکردبوویەوە ، وە چۆن دادگا راستی بۆدەرکەوت لەکاتێکدا لە کاتی روودانی رووداوەکە کەس پێی نەزانیبوون .

( القناە) لە هەموو لایەکەوە لێکۆلینەوەی لەرووداوەکە کردبوو وە درێژەی رووداوە سەیرەکەی پێشکەش کردبوو.. لە بنکەی (برکە السبع ) ئەنجام درابوو ..

کرداری نەشتەرگەریەکە لە نەخۆشخانەی ( برکە السبع ) بوو ...وشەی کۆتایی بەشی یەکەمی ئەو تاوانە بێ وێنەیە ( نهاد ) بوو لە

گەڵ ڕاهێنەرە کاراتیەکەیدا ، بە شێوەیەك ڕاهێنەری کاراتی لە یانەیەك لە شاری ( برکە السبع ) کە ئەم کچە هەموو متمانەیەکی پێدا بوو وە نموونەی بەرز و پێشەنگ بوو بۆ کچانی هاوڕێی و هاوتەمەنی کە لە تەمەنی ئەمدا بوون و حەزیان لە یاری کاراتی بوو ، ئەو پیاوە بە قسە هەنگوینیەکانی هەڵی خەڵەتاند و وبەسەرەنجە بەهێز و بەردەوامەکانی دەورەی دابوو، هەتا شکستی پێ هێنا و ئەو تاوانە نەگریسەی خۆی پێ ئەنجام دا و کچێنی لە دەستدا و بوو بە سەرەتای مەینەتیەکەی ..

هەروەکو ئەوە وشەی کۆتایی بوو لە تاوانی ڕاهێنەری کاراتی لە نەخۆشخانەی ( برکە السبع ) هەر لەوێ و هەر لە ژووری نەشتەرگەری لە نەخۆشخانەکە وشەی سەرەتا بۆ تاوانێکی تری زۆر سەختتر و نارەحەتتر بوو... ( نهاد ) بوو بە کەسێکی تاونبار و ڕەسەن لە تاواندا، بەڵکو بوو بە کەسێکی بکوژ ، خۆی ڕزگار کرد لە ئازیزترین شت کە هەی بوو !

سەرەتای ئەو تاوانەی نهاد ئەوە بوو سوور بوو لە سەر ئەوەی بیشارێتەوە لە نەخۆشخانەی (برکە السبع) دەرکەوت کاتێك کە نهاد چوو بۆ نەخۆشخانە توشی سك ئێشەیەکی سەخت بوو ، نەیدەزانی کە ئەوە ئازاری سك دانانەکەیەتی ، وە کاتی لە دایك بوونی منداڵەکەی نزیك بووەتەوە ، سەرسام بوو کاتێ پزیشکەکە بە هاوکارەکانی وت : ژووری نەشتەرگەری ئامادەبکەن ،چونکە کاتی لە دایکك بوونی ئەو کۆرپە یاریزانە کاراتیە بچوکە هاتوە ، ترس و دڵەڕاوکێ نیهادی داگرت و دەستی کرد بە گریان ، بێتاقەت بوو لە قسەی پزیشکەکە بەتایبەتی کە دڵنیای کرد کرداری لە دایك بوونەکە سەختە و پێویستی بە نەشتەرگەری گەورە هەیە .

دنیا لە بەر چاوی ئەم کچە کاراتیەدا دەسوڕایەوە ، خوازیار بوو زەوی شەق ببات و و قوتی بدات و رزگاری بێت لەو حەیا چوونە و فەزاحەتە کە چاوەڕوانی دەکات ، ساتی منداڵبوونەکە نزیك بوویەوە بەڵام هەموو هەوڵەکانی شکستیان هێنا ، نیهاد ی یاریزانی کاراتی کە تەمەنی هەژدە ساڵی تێنەپەڕاندبوو دەگریا و بیری لە ئایندەی نادیاری خۆی دەکردەوە کاتیَ بە تاوانەکەی زانی ، کچەکە بیری لەوە دەکردەوە رابکات و لە نەخۆشخانە و لەو ژیانە رزگاری بێت وخۆی بخاتە بەر شەمەندەفەری سەر هێڵە ئاسنینەکە تا خۆی و کۆرپەکەی کە بە داوێن پیسی سکی بووبوو پارچە پارچە ببن ، یان خۆی بخاتە رووباری نیلەوە تا کۆتایی بە ژیانی بێنێت و ئەو حەیا چوونەی لەگەڵ خۆیدا بمرێنێت... بەڵام شکستی هێنا لە راکردنەکە ، کاتیَ پەرەستارەکانی نەخۆشخانەکە رێگایان لێگرت ئیتر بە هیچ شێوەیەك قسەی نەدەکرد و بەردەوام بێدەنگ بوو، چاوەکانیشی فرمێسکیان دەڕشت... ئەو ئێستا رادەکات لەو کارەساتەی چاوەڕوانیەتی .

وەڵامی هیچ پرسیارێکی پزیشکەکان و پەرەستارەکانی نەدەدایەوە و حەزی نەدەکرد ناوی خۆیشی بەهیچ شێوەیەك بێتەوە یادی یان بیلێت بۆ پڕکردنەوەی فایلی چوونە نەخۆشخانەکەوە، تاوەکو باوکی یان یەکێ لە خزمانی نەزانن لەنەخۆشخانەیە .

لە گەڵ پێداگرتنی نیهاد و ناونەهێنانی خۆی یان ناو نیشانی خێزانەکەی بۆ پرکردنەوەی فایلی چوونە ناو نەخۆشخانەکە لەبەر ئەوەی بەرپرسیاریەتی گەورە لەسەر بەرێوەبەرایەتی نەخۆشخانەکەیە ئەگەر ئەو زانیاریانەی مانەوە لە نەخۆشخانەکە بەتەواوی پڕ نەکرێتەوە.

بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی (برکە السبع) ناچار موقەددەم حسێن سابق ئاگادار دەکات کە سەرۆکی لێکۆڵینەوەی بنکەی پۆلیسی برکە السبع بوو کە کچێکی تەمەن حەڤدە ساڵ لە حاڵەتی منداڵ بووندایە و پێویستی بە نەشتەرگەری گەورە هەیە و بە هۆی نالەباری سکەکەیەوە و نایەوێت ناوی خۆی و ناونیشانی خێزانەکەی بڵێت تا هەواڵیان پێبدەن کە ئەم گەشتووەتە نەخۆشخانە و بۆ پڕکردنەوەی فایلی مانەوە لە نەخۆشخانە... بەپەلە لیوای بەڕێوەبەر بە فەرمانی ئاسایشی (المنوفیە) دا کە سەرۆکی لێکۆڵینەوەکانە بڕیاریدا بڕوات بۆ نەخۆشخانە، لەنەخۆشخانە قسە وباس کەوتە نێوان سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان و کچەکەوە ...کچەکە هەوڵی دەدا خۆی بگرێت و قسە نەکات وناوی خۆی نەڵێت لە سەرەتادا بە ئەفسەرەکە بەڵام ئەوەندەی نەبرد کە وتی نیهادم ناوە، تەمەنم هەژدە ساڵە و خەڵکی یەکێ لە گوندەکانی (برکە السبع)م .

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان لێی پرسی بۆچی سووریت لە سەر ئەوەی ناوی خۆت ئاشکرا نەکەیت ؟

وتی : تا مێردەکەم نەزانێت کە من ماڵەکەیم بەجێهێشتووە بە هۆی ئەوەی کە بەردەوام لێم دەدات .

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان بۆ پشت ڕاستکردنەوە جارێکی تر لێی پرسیەوە ، ناوی مێردەکەت چیە ؟

نیهاد بە پەلە وتی : مێردەکەم سەفەری کردووە بۆ دەرەوە و ناوی (هانی) یە

پێش ئەوەی سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان کۆتایی بە قسەکانی بێنێت لە گەڵیدا... نیهاد ئازاری سکەکەی زۆر بە سەختی بۆ هات و بۆیە بردیان

بـۆ ژووری نەشـتەرگەری ، دوای ئـەوەی زانیـاری تـەواوی وەرگـیراو و فایلەکـەی پـڕ کرایـەوە ، دوای مانـەوەی نیهـاد بـۆ مـاوەی سـەعاتێك لـە ژووری نەشتەرگەری لە سەر نەقالە هێنایانـە دەرەوە و کۆرپـە ساواکەی لـە پاڵیـدا بـوو : نـاوی خالیـدی بـۆ هەڵبـژاردبوو ، بـەڵام دوای لـە دایـك بوونی، ئافرەتەکـە پـێش ئـەوەی چارەسـەری تـەواو وەربگرێـت لـە گـەڵ منداڵـە شـیرەخۆرەکەیدا هاتنـە دەرەوە لـە نەخۆشـخانە، بـە بـێ ئـەوەی پزیـشك بڕیـاری چـوونە دەرەوەیـان بـدات یـان ئیـدارەی نەخۆشـخانە ئاگـادار بکـات کـە زانیبـووی دیـار نـەماوە و دەڕواتـەوە بـۆ نـاو خێزانـی خۆی .

مەینەتیەکانی نیهاد کۆتاییان نەهات بەڵکو سەرەتای راستەقینەی بوو ، چونکە لە نەخۆشخانە چوونە دەرەوە و کوڕەکەی بە باوەشەوە بوو کە بە داوێن پیسی بووبووی ونەیدەزانی بۆ کوێ بچێت و ئەومنداڵە بچوکە چی لێبکات .

سـەعات دەوروبـەری حـەوتی ئێـوارە بـوو، نیهـاد لـە باخـچەی ئـەو یانەیـەدا دانیـشت کـە سـەرەتای مەینەتباریەکـەی لـەوێوە دەسـتی پێکردبوو ، بیری لە ئایندەی نادیاری دەکردەوە ، و چی بکـات و چـەند سـەعاتێکی درێـژ بـە خێرایـی تێپـەڕین و فرمێـسکەکانی نیهـاد لـە چاوانیەوە دەبـارین و روومـەتی دەشـت و نەگەیـشتە چارەسـەرێ یـان بڕیارێ سەبارەت بە مەینەتیەکـەی ، هـیچ رێگایـەکی لـە بەردەمـدا نـەبوو تـەنها یـەك چارەسـەر نـەبێت.. هەرچـەندە سـەختیش بـوو ، بـەڵام تاکـە بڕیاری بوو ، ئەویش پەنا بردنە بەر فەرمانگەی پۆلیس ، بۆ پاراسـتنی مافی خۆی و گەڕان بە دوای چارەسەردا .

میلی سەعاتەکە کەمێك لە نیوە شەو لایدابوو ، بەشی پۆلیسی (برکە السبع) هێمنیەکی تەواو دایپۆشی بوو ،جموجوڵ زۆر کەم بوو ، سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان لە نوسینەگەکەیدا بوو لەرێگای هاوکارەکانیەوە موتابەعەی حاڵەتی ئەمنی سەرتاسەری بنکەکەی دەکرد ، لە پڕ هەواڵنێر پێی وت : کە ئافرەتێك بە منداڵێکی بچوکەوە زۆر بە سەختی دەگری و دەیەوێت بتبینێت ، کاتێك ئافرەتەکە چووە نوسینگەکەوە سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان سەرسام بوو کاتێ بینی هەمان ئەو کچەیە پێش چەند سەعاتێك لە نەخۆشخانە هەواڵیان پێداوە کە بەبێ مۆڵەت لە ئیدارەی نەخۆشخانە یان رێگاپێدان بۆ چوونە دەرەوە .چووەتە دەرەوە ..

ئەفسەرەکە هەستی کرد کە نهێنیەکی گەورە و ئازاراوی لە پشت ئەم ئافرەتەوە هەیە کە تازە بووە بە دایك ، بە تایبەتی کە زۆر بە سەختی دەگری و و داوای لێکرد هێمن بێتەوە و خۆڕاگر بێت هەتا کێشەکەی باس بکات ....... ئەو وتووێژە لەنێوانیاندا روویدا .

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان : بۆچی نەخۆشخانەت بە جێ هێشت بە بێ ئەوەی پزیشك رێگات بدات بە تایبەتی تۆ منداڵەکەت بە رێگای نەشتەرگەری گەورەوە بووە ؟

ئافرەتەکە کە یاریزانی کاراتی بوو دوای بێدەنگیەکی درێژ : بۆ راکردن لە حەیا چوون !

سەرۆکی لێکۆڵینەوکان : بەسەرهاتی تۆ چیە ؟ ئەو حەیا چوونە چیە دەتەوێت رابکەیت لێی ؟

ئافرەتەکە : ناوم نیهادە و حەمدە سالم و دیبلۆمم هەیە لە ئامادەیی کشتوکاڵیدا و باوکم فەرمانبەرە ، حەزم لە یاری کاراتی بوو، لەبەر ئەوە

پەیوەندیم کرد بە سەنتەری لاوانی (برکە السبع) بۆ مەشق کردن و لەوێدا کارەساتەکە دەستی پێکرد .

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان : چۆن ؟

ئافرەتەکە : لەوێ راهێنەری کاراتیەکەم ناسی کە ناوی ئەشرەف بوو تەمەن بیست و هەشت ساڵ بوو کە بەردەوام تەماشای دەکردم و قسەی شیرینی بۆ دەکردم و هەتا زاڵ بوو بە سەر دڵ و هەستمدا و وام لێهات نەمدەتوانی لێی دووربکەومەوە ، خەڵەتاندمی و وای نیشاندا لە ئایندەدا دەمخوازێت، منیش باوەڕم پێکرد ، هەتا هەموو توانایەکی منی زەوت کرد ، و هەستا بە دەست درێژیکردنە سەرم ...وههەستم بە خۆم نەکرد دوای ئەوە نەبێت کە هەموو شتێکم لە دەستدا بە هەتککردنی بەهاترین شتێ کە ئافرەتی نمونەیی هەیەتی .

سەرۆکی لێکوڵینەوەکان : چۆن و لە کوێ ئەمە روویدا ؟

ئافرەتەکە : هەموو ژوانەکان لە باخچەی نزیکی یانەکە ئەنجام دەدرا ، کە سەر لە ئێوارە چۆڵ دەبوو کەسی تێدا نەدەما و پەیوەندیەکانمان بەو شێوەیە چەند رۆژێك و پاشان چەند مانگێك درێژەی کێشا هەتا هەستم کرد  بە ئازارکردن لە سکمدا ، کاتێ چووم بۆ لای پزیشك هەواڵی ئەو کارەساتەی پێدام ، ئیتر دڵنیا بووم کە سکم هەیە و چاوەڕوانی منداڵم دەکرد .

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان :  دوای ئەوە چیت کرد ؟ ئایا ئەوەت بە راهێنەرەکەت ؟

ئافرەتەکە : بەڵێ، بەڵام رایکرد لێم و هەموو بەرپرسیاریەتێکی تەواوی خستە سەر شانی من ، وە رازی نەدەبوو کۆمەکیم بکات ،

داوای لێکردم بچمەوە لای پزیشك تا رزگارم بێت لەو حەیاچوونە، وە پەشیمان بوویەوە لەو بەڵێنانەی کە پێیدابووم کە گوایە دەمخوازێت .

ساتانێك لە بێدەنگی..... پاشان سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان لێی پرسی : بۆچی لەو کاتەدا شکاتت لێنەکرد ؟

ئافرەتەکە (فرمێسکیشی بە چاواندا دەهاتە خوارەوە) وتی : لەوکاتەدا ترس دایگرتبووم کە خێزانەکەم بەم فەزیحەتە بزانن و تۆڵەم لێبکەنەوە ،

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان : ئایا خێزانەکەت هێشتا بەمەیان نەزانیوە؟

ئافرەتەکە : نەخێر ، چونکە کاتێ پزیشکەکە وتی تۆ سکت هەیە ماڵم بە جێهێشت و رۆشتم لە ماڵی نەنکمدا بژیم لە شاری ( حفطا ) لەوکاتەدا پشتێنی پەستێنەرەم بەکاردەهێنا هەتا کەس هەستم پێنەکات کە سکم گەورەیە .

ئافرەتەکە تکا و داوای لە ئەفسەرەکە کرد کۆمەکی بکات و مافی خۆی و مافی منداڵە شیرە خۆرەکەی بۆ بسەنێتەوە لەو راهێنەرە تاوانبارە .

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکانی بنکەی پۆلیسی (برکە السبع) داوای لەکچەکە کرد بمێنێتەوە لە بنکەکە هەتا ئەشرەف دێنێت و چارەسەری هەڵەکەی دەکات . ئەشرەف هات و هەر کە نیهادی بینی بە منداڵێکی شیرە خۆرەوە دەرکی بەوە کرد کە ئەو خەبەری لێداوە و نەیتوانی هیچ بکات ئەوە نەبێت دان بنێت کە ئەم باوکی ئەو منداڵەیە کە نیهاد بە باوەشیەوەیە و بە داوێن پیسی بوویانە ، نکۆڵی نەکرد ، بەڵکو دانی نا بە تاوانەکەیدا و ئامادەیی خۆی نیشاندا کە مارەی بکات و ئەو هەڵەیە

راست بکاتەوە ، کاتێ کەزانی بەندینخانە چاوەڕوانی دەکات ئەگەر مارەی نەکات .

مەلا هات و نیهادی یاریزانی کاراتی مارە کرا لە ئەشرەفی راهێنەری لە بنکەی پۆلیس ، سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان و دایکی یەکێ لە جێگرەکان شایەت بوون لەو عەقدی زەواجەدا کە دایکی راهێنەری کاراتی پیرۆزبایی لێکردن و کوڕەزاکەی هەڵگرت و دڵخۆش بوو پێی، ژن و مێردەکە دوای مارەبڕینیان چوونە دەرەوە .

سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان گومانی وابوو کە تاوانەکە کۆتایی هات و نەدەهات بە خەیاڵیدا کە تاوانێکی زۆر لەوە گەورەتر لەلایەن ئەو ژن و مێردەوە رووبدات .

شەیتان لە گەڵ ئەو دوانەدا بوو کاتێ بەتەنها بوون لە باخچەکەدا و منداڵەکەشیان پێ بوو کاتێ کەهاتنە دەرەوە لە بنکەی پۆلیس ، شتێکی هاوبەش بە مێشکی هەردووکیاندا دەسوڕایەوە... ( نهاد ) بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن بەرەو رووی خێزانەکەی بێتەوە بەم منداڵە داوێن پیسەوە و زەواجێك کە نەیان زانیوە و (ئەشرەف)یش ئەویش بیری لەوە دەکردەوە چۆن بەرەو رووی ژنەکەی و خزم و کەس و کاری بێتەوە بەم منداڵەوە .. ژن و مێردەکە دانیشتن و بیریان لەو کارە دەکردەوە هەتا گەیشتنە بڕیارێك و رێکەوتن لە سەر تەلاق و جیابونەوە دوای زەواجەکەیان کە کەمتر لە نیو سەعاتی خایاند وە هەروەها ریکەوتن لە سەر تاوانە مەزنەکەیان کە ئەویش رزگار بوون بوو لە منداڵە ساواکەیان .

دایکی مێردە پیرۆزبایی لە پێشنیارەکەیان کرد و ئەشرەف ئافرەتەکەی تەلاقدا و ئەوە مابوو رزگاریان بێت لە منداڵەکە و خستیانە

ناو جانتایەکی رەشی پلاستیکیەوە و لەسەر پردی (بنها) ی نوێوە خستیانە ناو  رووباری نیلەوە و بۆ هەتا هەتایە رزگاریان بوو لێی و وایان گومان دەبرد کە بەو شێوەیە رزگاریان دەبێت لە خەمەکانیان و نیهاد گەڕایەوە بۆ ناو خێزانە بەختیارەکەی و بەو منداڵەوە کە مردبوو بۆ هەتاهەتایی ئەسپەردەی کرد ، دوای چەند رۆژێك لەبەر ئەوەی تاوان نامرێت ...

نیهاد چوو بۆلای موقەددەم (عاصم جابر) پشکنەری لێکۆڵینەوەکانی (برکە السبع) و مەحزەرێکی کردەوە بە ژمارە ( ٤٤١٨) ی ساڵی (٢٠٠١) ز کە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە مێردەکەی ئەو منداڵە شیرەخۆرەی لێ سەندووەتەوە کە تەمەنی تەنها چەند رۆژێك بوو وە ئەو مەحزەرە سەرەتای دۆزینەوەی تاوانەکە بوو .

منداڵەکە لە قولآیی رووبارەکەدایە ! پشکنەری لێکۆڵینەوەکانی (برکە السبع) ناردی بە دوای ئەشرەفدا تا بەڵێن بدات کە بەرپرسیاریەتی ژیانی ئەو منداڵە شیرە خۆرە هەڵدەگرێت یان گەڕانەوەی ئەو منداڵە بۆ لای دایکی ، موفاجەئات روویدا کاتێ باوك جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە لەو کاتەوە زەواجی لە گەڵ نیهاد کردووە ئەو منداڵەی نەبینیوە .. لەو کاتەدا پشکنەری لێکۆڵینەوەکان لە بنکەی پۆلیسی (برکە السبع) هەستی بەوەکرد کە لە پشت ناجێگیری قسەکانی راهێنەری کاراتی و ژنەکەیدا تاوانێکی گەورە هەیە .

عەمید (عطیە مزروع) هەواڵیدا بە بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەکانی (المنوفیە) ئەویش فەرمانیدا بە پشکنین سەبارەت بە کارەکە ،بە هۆی ناجێگیری قسەکانیانەوە هەریەکەیان تۆمەتیان ئاراستەی ئەوی تریان

دەکرد ، هەتا نیهاد زۆری بۆهات و هەموو نهێنیەکەی ئاشکرا کرد و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کاتیٚ لە بنکەی پۆلیس هاتوونەتە دەرەوە رێکەوتن لە سەر تەلاٌق دان هەتا خێزانی نیهاد بەو کارەساتە نەزانێت و رزگاریان بێت لە منداڵەیان کە بە داوێن پیسی بوویانە بۆیە خستیانە ناو جانتایەکی رەشی پلاستیکەوە و بە یارمەتی دایکی ئەشرەف خستیانە رووباری نیلەوە لە سەر پردی(بنها) ی نوێوە .

راهێنەری کاراتیش دانی نا بە تاوانەکەیدا و بەراستی قسەکانی (نیهاد) دا ، بۆیە بەرێوەبەری پۆلیسی (المنوفیە) فرمانیدا کە بیانبەنەوە بۆ (برکە السبع) .

وە لەبەردەم سەرۆکی داداگادا دانیان نا بە درێژەی تاوانەکەیاندا... دادگا فرمانیدا بەندیان بکەن هەتا لێکۆڵینەوە تەواو دەبێت و بە پەلە دواهەمین دادگایی دەکرێن تا بە سزای خۆیان بگەن و بە هۆی تاوانە بێ وێنەکەیان لە سێدارە بدرێن .... وە بۆ قسە مرۆییەکانیش شکستیان هێنا لە دۆزینەوەی لاشەی ئەو منداڵە شیرە خۆرەدا کە شەپۆل دووری خستبوویەوە

لا حَولَ وَ لا قُوةَ الا بِاللهِ العَلی العَظیم

# به دەستی خۆم ژیانی خۆمم ویران کرد

ئەو تۆقیەنەم لە یادناچێت کە دڵی هێنامە لەرزین ، کاتێ تەماشای شەڕی نێوان باوکم و دایکم دەکرد و باوکم داوای پارەی زیاتری لە دایکم دەکرد بۆ کڕینی مەی و عارق ، دەبووایە دایکم بە گوێ ی بکردایە تا رزگاری بێت لە شەڕەنگێزی و تاوانەکانی .

نەم دەزانی دایکم لە کوێوە پارە دێنێت ، بەڵام هەندێ لە دراوسێکانمان جار ناجارێك خواردن و پۆشاکیان دەدایە .

دایکم سوور بوو لە سەر ئەوەی خوێندنم تەواو بکەم بە هەر نرخێك بێت ، کاتێ ئامادەییم تەواو کرد ، باوکم بە زۆر ناردمی بۆ پەرستاری بە تەماحی ئەو مووچە کەمەی دەیاندا بە کچی مەشقکار، و بەو ئومێدەی رزگاری بێت لێم، چونکە تەواو باری شانی ئەوم قورس کردبوو کاتێ بە روویدا دەوەستام و و بەرگریم لە دایکم دەکرد کە دەیویست هێرشی بکاتە سەر یان سوکایەتی پێ بکات .

دەردەداری دوو شت بووم لە خوێندنگای پەرستاری ، چونکە حەزم نەدەکرد ببمە پەرستار و دڵنەوایی کەسانی تر بکەم، چونکە خۆشم پێویستم بە کەسێك هەبوو دڵنەوایم بکات و باری شانم سووك بکات .

بە تەواوی نامۆ بووم لەو کەش و هەوایە ، راستە رزگارم بووبوو لە بارودۆخی هەمیشە ناخۆشیماڵەوە ، بەڵام بە درێژایی کات دڵم لە لای دایکم و خوشك وبراکانم بوو ، دڵخۆش نەبووم بە بوونم لە نێو کۆمەڵێ کچدا کە هیچم دەربارەیان نەدەزانی ، زۆربەی کات و بە بەردەوامی بێتاقەتیان دەکردم و هەستم بە بێزاری دەکرد لە نێویاندا چونکە ساتانێکی زۆری رۆژیان لە بەردەم پەنجەری ژوورەکانیاندا بەسەر

دەبرد و سەرەنجی کۆمەڵێ کوڕیان دەدا کە ئەوانیش لە گەڵ ئەماندا کاتی ژووانیان دانابوو ، بارگرانیەکە لە گەڵ تێپەڕینی رۆژگاردا قورستر دەبوو .

برا بێ عەقڵەکەشم سەرچاوەی خەفەتێکی ناخۆش بوو بۆ هەموان ، چونکە کاتێ کە فێی لێدەهات هەمووانی دەخستە حاڵەتێکی ترس و بیمەوە .

خوشکە ناوەنجیەکەشم هەوڵیدا خۆی بکوژێت ، چونکە هەرزەکار بوو، کوڕی دراوسێکەمان یاری بە هەست و سۆزی دەکرد ، کاتێ ناپاکی کرد لە بەڵێنەکەی وخزمێکی خۆیانی هێنا ، خوشکەکەشم حەفتا حەبی لە جۆری دیجیتاڵ ی خوارد کە خەریك بوو ماڵئاوایی لە ژیان بکات و فریای کەوتبوون و رزگاریان کردبوو تا بەردەوام بێت لە گەشتە بێنەواو ناخۆشەکانیدا .

بەڵام من .... لە گەڵ هەموو خەم و خەفەتەکانیشم بیرم لە خۆکوشتن نەدەکردەوە ، چونکە باوەڕم بە خوا هەبوو ، نوێژم ئەکرد ، بەڵام کەسم شك نەدەبرد تا بتوانم خەم و نارەحەتیەکانمی بۆ هەڵڕێژم و دڵنەوایم بکات و بارم سووك بکات .

زۆر جوان نەبووم ، لە بەر ئەوە کەس نەدەهاتە پێش بۆ خوازبێنم وە هەروەها کوڕان حەز ناکەن ئافرەتی پەرستار مارە بکەن ، چونکە هەندێکیان بە ناهەق زۆرجار تۆمەتبار دەکران بە خراپە ... هەندێ لە کچەکانی هاوڕێم هانیان دەدام لە سەر جگەرەکێشان ، بەڵام من لە سەرەتادا هیچ چێژێکم لێ نەدەبینی ، وە واش نەبوو تا لە دەمارگرژی بەردەوام هێورم بکاتەوە .

دوای سێ ساڵ خوێندن پەرستیارم تەواو کرد و لە یەکێ لە بنکە تەندروستیە دوورەکانی حکومەت دامەزرام ، ناچار بووم لە نەخۆشخانەیەکی تردا کار بکەم کە هی چەند پزیشکێ بوو ، تاوەکو بتوانم یارمەتی دایکم بدەم کە کێشەکانی قورس بووبوون بە سەریەوە .
خەونم نەدەبینی بە رۆژی پشوو یان حەوانەوە ، پێویست بوو بە درێژایی رۆژ و بە شەویشدا کار بکەم ، هەر کە تەماشای ئاوێنەم دەکرد دڵەڕاوکێم زیاتری دەکرد، چونکە هەندێ چرچ و لۆچی هێڵیان بە روخسارمدا دەکێشا ، هەر چەندە هێشتا گەنج بووم بەلاّم ئیشکردنی بەردەوامم و لاوازیی شەکەتی کردبووم . ماڵمان دوور بوو لە شوێنی کارکردنەکەم، کە ئەمەش کێشەکانمی زیاتر دەکرد، ناچار دەبوو بە پاس هاتوچۆ بکەم کە قەرەباڵغ بوو ، ئەمەش نارەحەتی بۆ کچێکی وەك من دروست دەکرد ، کارەکە خراپتر بوو کاتێ دایکم توشی نەخۆشی دڵ بوو کە وای لێکردبوو زوو ماندوو دەبوو ، وە نیمچە بێتوانا بووبوو لە بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵدا .
بەڕێکردنی ژیان بەو شێوەیە نارەحەت بوو ، هەژاریش رۆژ بە رۆژ نینۆکی دەئالاّند لێمان، چونکە باوکم بە هۆی خواردنەوەی عارەق بە بەردەوامی و کەمتەرخەمی لە ئەرکەکانیدا کارەکەی لە دەستدا ..
کەس نەبوو سەرپەرشتیم بکات یان گرنگی بە کاروبارم بدات و دایکم لە گەڵ نەخۆشیەکیدا ناچار بوو ئاگای لە براکەم بێت و چاودێری بکات ، تا وەکو رانەکاتە دەرەوە و نەبێتە هۆی ئازار و زیان بە خۆی و بە دراوسێکانی. مۆرفینم بە کاردەهێنا بۆ نەخۆشەکان ، بە شێوەیەکی خێرا و سەیر ئازاریان نەدەما ، کەمێك شادیان بۆ دەگەڕایەوە ، هەندێکیشیان وەسفی مۆرفینیان دەکرد کە کاریگەری سیحراوی هەیە .

لە کاتێکدا منیش زۆر جار سەرم دەیەشا و شەکەت و ماندوو بووم ، لە بەر ئەوە خۆم تاقیکردەوە بەو مۆرفینە و دەم زانی کە مرۆڤیش پێی موعتاد دەبێت.. یەکێ لە پزیشکەکان باسی مەینەتی ئەوانەی بۆ کردبووم کە پێشتر ئەو دەرمانەیان بەکار دەهێنا، وە چۆن بووبوون بە کۆیلەی ژەمێکی ئەو دەرمانە .

لە گەڵ ئەوەشدا بەڵێنم دایە خۆم کە دووبارەی نەکەمەوە، دوای جاری یەکەم هەستێکم تیا دروست بوو کە پێشتر و پاشتر تیاما دروست نەبووبوو ، سەر ئێشە و تەنگە تاویەکەم رۆشت ، و لە جێگایدا شادی بەردەوام و خۆشیەکی مەزن جێگای گرتەوە .

بە خێرایی رزگارم بوو لە باری دنیا و خراپەکانی ، هەستکردن بە مەزنی و نەشئەوە و زاڵ بوون بە سەر پێڵوی چاومدا ، کە وەنەوزدان هەتا بەیانی وشکی کردبوویەوە .

هەر کاتێ هەستم بە تەنگەتاوی یان بێتاقەتی بکردایە پاڕا نەبووم لە بەکارهێنانی مۆرفین و دەمدا لە باڵم .. بوومە دیلی ئەو دەرمانە، لەزەتەکەی لای من لەوە خۆشتر بوو کە مۆڵەتێك وەربگرم لە ئامێزی سروشتدا یان بەسەربردنی پشوویەك لە یەکێ لە دوورگەکاندا .

مانگێکی تەواو تێپەری بە بێ گرفت و کێشە ، بەڵام هەستم دەکرد بە ئاسانی دەمارم بۆ نادۆزرێتەوە تا مۆرفینەکەی لێبدەم چونکە زیادەڕۆیم کردبوو لە بەکارهێنانی دەرمانەکەدا .

مۆرفینم لەبەشی نەخۆشەکانەوە دەست دەکەت ، چونکە من هێمنکەرەوەیەکی ترم بە دەرزی لێدەدان و خۆشم مۆرفینەکەم دەخستە گیرفانمەوە و هەڵم دەگرت بۆخۆم ..

کەس هەستی پێ نەدەکردم، بەڵام ژمارەی ئەو نەخۆشانەی ئازاریان

هەبوو لە کاتی دەوامی مندا ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی دەکرد ، منیش گوێم نەدابوویە ئەوە ، گرنگ ئەوە بوو من بەختەوەری بۆ گیانم بگێڕمەوە وەك وا گومانم دەبرد ، چونکە بەکارهێنانی یەك مۆرفین لە لای من یەکسان بوو بە هەموو خۆشیەکانی دنیا ..

بەڵام دوای تێپەڕبوونی مانگێك هەستم بە هەڵەشەیی و توڕەیی و سەر ئێشە و خەمۆکی دەکرد ، ئەگەر درەنگ دەرزی مۆرفینەکەم بدایە لە باڵم ،بڕیارم دەدا بڕەکەی زیاد بکەم، من ناچار بووم خۆم دەرزی مۆرفین لە خۆم بدەم تا هێمنی خۆم رابگرم وکۆنترۆڵی کاروبارەکانم بکەم ، ژیان وەکو دۆزەخەکەی پێشووی لێهاتەوە کە مرۆڤ بەرگەی نەدەگرت، لە سەرو ئەوەشەوە من ناچار بووم دەرزی مۆرفین پەیدا بکەم و لە خۆمی بدەم بە هەر چەندە و بە هەر نرخێك بوایە .

ئەو بڕەی دەم کیشایەوە لە نەخۆشەکان بەشی نەدەکردم، زۆرجار ناچار دەبووم بە دزیەوە لە دەرمانخانەی نەخۆشخانەوە دەستم بکەوێت و دەمبرد .

دەرزی مۆرفینەکە لە گەڵ سرنجدا لەناو سنگمدا دەمشاردەوە، بە هۆی زۆر لێدانی دەرزیەوە دەمارەکانم شی بووبوونەوە ، باڵم توشی دمەڵێکی سەخت بووبوو کە زۆر ئازاری دەدام و پاشان بە ناڕەحەت چاك بوویەوە.

شەوێکیان پزیشکێك زۆر بێتاقەتی کردم ، چونکە تۆمەتباری کردم بەوەی کە کەمتەرخەمم ، زۆر گریام و هەوڵمدا بە بڕێکی زۆر لە مۆرفین دەرزی لە خۆم بدەم و پێشتر پێی ڕانەهاتبووم ، هەستم بە هەناسەتنی دەکرد ، پاشان لە هۆش خۆم چووم و وەك نیوە مردوو کەوتم بە زەویدا

هاتمـەوە هـۆش خـۆم ،بینـیم پزیـشكێكم بـە سـەرەوەیە و بـەزوویی هۆكارەكەی دۆزیبوویەوە ، چونكە شوێنەواری دەرزیەكانی لە سەر باڵم بینیبوو ، وە لە سنگمدا چەند حەبێكی مۆرفینی دۆزیبوویـەوە لـە گـەڵ دەرزیدا ، بۆی ئاشكرا بوو كە من موعتـاد بووم بەو دەرمانـە و شـەرابی یـابومیْ و لـە چـەند سـاتێكی كەمـدا رزگـاری كردبـووم ، ئەگـەر چـی كۆمەكی خـوای گـەورە نەبووایـە و پاشـان لـە نەخۆشـخانەش نەبوومایـە ئەوا دەمردم .

تكـام لـە پزیـشكەكە كـرد كـە نهێنیەكـەم ئاشـكرا نـەكات ، رێكـەوتین لـە سەر ئـەوەی چـەندیْ لـە تواناماندا هەیـە بیپۆشـیْ ، چـونكە هاورێكـانم رووداوەكـەیان بینیبـوو ، دوای ئـەوە بەسـەر هاتەكـەم بڵاوبوویـەوە بـە نەخۆشـخانەدا وەك چـۆن ئـاگر بـەردەبێت لـە پـوش و پـەلاش، منیـان خـستە نەخۆشـخانەوە، بـۆ چـەند هەفتـەیك تیایـدا مامـەوە، و رێگـای مـۆرفینم لـیْ گـیرا ، بـەلاّم گوشـراوی میوەیـان دەدامـیْ كـە دواتـر بـۆم دەركەوت كە دەرمانێكی تێكراوە دژی موعتاد بوون وهەنـدیْ دەرمانیـان بـۆ بـەكارهێنام، پاشـان خرامـە ژێـر چارەسـەرێكی دەروونـی تایبـەت ، پاشان مەزنترین سوودم وەرگرت لە یـەكیْ لـەو پزیـشكە ئافرەتانـەی كە رێنمایی كردم بۆ ئیمانی راستەقینە بە خوا .... ئەگەر ئەو نەبوایە ئـەوە رزگـارم نـەدەبوو لـە نەخۆشـخانە و بـە تێكـشكاوی و نیمـچە نەخۆشـی نەبوایـە ... ئەمـە بـوو بەسـەرهاتی مـن ، ئایـا هـیچ هەیـە لەمـە پەنـد و ئامۆژگاری تر بێت .

گۆڤاری (الامن والاحیاة ) /ژ (١٠٣)

# مونا و بازرگانی مادە بێهۆشکەرەکان

ئایا ئەم ژنە هەڵەی کردووە کاتێ رێگایەکی هەڵەی هەڵبژاردووە بۆ چارەسەری کێشەکەی ... دۆسیە رەسمیەکان دەڵێن : بەڵێ، هەرچەندە بارودۆخە مرۆڤایەتیەکەی چیرۆکێکی خەمناکی هەڵگرتووە کە دڵەکان نەرم دەبن بۆی، بەلاَم یاسا لە کۆتاییدا هەر یاسایە و سوزداری ناناسێت ،لە پڕ ئەم ژنە گەنجە خۆی بینیەوە کە دەخرێتە زیندانەوە ، بە سێ ساڵ زیندانی بەند کرا ... هەتا ئەم ساتە مونا پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە بە هۆی ئەمبارکردنی مادە بێهۆشکەرەکانەوە بۆ بازرگانێکی گەورە ئەمە چارەنوسەکەی بێت ، دەچێتە بەندینخانەوە و مێردەکەی بەجێ دەهێڵێت تا بە هۆی نەخۆشیەوە زۆرانبازی لە گەڵ مردندا بکات و چوار منداڵەکەی کە لە خەڵوەتگەدا دەژین .

بێن با پێکەوە ئاشنا بین بە بەسەرهاتی (مونا) .

بەختدارترین بەندکراو بوو لە رووی خۆشەویستی و سۆزداریەوە و یاتر لە هەموو بەندیە ئافرەتەکانی تر ، ساڵی پێشوو هەر کە خرایە بەندیخانەو هەموان بەسەرهاتی ئەمیان دەزانی کە بە فرمێسکەکانی دەیگێڕایەوە ، (مونا) ژیانێکی سەختی بەسەردەبرد ، چاوی کردەوە بەم ژیانەدا تا خۆری ببینێتەوە ، لە خێزانێکدا کە هەژاری و مەینەتی و گوێپێنەدان باڵی کێشا بوو بە سەریدا ، باوکێکی ماندوو و شەکەت بە دوای پارەو نانێکدا ، رۆژێك کاری دەست دەکەوت و چەند رۆژێك بێ کار بوو ، ئەو خێزانە سادەیە ساڵانێکی درێژ لە ژوورێکی پەڕپوت و لە خانویەکی کۆن لە گەڕەکی (روض الفرج) دەژیان .

بێبەش بوون هاوڕێی بەردەوامی ئەم خێزانە بوو ، هەموو خۆشیەکی ژیانیان دەبینی کە دەدرەوشایەوە لەو چاوانەدا کە دەلەنجایەوە لە ئاسودەیدا .

(مونا) هەر لە تەمەنی سیانزە سالیەوە چووە مالە دەولەمەندەکانەوە تا وەك کارەکەرێك کار بکات ، هەرچەندە کارەکە سەخت بوو بۆ ئەم، بە هۆی کەمی تەمەنیەوە و شارەزایی کەمی لە ژیانیدا ، بەلام هەر چۆن بێت هەموو شتێ ئاسان دەبێت لە پێناوی خەوتنێکدا لە سەر رایەخێکی پاك و پارویەك ناندا ، بەرگەی ئەو شتانەی دەرگرت کە مرۆڤ ناتوانێت بەرگەی بگرێت لە پێناوی پارێزگاری کردنی پارویە ناندا ، کچەکە هەموو مانگێك مووچەکەی خۆیی دەدایە باوکی و یەك فلسی بۆ خۆی دانەدەنا .

سالانێ بەسەریدا تێپەڕی ... ئەم هەر وەك خۆی وابوو ، باشترین چارەسەر شووکردن بوو بۆی، مونا هەستی بەوە دەکرد کە ژیان لە گەلٚ مێردێکدا بیپارێزێ و ژیانێکی شەریفانەی بۆ دابین بکات ، دەروازەی رزگار بوونیەتی بۆ ئەم کە لەم زەلکاوی هەژاریە رزگاری بکات .

بۆیە ئاشنا بوو بە کرێکارێکی مەیان ، کارێکی دیاریکراوی نەبوو ، هەموو رۆژێك بە دوای کارەوە بوو ، کوڕەکە پێشنیاری کرد کە دیخوازێت و کچەکەش رازی بوو ، هەرچەندە کوڕەکە بە لایەنی کەمەوە دە سالٚ لەم گەورەتر بوو ...

لە گەلیدا لە ژوورێکی بچووك لە هەمان گەڕەکدا دەژیا ، هەرچەندە سەرەتای گەشتی ژیانی نێوانیان بەو شێوە خۆشە نەبوو کە خەوی پێوە دەبینی، بەلام رازی بوو بەو بەشە و بەختیار بوو بە مێردەکەی و لە بەرهەمی زەواجەکەیان خوای گەورە چوار مندالی پێبەخشین .

ورده ورده نەخۆشی زاڵ دەبوو بەسەر مێردە هەژارەکەیدا و بە ناچاری دەیخستە جێگاوە ، ئەی لە کوێوە پارەی دەست کەوێت ، تا بەشی خەرجی پزیشکەکان و نەخۆشخانە و دەرمانە گرانبەهاکان بکات ...
ئەم پرسیارە بۆ ماوەیەکی درێژ بە دوای وەلآمدا دەگەڕا، هەتا (مونا) ناچار بوو گەشتێکی قورس بگرێتەبەر تا یارمەتی مێردەکەی بدات لەو مەینەتیەدا ، و بژێوی منداڵە بچوکەکانی دابین بکات ، .. جارێکی تر دەستی کردەوە بە کارکردن لە مالآندا ..هەموو رۆژێ لەماڵێکەوە دەرۆشت بۆ ماڵێکی تر ، بەلآم قەدەر دەستبەرداری ئەو مێردە نەبوو ، مێردەکەی مرد و مونای بەجێهێشت تا بەرەنگاری ئایندەیەکی تاریک ببێتەوە لە گەڵ چوار منداڵدا ، بە بێ هیچ چەك و تفاقێك جێیهێشت تا بەرەنگاری نارەحەتی ژیان بێتەوە .. بە بێ هیچ پرۆژەیەك کە قازانجێکی باشی لێوە دەست کەوێت، وە بەبێ هیچ میراتێ ..
(مونا) گەڕایەوە سەر تاکە پیشەکەی خۆی کە کارەکەریی بوو ، بەلآم بە هۆی بەخت رەشیەوە لە خێزانێکدا گیرسایەوە کە هیچ بەزەییێکیان تێدا نەبوو ، بەخراپترین شێوە مامەڵەیان لە گەڵدا دەکرد ... بە سەختترین شێوە هەڵسوکەوتیان لە گەڵدا دەکرد، دنیا لە بەرچاویدا رەش بووبوو ، بە تایبەتی لە گەڵ زیادبوونی بارگرانی چوار منداڵەکەیدا و پێداویستیەکانی قوتابخانە ، یەکێ لە بازرگانەکانی مادە بێهۆشکەرەکان دەرکی پێکرد بوو کە لە هەمان گەڕەك و نزیکی ماڵیان نیشتەجێی بووە، وای نیشاندا کە بەزەیی پێدا دێتەوە و بڕیاریدا یارمەتی بدات، سەرەتا پارەیەکی زۆری خستە بەردەستی و بە بەڵگەی ئەوەی وەك کارەکەر لە ماڵەکەیدا کار بکات تا کاتی ئەوە هات پیاوە بازرگانەکە پەردە لە سەر ئامانجەکەی لابدات ، کە نەخشەی کێشا بوو

تا لە ماڵیاندا کار بکات ، داوای لێکرد هەستێ بە کارێکی ئاسان کە هیچ ماندووبوونێکی تێدا نیە ، و لە بەرامبەریشدا پارەیەکی زۆری دەست دەکەوێت کە بەشی خۆی و منداڵەکانی بکات تا بتوانێت بە هۆیەوە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو بژی .

تەنها ئەم کارەو بە بێ پێچ و پەنا

ئەوەی داوات لێدەکرێت ئەوەیە کە ئەو کارتۆنە بۆ ماوەی دوو رۆژ لای خۆت دابنێ .. پاشان پێت رائەگەیێنم بیدەیت بە کەسێك کە لە لایەن خۆمەوە دەی نێرم بۆ لات .

بەو شێوەیە بازرگانی مادە بێهۆشکەرەکان سەرکەوت لەوەدا کە (مونا) رازی بکات بە ئەنجامدانی پیلانەکەی وە تووشی هیچ نارەحەتیەك نابێتەوە تا ئەو داوەی کە بۆی دانا بوو وە بارودۆخی نالەباری ئافرەتەکەی قۆزتبوویەوە کە خەریك بوو دەیخنکاند و خۆشترین ساڵانی تەمەنی دەفەوتێنێت .

یەکەمین کار بە سەرکەوتوویی تەواو بوو ، بازرگانی مادە بێهۆشبەرەکان پلانی دانا بۆ کاری دووەم ، کارتۆنێکی یا بە ئافرەتەکە کە پێنج کیلۆ "( بانجۆ ) ی تێدا بوو ، لە هەمان شەودا (مونا) کەوتە خەوێکی قووڵەوە و منداڵە بچوکەکانی لە ئامێز گرتبوو تا بەیانی بە دەنگی بەرزی دەرگاکەی شوقە بچوکەکەیان خەبەری بوویەوە و ترس دایگرت .

تۆ بڵێیت بەم کاتە کێ هاتبێت ؟

خێرا وەڵامی دەست کەوتەوە کە تەنگی بە دڵی هەڵچنی بوو ، کاتێك پیاوێك بە دەنگی نێرانە وتی:

بیکەرەوە ئاسایشین .

دڵی کەوتە مشتیەوە .. پاشان کاتێ ئەفسەرەکانی بنبڕکردنی مادە بێهۆشبەرەکان شوقەکە گەڕان کارتۆنەکەیان دۆزیەوە کە بانجۆکەی تێدا بوو.. ئافرەتەکە بورایەوە و پاشان بەردەوام سوێندنی بۆ ئەفسەرەکان دەخوارد کە بێتاوانە... بەڵام یاسا هەست و سۆز ناناسێت و بێئاگاکان ناپارێزێت و دەستگیر کرا ، و ڕەوانەی دادگای تاوانی قاهیرە کرا ، کە فەرمانیدا بە بەندکردنی بۆ ماوەی سێ ساڵ و لە گەڵ کاری قورسدا .

گۆڤاری (حیاة الناس) / ژمارە: ٢٢٧ / ربیع الاول ١٤٠٤ك

# شووم پێکرد تا رزگاری بکەم کەچی من تیاچووم

تۆ هێشتا لەتەمەنی بەهاری لاوێتیدایت و هێشتا گەنجیت، هێشتا تەمەنت لە پێشەو ئافرەتێکی جوانیت ... تۆ پێویستت بە هاوڕێ و هاودەمێ هەیە کە رزگارت بکات لەو تەنیایەت و ئازاری نامۆییت کەم بکاتەوە .

خەڵکێکی زۆر خوازیاری ئافرەتێکی عاقڵ و بە سۆزی وەك تۆن، تا کەی بە تەنیا دەمێنیتەوە ؟ منداڵەکانت ژنیان هێنا و شوویان کرد و تەنیاییش ناخۆشە ، ناخۆشتر لەوەش هەست پێکردنیەتی ، وە بەو تەنهاییەی دوای ئەوەی کە مرۆۆ راهاتبێت لە سەر قەرەباڵغی .... هەموان ئەمەیان پێدەوتم دوای ئەوەی ( سەمیر ) ی کوڕم ژنی هێنا و ( سەحەر ) ی کچم شووی کرد، هەر یەکەیان بۆ هێلانەی تازەیان و سەرقاڵیان بە کاروباری ژیانەوە .

گفتم بە خۆم یابوو کە لە کەس نزیك نەبمەوە تا وەکو رێگا نەیەم بە کەس لەو دوانەم دوور بخاتەوە .

هەموو خەمێکم لەم دنیادا ئاسودەیی و دڵنیاییم بوو لەو دوانە ،من رازی بووم بەو جۆرە ژیانەم ، هەتا هەندێ جار لۆمەیان دەکردم یان ئامۆژگاریان دەکردم ، کاتێ "محمود هاتە خوازبێنیم لە لایەکی تریشەوە سەرسامی خۆیی دەربڕی بەرامبەرم و ستایشی کردم و سووربوو لە سەر ئەوەی کە بمخوازێت .

کاتێ نارەزایی خۆمم بۆ دەربڕی سەبارەت بە بیرۆکەی زەواج ، بە راشکاوانە پێی وتم : پێشتر ژنم هێناوە ، بەڵام ژن هێنانەکەم بە حەزی

خۆم نەبووە ، بە سەرسامیەوە تەماشام کرد ، لە گەڵ خۆمدا پرسیارم کرد : ( ئایا پیاویش وەکو هەندێ کچ زۆری لێدەکرێت بۆ زەواج ) وەك ئەوەی پرسیارەکەی لە چاومدا خوێندبێتەوە وتی : سەرسام مەبە کەسوکارم سووربوون لە سەر ئەوەی کە ژن بهێنم ، چونکە کچەکە خزممان بوو، منیش بە زۆر هێنام و رێکنەکەوتین ، ژیانم بوو بە دۆزەخ تا ئەو دۆزەخە منی برد بەرەو موعتاد بوون بە مادە بێهۆشبەرەکانەوە، وە پێش ئەوەش خواردنەوەی عارەق کە خوای گەورە حەرامی کردووە.

پاشان زەواجەکەمان بە تەڵاق کۆتایی هات و دوای ئەوەی کە موعتادی مادە بێهۆشکەرەکان بووم ، من ئێستا حەزێکی تەواوم هەیە کە رزگارم بێت لەو موعتاد بوونەم و ئەو حەزەشم پابەندە بە تۆوە .

_ واتە بە منەوە ؟..

_ بەڵێ

_ چۆن ؟

_ بە شوکردنت بە من ...

پاشان وتی : بێگومان ئەوەی کە بیستوومە سەبارەت بە تۆ لە چاکیت و بە وەفاییت و قوربانیدانت و هۆشمەندیت پاڵم پێوە دەنێت کە سوور بم لە سەر داواکردنت ، چونکە تۆ دەبیتە ئەو دەرمانەی کە دەمپارێزێت لەو دەردە .

بە هۆی سروشتی مێینەیی و سۆزی زۆرەوە بەزەییم پێیدا هاتەوە و بڕوام پێکرد .. بڕیارمدا شوی پێبکەم ... بەڵکو ئەو هۆکر بوونەی تیا ببینمەوە کە کۆتایی بێنێت بە تەنیایی من بە هۆی دووریی منداڵەکانمەوە ... و یارمەتی بدەم لەو قەیرانەدا کە تێی کەوتبوو وەك خۆی دەڵێت .

بـەو شـێوەیە شـووم پێکـرد.... کـچێکی جوانکیلـەم لێـی بـوو ، زۆر بەختەوەر بووم پێی ، تەنیایی ژیانمی پڕکردەوە ، خوازیـاربووم هاتنـە دنیـای ئـەم منداڵـە خێر و بەرەکـەتێکی بـاش بێت بـە سـەرماندا ، بـەڵام ئومێـدەکانم بـوون بـە تراویلکـە ( سـەراب ) یێکـی مەترسـیدار ، کـاتێ نارەحەتیـەکان دەوری ژیانمانیـدا ، بـەڵکو لـە گـەڵ تێپـەڕینی رۆژگـاردا سـات نـا سـاتێك نارەحـەتی و مەینـەتی سـەردانی دەکـردین ، محمـودی مێردم دەچووە دەرەوە بۆ شەونشینی، بەڵام شەونشینیەکانی شـەو لـە دوای شـەو درێـژەی دەکێـشا ، کـاتێ دەگەڕایـەوە لـێم دەپرسـی بۆچـی دواکەوتیت ، بە شەکەتیەکەوە وەڵامی دەدامـەوە : چیت لـەمن دەوێـت ، ئێستا هاودەمێکت هەیە و هاوسەرێکت هەیە و ئیتر واز لە من بێنە .

_ محمود من خەمی تۆ ئەخۆم کە هاوڕێ ی خراپ بتبـەن بـەرەو موعتـاد بوون بە مادە بێهۆشکەرەکان .

قاقا پێئەکـەنی ودەیـوت : هاوسـەری ئـازیزم خـەمت نـەبێت ناگـەڕێمـەوە سەر ئەوەی پێشتر لەسەری بووم .

کەواتە بە درێژایی شەو چی دەکەیت ؟

تەنها شەو بەسەربردنێکی خۆش و هیچی تر .

پاشـان دەکەوتـمـە ووتوێـژ لـە گەڵیدا ، دڵنیـای دەکـردم کـە بـە تـەواوی دووره لەو شتانەوە کە من گومانی بۆدەبەم و ترسم هەیە لێی .

بۆیـە بـۆ ماوەیـەك بێـدەنگ دەبـووم و بـڕوام بـە درۆکـانی دەکـرد ، شەوێکیان رۆیشتە دەرەوە لـە گـەڵ بەرەبەیانـدا هاتـەوە، کـاتێ هۆکـاری دواکەوتنەکەیم پرسـی ، زۆر سەرزەنـشتی کـردم و پاشـان دەسـتی بـەرز کردەوە لێم بدات ، زۆر بە تەواوی ئاگای لەخۆی نـەبوو .. پـێم وت : تـۆ حەزی تەواوت لە تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە بوو ...کوا حـەزت لـە

حەوانەوە و سەقامگیری ؟ ئایا خەمی کچەکەت ناخۆیت ؟ئایا خەمی من و خەمی خۆت ناخۆیت ؟ تۆ ژیانی خۆت و ژیانی ئێمەش وێران دەکەیت ...

وتی : پیرەژن بێدەنگ بە (پڕ بە بینی پێدەکەنی) نمونەی تۆ قسە ناکەن .

_ بۆچی ؟

_ تۆ تەنها کچت بە من بە خشیوە ، من کوڕم دەوێت ، ئایا گوێت لێیە ، من کوڕم ئەوێت ،پاشان دەستی کرد بە لێدانم، رام کرد لە ژێر دەستی بۆ ژووری کچەکەم و دەرگاکەم بە دوای خۆمدا داخست.

دەنگی دەگەیشتە من و دەیقیژاند (( تۆ پیریت و من لە تۆ منالترم ..))

منیش لە پەشیمانی و مەینەتی و خەفەتباریدا دەگریام و نەمدەتوانی بخەوم... بە شەکەتی و بێداری مامەوە ..

ئایا تۆ بڵێیت بوونی کچێك هۆکار بێت لە هەڵگەڕانەوەی ؟ ئەوەی کچمان پێدەبەخشێت دەتوانێت کوڕمان پێ ببەخشێت ... پاشان ئەمە منداڵی یەکەممانە .

هەستم دەکرد سەرم لە تاو بیرکردنەوە دەتەقێت ، بەلام بە خۆمم وت : ئەوە هەڵچونێکی شێتانەیە و کاتێ خەبەری دەبێتەوە دێتەوە هۆش خۆی و داوای لێبوردنم لێدەکات و دوای ئەوەی بە قسەکانی دڵی بریندار کردم، ئەو تکای لێدەکردم کە رازی بم ببێتە مێردم و شووی پێبکەم .

بەلام زۆر بە پێچەوانەوە بوو ، شەونشینیەکانی زیادی کرد کە بووەتە هۆی خراپی باری تەندروستی و خەرج کردنی پارەیەکی زۆر ..

هەموو هەوڵی خۆمم خستە گەڕ تا ڕێگای لێبگرم کە بەو گوزەرەدا نەڕوات ، ئەو حەب و دەرمانانەم دەشاردەوە کە دەیخوارد.... لە بەرهەم و ئەنجامی ئەو کارانە بەرامبەر بە مێردەکەم دژایەتی و لێدان و جنێوپێدانم دەست کەوت ، بۆ دڵدانەوایی پێم وت: محمود مەترسە ئەگەر هۆکاری ڕاستەقینەی موعتاد بوونت ئەوەیە کە حەزت لە کوڕە ئەوە بێگومان خوای گەورە بەخشەندەیە و باشترین ڕۆزیدەرە ، تەنها بە ڕاستەقینەیی تەوبە بکە و بپاڕێوە لێی پشت بە خوا کوڕت پێ دەبەخشێت .... بە پێکەنینەوە وەك شێت وتی : لە کوێوە کوڕمان دەبێت لە کاتێکدا تۆ پیر بوویت ، سێ ساڵ تێپەڕیووە بە سەر هاوسەرگیریماندا ، ئایا دەتەوێت چاوەڕوانی کوڕ بکەم کاتێك بە گۆچان دەچیت بەڕێوە ؟

وەکو سەرگەردان بەردەوام بوو لە پێکەنینەکەی ، وشەکانی وەك خەنجەر وابوون و دەیدان لە دڵم و ڕۆحمی دەوستان و دەروونمی تێك دەشکاندا ، بەلاًم ئەم جارەیان بە تووڕەییەوە پێم وت : من بۆ منداڵ بوون گەورە نیم، ئافرەتانێکی زۆر لە من گەورەتر هەن و منداڵیان دەبێت وەك تۆ وای دەبینیت ، بەخشینی منداڵ بە دەستی خوای گەورەیە .

سەر لەنوێ پێکەنیەوە.. پێم وت : تۆ هۆکاریت بۆ ئەوەی کوڕمان نەبێت .. بە هۆی مەشروب خواردنی زۆرەوە و موعتاد بوونت بە مادە بێهۆشکەرەکان تووشی نەزۆکیان کردویت ، کە بەڕاستی مردنێکی ڕوخێنەرە و بە هێواشی مرۆڤ دەکوژێت .

وتی : تۆ شێتیت ، دەتەوێت لۆمەی من بکەیت، چونکە تۆ هۆکاریت ، بەردەوام قسەی پێدەوتم و لێیدەدام بە بێ موراعاتکردنی هەست و

سۆزی من و موراعاتکردنی کچە بچووکەکەی هەتا ئەو جگەرگۆشەیەمان تووشی ترسێکی بەردەوام بووبوو ، وای لێهات توشی ڤێ و گەشگە و میزکردنی خۆنەویستانە بووبوو .

خەم و خەفەت لە هەموو لایەکەوە دەوری دابووم ، خۆم دەبینیەوە کە نوقم بووم لە دەریایەکدا کە کۆتایی نیە ، تەنها ساتانێك کە تێیدا هەستم دەکرد کە مرۆڤم و رۆح و دڵم هەیە ، ئەو ساتانە بوو کە لە گەڵ ئافرەتانی هاوڕێم کە دراوسێمان بوون کۆ دەبوومەوە و خەم وخەفەتی خۆمم بۆ هەڵدەرشتن ، قسەکانیانم وەك مەڵحەمێك دەبینی کە برینەکانمیان هێور دەکردەوە و زیاتر هانیان دەدام کە خۆڕاگر بم ، رۆژێکیان سەردانی یەکێکیانم کرد و دانیشتم قسەم لە گەڵ دەکرد ، قسەکانمان جیاواز بوون ، پاشان لێی پرسیم

حاڵت چۆنە لە گەڵ مێردەکەتدا ؟

وتم : ئەو هەر لە سەر رەفتارەکەی خۆیەتی ، من ئیتر توانام نەماوە بەرگەی هەڵسوکەوت و خراپەی بگرم، لەزەتی خەوتن و حەوانەوەی فیکری و دەروونی لێ حەرام کردووم .

بە خەندەیەکەوە پێی وتم : ئەی تەندروستیت چۆنە ؟

وتم :ئەوەیە کە دەیبینیت .

وتی : گوێ مەدرێ دەرمانێکم لایە لە روەکی سروشتی دروستکراوە، یارمەتیت دەدا کە بخەویت و بحەسێیتەوە وە هەروەها یارمەتیت دەدا کەمنداڵت ببێت .

_ ئایا بەڕاستە ؟

_ بەڵێ تاقیکراوەتەوە و پاشان دوعای خێرم بۆ دەکەیت

_ سوپاست دەکەم ، بەراستی خوشکێکی دڵسۆزیت

_ ئێستا بۆت دێنم .

چەند ساتێك دیار نەما و پاشان گەڕایەوە و لە ناو دەستیدا چوار جگەرەی تێدا بوو کە ئاخنرابوو لە مادەی بێهۆشکەر، رارار بووم لە وەرگرتنی، بەڵام بە دڵنیاییەوە پێ ی ووتم :

گوێ مەدەرێ شێوەی لەجگەرە ئەکات منیش هەر وابووم، چونکە دەکێشرێت ، بۆیە وایە تا کاریگەریەکەی خێرا بێت.... بە هۆی دڵپاکی خۆم و پێویستیم بە دەرمانەکە بڕوام پێکرد و بەو ئومێدەی بحەوێمەوە و هەندێ لە خەمەکانم لە بیر بچێتەوە و لە ئایندەدا بەختەوەربیم.. پێویست پێش خەون بیکێشیت ، ئەوەی وت پێم و تەماشایەکی کردم کە دڵخۆش بوون بە سەرکەوتنی تێدا دەبینرا .

هاتمەوە ماڵەوە و ئومێدی ژیانێکی خۆش و بەختەوەرم دەکرد، نەم ئەزانی کە ئایندە و کۆتایی خۆم دەخەمە دەستی ئەوەوە .

بۆ رۆژی پێنجەم لە جیاتی ئەوەی هەست بە حەوانەوەو چاکبوونەوە بکەم، توشی ئازارێکی سەخت بووم لە ئێسکەکانمدا، سەرئێشەیەکی بەهێز دایگرتم و وام گومان دەبرد کە ئەو ئازارانە کۆتاییانەو لە لەشمدا نامێنن ، بەڵام رۆژ لە دوای رۆژ زیادیان دەکرد ..

پاش ئەوەی کار لە کار ترازا هەستم کرد کە موعتاد بووم ، بەڕاستی کەوتوومەتە ئەو چاڵەوە کە مێردەکەم منی خواست تا بیپارێزم و تێ ی نەکەوێت ... حاڵەتی خراپم و ئێش و ئازاری زۆرم ناچاریان کردم کە بچمەوە بۆ لای ژنەکەی دراوسێمان و لە دەرگام دا و ئەتلامەوە بە ئازاری زۆرەوە ، هەرکە دەرگاکەی کردەوە و بە پەلە پێم وت : تکات لێدەکەم جگەرەیەکم بەرێ، ئازار خەریکە شەکەتم ئەکا ، بە ساردیەك و

دڵخۆشیەکەوە تەماشای کردم و و پاشان وتی : هەرجگەرەیەك بە هەزار.

رازیم چیت پێیە بمەرێ ... من بە نیسبەت ئەوەوە نێچیرێکی بەنرخ بووم و بە ئاسانی راوی کردبووم ، جانتاکەمم کردەوە و هیچ پارەیەکم تێدا نەبینی ، بە حەسرەت و زەلیلیەوە وتم : پارەکە کەمە !ئێستا دانەیەکەم بەرێ و سبەینێ پارەکەت بۆ دێنم .

وتی : ئێستا ئەمەوێ، سبەینێ نا .

بەلاّم هیچم پێنیە و تەماشای دەستی کردم بە هەڵپەوە پێم وت : ئەڵقەکەم بەرەو گرانیشە ، دامکەند لە دەستم بۆی و ئەویش جگەرەیەکی بۆ هێنام .

وتی : پێنج هەزار بێنە تا پێنج جگەرەت بەمێ

چوومە دەرەوە بەو هەموو مەینەتی و تیاچوون و حەسرەتەوە و دنیا دەسوڕایەوە لە بەر چاوم ، هەموو رۆژێ دەچووم تا جگەریەکم دەست بکەوێت پاش ئەوەی کە نرخەکەیم دەیایە و دەشترسام و حەزەری خۆمم دەکرد .

بۆ رۆژی پانزەهەم ، پێش ئەوەی کاتی ئەوە بێت بچم بۆ لای، یەکێ لە دراوسێکانم سەردانی کردم، لەوەوە زانیم کە پۆلیس ئافرەتەکەیان دەستگیر کردوە ، پێشتر کاری کردووە بۆ تۆڕێکی مادە بێهۆشکەرەکان ، ژیانم بە تەواوی ژێرەو ژوور بوو، مەینەتیەکانم لەهەموو لایەکەوە زیادیان کرد، تا وای لێهات شەو و رۆژم بوون بە یەك و فرمێسك دەستبەردارم نەدەبوو، تەنگەتاوی و خەمۆکی هۆگرم بووبوون ، حەشیش بە نیسبەت منەوە وەکو ئاو وابوو بۆ گەڕیدەیەکی ناوبیابانێکی وشکەلآنی گەرمەسێردا ، نەم دەزانی لە کوێوە دەستم

بکەوێت هەتا ئازارەکانم هێور بکەمەوە و نەشم دەتوانی بە کەس بڵێم ، بیرم لە مادە بێهۆشکەرەکانی مێردەکەم کردەوە ،چەند جارێك هیرۆینم لێ دزی.. کاتێك رۆژێکیان پێ ی زانیم زۆر بە خەستی لێیدام .

لە حاڵەتێکی زۆر سەختدا بووم دوای ئەوەی زانیبووی کە بەڕێوەبەرایەتی بنبڕکردنی مادە هۆشبەرەکان ئەو بازرگانەی گرتبوو کە ئەم مامەڵەی لە گەڵ دەکرد دنیا لە بەرچاوم تەسك بووبوویەوە و ئۆقرەم نەدەگرت ، شەو و رۆژم بووبوو بە بیرکردنەوە و ئازارێکی بەردەوام .

بیرم لە رێگایەك کردەوە کە دەرباز بم و بێمە دەرەوە لەو بیری زەوڵم و تاریکاییەی کە تێی کەوتبووم ، کەسم شك نەدەبرد بێجگە لە سەحەری کچم نەبێت کاتێ مێردەکەم لەوێ نەبوو بانگم کرد و باسی مەینەتی خۆمم بۆ کرد، بە حەسرەتەوە دایە پرمەی گریان بە هۆی ئەو حاڵەتەمەوە وتی : بەراستی ساڵانێکی درێژی ژیانی خۆت و خۆشی ژیانت لە خۆت حەرام کرد لە پێناوی پەروەردەکردن و گەشەکردن و خوێندنی ئێمەدا لە سەر باشترین شێوە

بەراستی دایکێکی نمونەیی بوویت، ئەم هەموو مەینەتیەت بەسەردا دێت و واگومان دەبەیت بە تەنیا دەتوانیت ئارام بگریت ، خوایە گیان من داوات لێ ناکەم ئەوەی لە دەست چووە بیگێڕیتەوە، بەڵام داوات لێدەکەم بەزەیت بێتەوە پیایدا ، خوایە گیان دایکم پارێزراو بکە و دەردی تیمار بکە و رەحم بە دایکایەتی بکە.. بە تاس و شەوقەوە باوەشم کرد بە کچەکمدا کە وەسف ناکرێت و بە دڵدانەوەوە پێم وت : ئەوەی لە چارەمان نوسرابێت ناتوانین لێی راکەین ، گرنگ ئەوەیە چارەسەرێ بدۆزینەوە و لەم مەینەتیە دەرباز بین .

کچەکەم پەیوەندی کرد بە نەخۆشخانەی (الامل) و قسەی لە گەڵ پزیشکە بەرپرسەکەدا کرد و حاڵەتی منی بۆ باس کرد...ئەویش دڵنیای کردەوە وکاتێکی سەردانی بۆ دیاریکرد .

چەند هەفتەیەك مامەوە لە ژێر چارەسەرکردندا بە فەزاڵ و بەزەیی خوای گەورە چاك بوومەوە و دەرچووم لە نەخۆشخانە، هەرچەندە مێردەکەم هەوڵی دەدا چاك نەبمەوە تا وەکو لە گەڵیدا بمێنمەوە ، دوای ئەوەی پێم وت: تەنها بە چاك بوونەوە جیا دەبمەوە لێت .. سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە نارەحەتیدا تەنها سوپاسی ئەو دەکرێت...بە نهێنیەکی تەواوەوە چارەسەر کرام و جیابوومەوە لە مێردەکەم و گەڕامەوە بۆ ژیانی سروشتی خۆم، دوای ئەوەی بەربەستێکم دروست کردبوو لە بەردەم بەختەوەریمدا کە نەم توانیبوو بەباشی بیر لە تێپەراندنی بکەمەوە .

بە نهێنی دوعام بۆ هاوڕێکەم دەکرد ، یان ئەوەی کە خۆی ناونابوو هاوڕێی من تا لە پشت تێکشکان و ئازاردانی منەوە پارەی دەست کەوێت .

پەروەردگارا ڕەحممان پێبکە و لە کردەوە خراپەکانمان خۆشبە و وڵاتمان بپارێزە و ئومێدی دوژمنەکانمان پوچەڵ بکەرەوە .

(ماساة نورة و اخرين) : نوسینی: بهیه عبدالرحمن بوسبیت

# پاکیزەیم و مادە بێهۆشکەرەکان

ئافرەتێك هێنرایە نەخۆشخانە ، کە توشی حاڵەتێکی دەروونی توند بووبوو ، هیچ هۆکارێ لە هۆکارەکانی هێمنکردنەوە سودیان نەبوو بۆ هێمنکردنەوەی ، هەستاین بەلێدانی دەرزیەکی هێمنکەرەوە تا کەمێ بحەسێتەوە ، کاتێ هاتەوە هۆش خۆی دەستی کرد بە گریان و هاوارکردن و بە چنگ روومەتی خۆی دەڕنی .

بە بێ ئەوەی بزانین بۆ چی وا دەکات ، لەو کاتەدا داوام کرد لەوانەی کە لە ژوورەکەدا بوون بڕۆنە دەرەوە و تەنها من مامەوە لە گەڵیدا ، پێم وت : هۆکاری چیە ئاوات لێ بەسەرهاتووە .

دوای مل نەدانێکی زۆر بە سەرهاتەکەی بۆ گێڕامەوە و وتی : بەهۆی پێویست بوونی بە پارە بۆ کڕینی مادەی بێهۆشکەر پاڵی پێوە ناوە کە داوای بکات لە پیاوێك کە دەیناسی ، ئەویش پێیداوە بە مەرجێك مادە بێهۆشکەرەکە لە ماڵی پیاوەکەدا بخوات ، بۆیە لە ماڵی پیاوەکەدا خواردبووی و پیاوەکەش ئەم هەلەی قۆستبوویەوە بە هۆی کاریگەری مادە بێهۆشکەرەکەوە دەستدرێژی دەکاتە سەر ئافرەتەکە، کاتێ ئافرەتەکە دەزانێ چی لێهاتووە تووشی ئەو بارگرژیە دەماریە دەبێت کە بە هۆیەوە هێناویانە بۆ ئێرە ، دوای ئەوەی یەتەوە هۆش خۆی چارەسەری تەواوی بۆ دەکەین و و ویژدانی بە ئاگا دێتەوە .

(المخدرات بين النصيحة و الفضيحة / دار المستقبل : بيروت لبنان)

# کارە ئەویندارییەکانی کچێکی موعتاد

عەقید عومەر پشکنەری بنبڕکردنی مادە بێهۆشکەرەکان وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی بەیانی زوو چووە نوسینگەکەیەوە و پێش ئەوەی لە سەر کورسیەکەی دانیشێت بانگی یەکێ لە هەواڵنێرەکانی کرد تا داوا بکات فنجانێك قاوەی بۆ بێنن ، پێش ئەوەی هەواڵنێرەکە بڕوات و فەرمانەکە جێبەجێ بکات ،بە پشکنەر عومەری وت: کە زیاتر لە جارێك بەڕێوەبەر هەواڵی پرسیوە و دەیەوێت بەخێرایی بیبینێت .

پشکنەر عومەر رۆشت بۆ ژووری بەڕێوەبەر و کارگێڕی بینی زۆر غەمبار و بێتاقەتە کە لە سەر روخساری نیشانەی تورەیی نائاسایی دەبینرا، کاتێ کە عەقید عومەری بینی پشکنەر عومەر سلاوی کرد و بەیانیت باش گەورەم ، بەبێ ئەوەی بەڕێوەبەر وەلام بداتەوە نامەیەکی پۆستەی خستە سەر مێزەکە و بە تورەیی و سووربوونەوە وتی : جەنابی پشکنەر ئەم کارە ئەوینداریانەت با لە دەرەوەی کار بن ، نامەوێت ئەمە دووبارە بێتەوە ، پێویستە بە ئاگا بیت لەوانەی کە نامەی ئەوینداریت بۆ دەنێرن .

یان هەر شتێ تر پەیوەندی بە کارەکەتەوە نەبێت، تۆ خێزانداریت ئەگەر پارێزگاری لە کەسایەتی خۆت نەکەیت، بێگومان ئەرکی سەر شانی منە پارێزگاری لە پێشینەی فەرمانگەکەم بکەم و وە هەروەها ئەرکی سەرشانمە پارێزگاری لە تۆ و لەناوی تۆ بکەم و لە سومعەی تۆ بکەم .

پشکنەر عومەر بە هێواشی دەستی درێژکرد تا نامەکە بگرێت و بە بێ ئەوەی هیچ بلێت دەستی کرد بە خوێندنەوەی ناونیشانی نامەکە

....كۆماری میسری عەرەبی ، گۆڕەپانی (العتبە) بەڕێوەبەرایەتی بنبڕکردنی مادە بێهۆشکەرەکان.. بۆ خۆشەویستم عەقید عومەر موستەفا ، عەقید عومەر پێش ئەوەی زەرفەکە بکاتەوە بە جوانی دەستی کرد بە پشکنینی ، بەڵێ نامەیەکی ئەویندارى بوو بۆ ئەو نێردرا بوو ، پولی پۆستەی پێوە بوو لە میرنشینی عەرەبی سعودیەوە ، بە ورتە دەیوت : سعودیە ، کەس ناناسم لەوێ نامەی ئەویندارییم بۆ بنێرێت .

بە هێمنی نامەکەی دەرهێنا و کە نامەیەکی ئەویندارى بوو تا بیخوێنێتەوە :

خۆشەویستم عومەر : ئەمە یەکەمین نامەی خۆشەویستیە کەلە ژیانمدا دەینووسم دەڵێن : ئافرەت بە راستگۆیانە تەنها دڵی بە یەك پیاو دەدا لە ملیۆنێ جاریشا ئەك جار ئەو روودەدات ، بەراستی من تۆم خۆش دەوێت و عومەرێکی تریشم خۆش دەوێت و هەروەها مێردەکەشم خۆش دەوێت واتە : سێ پیاو لە دڵمدا هەیە وە خۆشەویستم خۆشتریش لە خۆشەویستیە یادگاریە تاڵ و شیرینەکانن پێکەوە ، من لە سەرەتادا دان بەوەدا دەنێم ، کە خۆشەویستی من بۆ تۆ خۆشەویستیەکی تاك لایەنانەیە ، چونکە من باش دەزانم تۆ مێردیت و سەرپەرەشتیاری خێزانیت و و خۆشت دەوێت و دڵسۆزیت بۆی .. رۆژێ لە رۆژان خۆشەویستیت لە گەڵمدا ئاڵوگۆڕ نەکردوەتەوە ، خۆشەویستی من نامۆیە لە بارودۆخێکی سەیردا لە دایك بووە ، وە هیچ فێڵێکم نیە لە مەدا ، بەڵکو لە چارەم نوسراوە کە سێ پیاوم لە یەك کاتدا خۆش بوێت ، مێردەکەم و کوڕەکەم کە ئایندەی منن ، تۆش کە

ئەو رابردووەی کە لە یادم ناچێتەوە ، هەرچەندە هەوڵ ئەدەم هەست بە ڕێسوایی و سوکی خۆم ئەکەم .
پشکنەر عومەر عارەقی دەردەکرد و بەرێوەبەریش لە پشت چاویلکە پزیشکیەکانیەوە چاودێری دەکرد ، عومەریش بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی نامەکە بە بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت .
نەیدەویست لەو قسە خۆشانە بە ئاگا بێتەوە ، پەلەی بوو تا کۆتایەکەی بزانێت و تا ئاشنا بێت بە خۆشەویستەکەی .
خۆشەویستم .. هێشتا وێنەی دژواری ئەو ڕۆژانەی رابردووم لە بیر و هۆشمدایە ، بە هەموو ئازار و دێوەزمەکانیەوە ، چاوانم دەنوقێنم و دەگەڕێمەوە بۆ دواوە چەند ساڵێکی کەم و خۆم دێتەوە یاد ، ئەو کچە بێتاوانە دانیشتووە لە شەمەندەفەرکەداکە لە (زەقایق)ەوە دێت و دەروات بەرەو (قاهیرە) لە سینەشمدا چەندین خەون و ئەنێشەم هەڵگرتووە ، باوکە بازرگانە گوندنشینە پاکەکەم دێتەوە یاد کە لە وێستگەی شەمەندەفەرەکەدا لە شارەکەماندا وەستا و خوا حافیزیم لێدەکات بۆ گەشتی یەکەمم بەرەو قاهیرە ، لە گەڵ هەستەکانیدا ، من خوێندنی ئامادەیم بە سەرکەوتوویی تەواو کرد ، چوومە کۆلێژی پزیشکیەوە ، باوکم بە توندی ڕێگری دەکرد لە قاهیرە نیشتەجێ بم و دوور بم لە خێزانەکەمان... لە کۆتاییدا ناچار پاڕانەوەکانی دایکمی قبوڵ کرد کە تاکە ئومێدێکی کچە پزیشکەکەی بوو .
بەو شێوەیە گوندەکەمان و خێزانەکەم جێهێشت و تا لەنێو قوتابیە کچەکاندا بژیم لە قاهیرە، بەو ئومێدەی خوێندنەکەم بە خێرایی تەواو بێت و بگەڕێمەوە بۆ گوندەکەم و لە سەر داواکاری دایکم و خەڵکانی گوندەکە (ئایا پزیشك نیم ).

وه بە رەوشت و ئاكار و هەڵسوكەوتی گوند نیشنانەی سادە ساڵی یەكەمم لە قاهیرە بردە سەر ، خەریك بوو دادەبڕام لە هاوڕێكانم ، تەنها ئاگام لە وانەكانم و سەعیكردن و خەو هەبوو ،ئەوساڵە سەركەوتنێكی باشم مسۆگەر كرد بە پلەی زۆر باشە(جیدجدا) .

ساڵی دووەم دەستی پێكرد و شانازیم بە دەرچوونم و بە پلەكەمەوە دەكرد ، بڕیارمدا بەردەوام بم لە سەر گرنگیدان بە وانەكان و سەعیكردن و خەتن ، بەڵام بێزار بووبووم لە كچەكانی هاورێم لە شوێنی نیشتەجێ بوونمان ، بووبوومە كاڵایەكی بەهادار بۆ گاڵتەكردنیان و تانە و تەشەردانیان لێم ، لە سەرەتادا تاونباریان دەكردم بەوەی من گوندنشینێكی گەمژەم، چونكە بەشداری لە ژیانیان و گاڵتەكانیان ناكەم و تەنها سەعی دەكەم.

لە ژێر كاریگەری هەندێ لە هاوڕێكانم تێكەڵ بووم لە گەڵیاندا و منیش وردە وردە هۆگریان بووم ، و دەستم كرد بە باسە راشكاوەكان سەبارەت بە ئەویندارییەكان ، وردە وردە دەركم بە ژیانی كچانی هاوڕێم كرد كە دەژیام لە گەڵیاندا ، نازانیت چۆن ژیانێكیان دەبردەسەر ، لە گەڵ هاوڕێكانم شەو تا دەرەنگانێك نەدەخەوتین ، سەما و جگەرەكێشان و پێكەنین و گاڵتەجاری .

شەوێكیان یەكێكیان جگەرەیەكی یامێ و منیش جگەرەم نەدەكێشا... پۆزشم هێنایەوە و ئەویش هەر زۆری لێدەكردم بۆیە منیش كێشام ، بۆنی زۆر سەیر بوو لە بۆن وبەرامی ئەو جگەرەیەی نەدەكرد كە باوكم دەیكێشا لە نێو پێكەنین و گاڵتەجاریەكاندا ئاگام لە خۆم نەما و پێكەنیم وەك ئەوەی پێشتر پێ نەكەنیبم بۆم دەركەوت كە جگەرەكە حەشیشی تیدایە و وای خستە مێشكمەوە كە خەم و خەفەت لادەبات..

ورده ورده راهاتم له سه‌ر جگه‌ری حه‌شیش... به دوایدا ئه‌گه‌رام و پاره‌م ئه‌دا به هاوڕێکم و لێی ده‌پاڕامه‌وه تا بۆم په‌یدا بکات .

شه‌وێکیان هاوڕێکه‌م هات تا پێم بڵێت که مۆڵه‌تی له سه‌رپه‌رشتیاری خانه‌ی قوتابیانه‌وه وه‌رگرتووه که له گه‌ڵ هه‌ندێ له کچی هاوڕێماندا بڕۆینه ده‌ره‌وه بۆ بینینی قاهیره به شه‌و .

پێش ئه‌وه‌ی پرسیاری لێ بکه‌م داوای لێکردم به خێرایی خۆم بگۆڕم و له گه‌ڵیدا چوومه ده‌ره‌وه به ئومێدی ئه‌وه‌ی جگه‌ره‌ی حه‌شیشم ده‌ست بکه‌وێت .

ڕۆشتین بۆ ماڵی یه‌کێك له‌هاورێ کچه‌کانمان که‌ناوی (ره‌باب) بوو.. بۆم ده‌رکه‌وت که خێزانه‌که‌یان له‌که‌نداو کارده‌که‌ن و ئه‌م کچه خۆی به ته‌نها له‌و شوقه‌یه‌دایه تا خوێندنی زانکۆ ته‌واو بکات ، ئای چه‌نده سه‌یر بوو به‌لامه‌وه که چوومه شوققه‌که‌وه ، مۆسیقایه‌کی ده‌نگ به‌رز و پێکه‌نین و سه‌ما کردنی کۆمه‌ڵێ لاوی کوڕ و کچ . چوومه ژووره‌وه به‌ڵکو پێویستیه‌که‌ی خۆم ( جگه‌ره‌ی حه‌شیش )م له‌وێ ده‌ست بکه‌وێت و پارچه‌یه‌کیش له حه‌شیش ، دوکه‌ڵ ئه‌و ناوه‌ی ته‌نی بوو ، یه‌کێك له هاوڕێ کچه‌کانم نزیك بوویه‌وه لێم و له‌فافێکی بچوکی پێچراوی بۆ هێنام ، کردیه‌وه و گیراوه‌یه‌کی سپی تێدا بوو داوای لێکردم بۆنه‌که‌ی هه‌ڵمژم ،ئه‌وه چیه ؟. ده‌ستی دوور خسته‌وه و خه‌ریك بوو تووڕه ئه‌بووم ، به پێداگرتنه‌وه وه‌ڵامم دایه‌وه من بۆن ناکه‌م.. ده‌نگی پێکه‌نین به‌رز بوویه‌وه و هاوڕێکه‌م لێم نزیك بوویه‌وه و هێمنی کردمه‌وه و جگه‌ره‌یه‌کی حه‌شیشی پێشکه‌ش کردم و به گاڵته‌وه هه‌واڵم پێدان که من هێشتا منداڵێکی بێتاوانم و ته‌نها جگه‌ره‌ی حه‌شیش ئه‌کێشم و جگه‌ره به دوای جگه‌ره‌دا ده‌م کێشا .

دوای پێنج جگەرە بێهۆش کەوتم و هاتمە هۆش خۆم تا بۆنەکە داوا بکەم و بۆ هاوڕێکانم بسەلمێنم کە من منداڵ نیم .

سەردانمان بۆ ماڵی (رەباب)ی هاوڕێمان چەند بارە بوویەوە و بۆنەکەش چەند بارە بوویەوە ، گەڕامەوە بۆ خانەی قوتابیان و کۆلێژ تا بە دوای بۆنەکەدا بگەڕێم... بە دوای (رەباب) دا دەگرام و نەم دەبینیەوە ، خەریك بوو شێت دەبووم گەشتی نەفرەت لێکراوم لە گەڵ ئەو بۆنەدا دەستی پێکرد... موعتاد بووم بە تەواوی... باوکم خەرجیەکی مانگانەی بۆ دەناردم کە ( ١٥٠) جونەیە بوو کەبە یەك چرکە و لە پێناو یەك بۆن هەڵمژین دەبوو بە هەڵم.. دەستم کرد بە فرۆشتنی خشڵ و زێڕەکانم و کرێی خانەی قوتابیانم پێ نەما ..

رۆژ و هەفتە و مانگ من لە فەوتانێکی تەواو دا بووم بە هۆی ئەو ژەهرە پیسەوە ، هەموو خانەیەکی جەستەم هاواری دەکرد و داوای هیرۆینی دەکرد و لە ئەنجامدا دوور کەوتمەوە لە کولێژ و وانەکان و سەعی کردن ، کاتێ ئاگادارکرامەوە کەدەرم دەکەن لە خانەی قوتابیان بە هۆی دواخستنی کرێوە... کەل و پەلەکەم کۆکردەوە و پێش ئەوەی بار بکەم لە بەردەم ئاوێنەکەدا وەستام تا ئەو دێوەزمەیە ببینم کە بە قژێکی ئاڵۆسکاوەوە و دووچاوی داچۆڕاو و روخسارێکی تێکچوو و جەستەیەکی شەکەت و ماندوو وەستاوە.

بە جانتای جلەکانمەوە رۆشتم بۆ ماڵی هاوڕێکەم و یەکەم جار جگەرەیەکی حەشیشی دا بەدەستمەوە و پێم وت زۆرم پێویست بە یەك بۆن هەڵمژین هەیە ، تا بتوانم بژیم تا بەردەوام بم لە رۆشتن... ئەویش سەرەتا داوای نرخەکەی کرد.. پێشنیارم کرد کە پۆشاکەکانم بکڕێت چونکە یەك ملیمم پێ نەبوو ، بەڵام ئەو رازی نەبوو.. چۆکم دادا بە

زەویـدا و قاچـەکانیم مـاچ کـرد و ڕووخـسارە ناشـرینەکەی وەرگێـڕا و ڕۆیـشت... لـە خانـەی قوتابیـان چـوومە دەرەوە و بەسـەرگەردانی بـە شـەقامەکاندا دەسـوڕامەوە.. هـەر دەبێـت بـۆنێکم دەسـت بکـەوێت ؟ ناکرێت بەم شێواز و ڕواڵەتەوە بگەڕێمەوە بۆ گوندەکەم و لای کەس و کارم .

بیرم کردەوە لە خۆکوشتن تا کەسوکارم دوور خەمەوە لەو حەیا چوونە ، ئیتر نـازانم چـۆن پێکـانم منیـان هێنایـە نوسـینگەکەت ( نوسـینگەی سـەید عمـر) و هاتمـە ژوورەوە تـا لێـت بپاڕێمـەوە کـە بمخەیتـە بەندینخانەوە ، بەڵام دوای ئەوەی کە بۆنێکی هیرۆینت بۆ ئامادە کردم هەتا یەکەم جار ڕزگارم بێت لە ئێش و ئازارەکانم... چونکە من موعتـاد بووم ..بە کورتی بە سەرهاتی خۆمم گێڕایەوە ، نازانم دوای ئـەوە چی ڕوویدا لەبەردەم نوسینگەکەدا لە هۆش خۆم چووم کاتێ هاتمەوە هۆش خۆم، خۆم بینیەوە لە سەر پێخەفێکی سپی لە یەکێك لە نەخۆشخانە تایبەتەکاندام بۆ چارەسەرکردنی موعتاد بوون .

یەکێ لە پزیشکەکان نزیك بوویەوە لێم و تا بە هەردوو چاوی پڕ لە خەم و پەرۆشیەوەپێکەوە تەماشام بکات ، تا مەچکەم بگرێت و دڵنیا بێت لە لێدانی دڵم .. لێم پرسی چۆن منیان هێنا بۆ ئێرە؟ پزیشکەکە بە چەند وتەیەکی کورت وەڵامی دامەوە: بیر لەوە مەکەرەوە ، گرنگ ئەوەیە کـە هاوکاریمـان بکـەیت لەچارەسـەرکردنەکەدا هـەتا ڕزگـارت بێـت لـەو حاڵەتەی کە تێیکەوتوویت .

لێم پرسی : چارەسەرکردنەکە چەندی تێدەچێت؟

وتی : هەزاران جونەیە .

وتم : ئەی ئو هەزاران جونیەە لە کوێ بێنم ؟

وتی : حسابەکە تەواو بووە خەرجی چارەسەرکردنەکە پێشتر دراوە .
بە سەرسامیەوە لێم پرسی کێ داویەتی ؟
وتی : عقید عومەر و هاوڕێکانی پارەکەیان بەتەواوی داوە .
خۆشەویستم، کاتی ئامادەبوویت و سەردانت دەکردم و چەپکێ گوڵت بە دەستەوە بوو باوەشم بۆ گوڵەکان و هەستەکانی خۆم دەکردەوە ، بەڵێ خۆشم ویستیت، ئاوێتەیەك لە خۆشەویستی خۆشکێك بۆ برا گەورەکەی کچێك بۆ باوکی نەخۆشێك بۆ پزیشکەکەی ، خۆشەویستی قوتابیەك بۆ مامۆستاکەی .
زۆرێك لە نەخۆشەکان و پەرستارەکان لێیان دەپرسیم ئەمە کێیە هەموو هەفتەیەك سەردانت دەکات وچەپکە گوڵیشی پێیە؟ منیش خەندەیکم دەکرد بۆیان و دەم وت :خۆشەویستمە و بەسەرسام بوونیانەوە وازم لێدەهێنان... شەو دەرەنگانێك دەمامەوە تا نەخۆشەکان دەخەوتن تا نوێژ بکەم و لە نوێژەکاندا بپاڕێمەوە بۆت و بۆ منداڵەکانت وبۆ ئەو دڵە کە هێشتا بە خێر و چاکە و خۆشەویستی لێدەدات ، هەفتەکان و مانگەکەکان تێپەڕین و منیش نەخۆشخانەم جێهێشت و هاتم بۆ نوسینگەکەت تا پێش سەفەرکردنم بۆ شارەکەی خۆمان بتبنینم و سوپاسی ئەو جوامێریەت بکەم... وە نازانم چۆن ئەو قەرزەت بدەمەوە کە بۆ منت خەرج کرد لە نەخۆشخانە ، هیچم لە تۆوە نەبیست تەنها پیرۆزبایی کردن نەبێت لە من بۆ چاك بوونەوە و بەختەوەربوونت بە هۆی رزگار کردنی منەوە لە تیاچوون و سەرگەردانی کە تێی کەوتبووم.
وەلە گەشتەکەمدا بۆ شارەکەمان لە یەکێ لە ئۆتۆمبیلەکانی کرێ ئاشنا بووم بە لاوێکی جوان و رێك و پێك کە روخساری پر بوو لە جوامێری و پیاوەتی و بۆم دەرکەوت کە کەشتیوانی یەکێ لە کەشتیە بازرگانیەکانە

و لە یەکێك لە شارەکانی کەنداو نیشتەجێیە و وتی : کە زۆربەی شارەکانی جیهانی بینیوە ، بەڵام لە روخساری مندا هەست بە بەرائەتی کچێکی میسری ئەکات و ئاشنا بووین بەیەك و دوای دوو رۆژ هات بۆ ماڵمان و خوازبێنی منی کرد لە باوکم و خوازبێنیمان راگەیاند ... زەواجەکە بە خێرایی ئەنجام درا تا گەشت بکەین بۆ کەنداو... ئاشنا بووم بە خۆشەویستی دووەمم لە ژیانمدا ، سەفەرەم کرد بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونم .

ناتوانم خواحافیزیت لێبکەم خوا حافیزی لە خۆشەویستی یەکەم ، سەفەرم کرد تا لە هێلانەی ژن و مێردایەتیدا بژیم ، دەستم کرد بە ژیانێکی نوێ ... منداڵەکەم لەناو سکمدا دەستی کرد بە جووڵە.. لێت ناشارمەوە کە چەندین جار تووشی دەمار گرژی دەبووم وحەزێکی زۆرم لە بۆنکردنی ئەو ژەرە پیسە دەکرد ، بەڵام بە هۆی ترسم لە کۆرپەلەی ناوسکم و وێنەی تۆ لە مێشکمدا بە پەلە دووریان دەخستمەوە لەو بیرکردنەوەیە ، ئیرادە و حەزی زۆرم بۆ تێپەڕاندنی قەیرانەکان یارمەتیاندام... هەستم بە ئازارەکانی سك بوون دەکرد ، پێش ئەوەی مێردەکەم بمبات بۆ نەخۆشخانە کردم بە مەرج بە سەر مێردەکەمەوە کە خۆم ناوی ئەو کۆرپەیەمان بنێم ، ئەگەر کور بوو... منیش بەناوی تۆ وە ناوم نا ...

عومەر .. ئاشنا بووم بە خۆشەویستی سێیەم لە ژیانمدا.. پێش سەفەرکردنم نەم ئەتوانی خوا حافیزیت لێبکەم؟

بەڵام ئەوەی لە ناخمدایە بەهێزترە لەوەی لە هەموو وشەیەك یان عیرفانێك.. بەراستی منت لە فەوتان رزگار کرد.. ئێستا بیردەکەمەوە لە تەواو کردنی خوێندنی زانکۆ تا خەونی دایکم بێنمە دی من ئێستا کە

ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم لە سەر جێگا کەوتووم و لە پاڵیشمدا کۆرپەی یەکەممان کە خۆشەویستی دووەمە راکشاوە ، وە ئازیزترین ناوی خۆشەویستی یەکەمم لێناوە .

مجلة الامن والحياة / ژمارە ١٣٠

# هاوڕێی خراپ هۆکاری مەینەتیم بوو .

(ڕوان) ئـافرەتێکی کەنداویـە ، زۆر ڕارا بـوو تـا قـسە بکـات ، وە بـە نارەحەتیـەوە وتـی: مـن قوربـانی هـاوڕێی خـراپ بـووم ، هاوڕێیـەتی ڕاستەقینە منی کۆکردبوویەوە لە گەڵ یەکیّ لە هاوڕیّ کچەکانم لەو زانکۆ تایبەتەی کە دەمخوێند تیایدا .

سەردانی زۆری دەکردم.. لەم دواییەدا هاوڕێیەکی سەرەڕۆ و خراپی لێدەرچوو ، سروشتێکی سەیری هەبوو ، هەوڵمدا نهێنی سەرەڕۆیەکیم بۆ ئاشکرا بێت تا بتوانم دەری بێنم لەو مەینەتە ، بەڵام پیّ ی نەوتم و هەر دەسی دەسی پێدەکردم .

ڕۆژێکیان توشی سەرئێشەیەکی توند هاتم ، ئەو هاوڕێیەم لە لام بوو لە جانتاکەیدا لەفافێکی بچوکی دەرهێنا کە گیراوەیەکی سپی تێدا بوو وتی : بۆنی ئەم دەرمانە هەڵمژە و ئازارەکەت نامێنێت ، بۆیە کاتیّ وام کرد ، هەستم بە حەسانەوەیەکی سەیر کرد ، وەك ئەوەی دونیا بووبێت بە بەهار ، لە پڕ هاوڕێکەم ڕۆشت.. بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی لە هەمان کاتدا جارێکی تر هەستم بە سەر ئێشە کردەوە ، پەیوەندیم بە هاوڕێکەمەوە کرد و بە پەلە هات بۆ لام و لە فافێکی پێبوو .

بۆ ڕۆژی سێیەم ڕاستی شتەکەم بۆ دەرکەوت ..بووبوو بە ئەندام لە یانەی (هیرۆین) بۆ خۆی و بۆ منی دەکڕی هەتا پارەم پیّ نەما.. نەم توانی بۆ چەند مانگێك کریّ بدەم، خاوەنی شوێنەکە چەند جارێك ئاگاداری کردمەوە ، لە ڕێگای دادگاوە مۆڵەتی وەرگرتبوو کە دەست بەسەر کەل و پەلەکانمدا بگرێت هات تا بڕیارەکە بسەپێنێت بەسەرمدا و منیش هێرشم کردە سەری ، پەیوەندی کرد بە پۆلیسەوە و ئەوانیش

**هـاتن شـوێنەكەیان پـشكنی و بینیـان لـەفافی هیرۆیـنم پێیـە و بۆیـە بردمیان بۆ بەندینخانە و بەو شێوەیە ژیانم بە بەند كردن كۆتای هات بە هۆی هاوڕێی خراپەوە .**

**تكا دەكەم ئاگاتـان لـە خۆتـان بێت ..ئاگاتـان لـە خۆتـان بێت لـە هـاوڕێ خراپ .. ئەی كچانی موسوڵمان .**

**گۆڤاری (سیدتی) ژمارە ١١١١**

# دایکم پاڵی پێوە نام بۆ موعتاد بوون

( ن) کچێکە دایکی تۆمەتبار دەکات کە پاڵی پێوە ناوە بۆ موعتاد بوون چونکە زیاد لە پێویست نازی پێداوە و هەوڵیداوە ئەو کچەی بکات بە (ستایل)ێك بۆ کوڕان تا بەدوایدا رابکەن .

رێگایەکی باشی دۆزیەوە تا پەتەکە لە پشتەوە جێبهێڵێت بۆیە پەتەکەی لە پشتەوە جێهێشت بۆ کچەکەی تا ئاشنا بێت بە کوڕێك و بە تەنها لە گەڵیدا بچێتە دەرەوە بە بێ ئەوەی دایکی هەوڵ بدات چاودێری هەڵسوکەوتی کچەکەی بکات تا دەرکی بە مەینەتیەکە کرد.. بەڵام زۆر درەنگ بوو ،

لە راستیدا دایکیشی سەرگەردان و موعتاد بوو.. بەڕاستی کێشەکە زۆر نالەبار و نارەحەتتر بوو کاتێك دایك و کچێك پێکەوە یەك ئامانجیان هەبێت.. ئەویش موعتاد بوون و سەرەڕۆیی و تیاچوونە ، چونکە ماناکەی تیاچوونی بەها و مانای دایکایەتیە کە تەنها دەگۆڕێت و دەبێت بە نازناوێك .

العرب ئۆن لاین

# برینی کۆن

لە پاڵ مێردەکەیدا دانیشتبوو ... کە شتی دەنووسی ، پیاوێکی هێمن و سادە و خۆشەویست بوو ، بەرگەی زۆری ئەمی گرتبوو لە ئارامگرتن و بێدەنگی .. تاوانی ئەم پیاوە چیە ؟

ئافرەتەکە لە خۆی پرسی ، بۆچی ئازاری بدەم ئەو بەرپرس نیە لەو پۆخڵەواتەی لە ناخمدایە .

ئەو ئازار دەکیشێت ، بەڵکو ئازارەکەم لە جەستەیدا دیارە ، بەردەوام سەردانی پزیشك دەکات ، هەموو ئەمانە لەبەر ئەوەی خۆشی ئەوێم ، من چۆنم ئاوا بەرگەم دەگرێت کەواتە من کێم ؟

من ئافرەتێکم وام لێهاتووە متمانەم بە هیچ پیاوێك نەماوە، دوای ئەزمونێك کە لە گەڵ مێردێکی ناپاك و خراپدا بردمە سەر.. هەوڵم دەدا برینی کۆن لە بیر کەم بەڵام سوودی نەبوو ، شتێك لە ناخمدا جەختی لە سەر ئەوە دەکردەوە کە هەموو پیاوان وەك یەك وان .

هەموویان ناپاك و درۆزنن.. هیچ بەڵێن و پەیمانێکیان بەلاوە نیە چۆن کەسێکی خوێندەواری وەکو من قسەی وا دەکات ، چۆن ناخم پر بووە لەو تۆمەتانە بەرامبەر بە رەگەزی پیاو لە گۆی زەویدا ، لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا ؟ چۆن بە هۆی تاوانی یەك پیاوەوە زوڵم لە هەموو پیاوان دەکەم.. لەوانەش مێردە زۆر چاکەکەم کە ئازاردەکێشێت بە هۆی ئەوەوە کە متمانەم پێی نیە وەك پیاوێك و مێردێك و باوکی منداڵەکانم .. من رازی نیم پێی بڵێم موچەکەم چەندە ، بە ئاوازێکی توندەوە پێی دەڵێم مافی تۆ نیە کە بزانیت موچەکەم چەندە، وەك چۆن من پرسیار ناکەم سەبارەت بە موچەکەی تۆ ! ئەویش بێدەنگ دەبوو ... زیاتریش

لەوە من هاوکاریم نەدەکرد لە گەڵیدا بۆ کڕینی هیچ کەلوپەلێك و خەرجی ناوماڵ ، هەر لە ساتی هاوسەر گیریمانەوە پێم وت ئەوە ئەرکی سەرشانی پیاوە بە تەنها ، نامەوێت شتەکان بگۆڕیت ، تەنها من کرێی کارەکەرەکەمان دەدەم کە لە کاتێکدا من لە ماڵەوە نیم و لە سەر کارم هەڵدەستێت بە ئیشەکانی من ، بەڵام بێجگە لەوە تۆ بەرپرسیت لە هەموومان و خەرجی من و منداڵەکانت دەکێشیت ،لە رووی شەرعەوە ئەمە ئەرکی سەرشانی پیاوە.. ئەویش (مێردەکەم) بێدەنگ دەبوو خۆزگە تورە دەبوو، یان گوزارشی لەوە دەکرد کە لە ناخیدا هەیە.. بیدەنگیەکەی بێتاقەتی دەکردم و دەروونی پارچە پارچە دەکردم و وای لێدەکردم کە بیر لەوە بکەمەوە کە ئایا پشت گوێم دەخات ؟یان پیاوێکی لاوازە و ناتوانێت بەرەنگارم بێتەوە بە هێز وەك مێردی یەکەمم کە رقم لە ناوی و یادگاریەکانیشیەتی ، ئایا بێدەنگیی پیاو هەمیشە لاوازیەتی ؟

کاتێ مێردەکەم راپۆرتە گرنگەکەی تەواو کرد سەبارەت بە کارەکەی لای کردەوە بە لامدا و وتی : بۆچی ئێستا دانیشتوویت لە پاڵمدا ؟

چۆن دوای ئەم هەموو شەونخونیە بەیانی زوو دەچیتە سەر کارەکەت ؟ ئایا پێویستیت بەهیچ هەیە ؟

نەمتوانی خۆم بگرم ، فرمێسك بە چاوانمدا هاتە خوارەوە و وتم : ئەی ئایا تۆ پێویستیت بە هیچ شتی تر هەیە؟ وا هەست دەکەم چەند رۆژێکە ئاسایی نایەیتە بەرچاوم ؟ ئایا هیچ کێشەیەکت هەیە لە سەر کارەکەت یان لە ماڵەوە ؟ بە خەندەوە وتی : نەخێر ئازیزم ، هەموو شتەکان ئاسایین، تەنها گەدەم ئازاری هەیە ، ئازارم دەدا خواردنی سوك

بخۆم یان قورس ، پێدەچێت گەورە بووبووم بەڵام ماشەڵلاً تۆ جوانتر دەبیت .

لە پڕ بینیم دەریایەك لە خوێنی هەڵهێنایەوە و لە هۆش خۆی چوو ، هاوارم کرد .. تەلەفۆن .. دکتۆر .. نەخۆشخانە... چووین بۆ نەخۆشخانە.. لەوێ پزیشك جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە ئاگاداری تووڕە بوونی مێردەکەم بم و هیچ پەستانێکی نەخەمە سەر و کاری ئاسان ئەنجام بدات .

دوای چەند رۆژێك گەڕاینەوە بۆماڵەوە و مێردەکەم بزرکاو ولاواز بووبوو.. وات هەست دەکرد کە خەیاڵە.. خۆی دابوو بە سەرشانمدا داوای لێبوردنی دەکرد کە ئەو چەند شەوە درێژە لە نەخۆشخانە منی نارەحەت کردووە ، بەردەوام سوپاسی دەکردم و سۆزو خۆشەویستی خۆی دەردەبڕی وتی : من نازانم چیم بکردایە ئەگەر خوای گەورە ژنێکی پێنەبەخشیمایە سۆزدار نەبووایە لە گەڵم وەك تۆ بەراستی من زیاتر لە خۆم تۆم خۆش دەوێت ، بەڵام دەبمە بار بەسەرتەوە ، چونکە گەدەم بە تەواوی کەڵکی نەماوە و لە حاڵەتێکدایە جێی بەزەییە ، رووخسارم فرمێسك تەنی بووی ، مێردە چاکەکەشم هەستی پێ نەدەکرد ، بەڵکو هەر بەردەوام لە خۆی دەبوویەوە بۆمن ، نەیدەزانی بەو قسانە من دەکوژێت چونکە بەڕاستی ئازاری زۆرم دابوو بە گومانم بە لە دەستدانی متمانە و توندوتیژی نواندن ، بەڵام ئەو پیاوێکی دڵ ناسك بوو ، ئێستا تەنها بیر لە هەست و سۆزی من دەکاتەوە لە گەڵیدا کە ئەو نەخۆشە و راکشاوە و لە نەخۆشخانە!

ئای لەو دڵە رەقم چەندە خراپ بووم لە گەڵ ئەو پیاوەمدا هەتا نەخۆشم خست ، ئاه لە خەیاڵی نەخۆشم ، سزای پیاوێکی بێتاوانی دا لەبری تاوانی پیاوێکی تر ...

مێردەکەم وەکو منداڵێکی بزرکاو خەوت ، منیش رۆشتم بەرەو نوسینگەکەی تا ئەو دوا راپۆرتەی ببینم کە نەیناردبوو بۆ سەرکارەکەی بە هۆی نەخۆشیەوە ، زۆر سەرسام بووم کاتێ ئەو لاپەرەیەم بینی کە مێردەکەم شتی تیا دەنوسی کەبریتی بوولە قەرزەکانی .. بۆم دەرکەوت کە برێك پارەی زۆری لە یەکێك لە هاورێکانی قەرز کردووە و پێی نەوتووم ، بەڵێ ئەو برە پارەیە ئۆتۆمبیلەکەی پێ کریبوو کاتێ داوام لێکردبوو کەواتە بۆیە ئەو شەوە مێردەکەم درەنگ خەوتبوو خەفەتی ئەو قەرزە زۆرەی هەبوو وە بە منی نەوتبوو ، چونکە ئومێد براو بووبوو لە وەی کە من یارمەتی بدەم.

ئای چەندە من خراپم لە ئەزمونێك کە خەریکە متمانە لەناخمدا ناهێڵێت ، ئای لەو رابردووەی کە خەریکە ئێستام تێك دەشکێنێت .

بۆ بەیانی رۆژی دوایی چوومە لای مێردەکەم کە چای دەخواردەوە هەموو خشڵ و زێرەکانی خۆمم دانا لە بەردەمیدا وە هەموو پارەیەکی پاشەکەوت کراو و ژیانیشم لە بەردەمیدا دانا تێر گریام بەڵکو لەو کردەوانەم خۆش بێت کە لە ساتی یەکەمی هاوسەرگیریمانەوە کردوومە بەرامبەری ، چونکە لێبوردەیی ئەو بۆ من شیفایە بۆ هەموو ئەو رق و کینەیە کە هەمبوو بەرامبەر بە پیاوان .

المجلة العربية ژمارە ٢٣٦

# ملوانەکەکەم لێ مەدزن چونکە هەتیوم

ساڵی ٢٠٠٣ ز سەرەتاکەی ڕۆژیەکی باش و بەروبومێکی باشی هەبوو ، بەڵام کۆتاییەکەی خەمۆکی و بێتاقەتی دڵمی داگیر کردبوو ، بەڵکو هەتا ترسانیش لە خوای گەورە و باڵادەست بەڵام ئازاری ویژدان کاریگەریەکی زۆری هەبوو لە سەر دەروونم ، لە بەر ئەوە شەو خەوم لێنەدەکەوت ، تەنها ساتانێکی کەم نەبێت ، بۆیە هەوڵم ئەیا نەچمە سەر جێگاکەم هەتا باوێشك زۆرم بۆ نەهێنێت و ماندوو بوون زاڵ نەبێت بەسەرمدا .

مەبەستیشم ئەوە بوو کە ئەم منداڵە بچکۆلەیە لە خەودا نەیەت بۆم لە گەڵ ئەوەشدا لۆمەی دەکردم لە سەر تاوان و هەڵەیەك کە من کردبووم دەرهەق بە ئەو رۆژێك لە ڕۆژان ، بۆیە ژیانی لێ تاڵ کردبووم، بەڵکو خەویشی لێ تاڵ کردبووم و مەزاجی تێك دابووم.. کاتێکیش لە خەو هەڵدەستام نەم دەتوانی خۆم بگرم و بە حەسرەت و پەشیمانیەوە دەگریام... لە سەر ئەو کردەوەیەی کە کردبووم، بەڵام تازە هیچ سوودی نیە ، کارەکە تێپەڕی بوو و کۆتایی هاتبوو .

دەڵێم ئاین یان ڕەوشت ڕۆژێ لە ڕۆژان بەری لێنەگرتم لە سەر ئەوەی کە کردوومە بەڵکو دڵنیا بووم کە من ویژدانم نیە ، ئەگەر وا بووایە ئەوا ئەو ویژدانە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ئازاری ئەیام ، و هەموو شتێك کۆتایی دەهات و ئاسەواری نەدەما لە دڵمدا ، یان کارەکەم ئاشکرا دەبوولای خەڵکی و پیاوانی ئاسایش.. ئەوەش شتێ بوو من بە دوورم دەبینی ، ئەوە هەستی هەموو دزێکە پێش ئەوەی تاوانەکەی ئەنجام بدات... لەسەر ئەو بنچینەیە و بنەمایە و پێویستی زۆرم بە پارە ، بیرم لەوە

دەکردەوە کە چۆن بە ئاسانترین و سادەترین رێگا و بەبێ ماندووبوون دەستم کەوێت.

کە من ئافرەتیشم ، بەلأم چۆن ؟ تا ئەو رۆژە هاتە پێشەوە کە بانگ هێشت کرام بۆ زەواجی کچێکی هاورێم لە خوێندنگا... لە رۆژی دیاریکراودا رۆشتم وبیرۆکەی بەدەست خستنی پارە هەر لە بیر و هۆشمدا بوو ، بەڵکو زاڵ بووبوو بەسەر بیرکردنەوەمدا .

کاتێ چوومە هۆڵەکەوە بە راشکاوانە دەیڵێم زێڕ و ئاڵتونێکی زۆرم بینی ، وەك ئەوەی کەوتبێت لە زەویدا و پێویستی بە کەسێك هەیە بیبات ، ئافرەتانم دەبینی خۆیان رازاندبوویەوە بەو کانزا گرانبەهایە و بڕێکی زۆر لە دەست و ملیاندا بوو ، وە بەسەریانەوە بوو تەنانەت بە قاچیشیانەوە، لەو کاتەدا هەستم دەکرد کەکاری من ئەوەیە ئەو زێڕانە بەرم ... ئەمە ئەو فرسەتە گرنگەیە کە من بە دوایدا دەگەڕێم لە هەمان کاتدا دەنگی گۆرانی و سەماکردن یارمەتیدەرم بوون بۆ ئەنجام گەیاندنی تاوانەکەم ، ئافرەتەکان سەرقاڵ بوون هیچ ئاگایان لە زێرەکانیان و لە کچە بچوکەکانیان نەدەبوو.. وازیان لێهێنابوون بگەڕێن و یاری بکەن بە چواردەوەری هۆڵەکەدا ، زێریش بەملیانەوە و بەدەستە بچوکەکانیانەوە بوو .

لەو کاتەدا بیرۆکەکە بە ئاشکرا هات بەبیرمدا و بە خۆمم وت: چی تیایە با بەختی خۆم تاقی بکەمەوە و بائەم جارە دزی بکەم ، با ملوانەکەیەك یان موسیلەیەکی بچوکیش بێت.. بەلأم لەمپەرێکی بچوك کارەکەمی وەستاند ، ئەویش ئەوەبوو چۆن ئەو کارە ئەنجام بدەم ، بەلأم زۆر بەخێرایی فیکرەیەکی جەهەنمیم بۆ هات و بە خێرایی لە هۆڵەکە رامکرد بۆ دەرەوە بۆ لای نزیکترین فرۆشیار ..

هەندێ لەو شیرینیانەم کڕی کە منداڵانی بچوك حەزیان لێدەکرد ، مەبەستی من لەوەدا راوکردنیان و هەڵنانیان بوو بۆ ئەو خواردنە.. بۆیە بیرۆکەکە سەری گرت و یەکێکیانم ماچ کرد و دڵنیام کە چوار ساڵی تێنەپەراند بوو بڕێکی زۆر خشڵ و زیوی پێوە بوو منیش دانەویمەوە بۆی و بەخۆم وت : ئا ئەمەیە نێچیرەکە ئەمەیە قوربانیەکە، بە قسەکردن سەرقاڵم کرد و پارچەیەك لە شیرینیەکەم پێدا و بەو شێوازە توانیم بازنەکان لە دەستەبچوکەکانی دابکەنم و بە خێرایی لە هۆڵەکە هاتمە درەوە.. بەڵام راستیتان پێ دەڵێم ، ئەو شەوە هەستم بە ئازاری ویژدان دەکرد هەرچەندە دڵخۆش بووم بەو دەستکەوتە کە ئەو دزیە بچوکە بوو. فرۆشتم و پارەکەیم وەرگرت .

لە سەر ئەو بنچینەیە و ئەو سەرکەوتنە ، بڕیارمدابوو جارێکی تر کارەکە تاقی بکەمەوە و بەمەرجێك پەچە بکەم بە روخسارمدا هەتا کەس نەمناسێتەوە ، و لە گەڵ هامۆشۆکەراندا وەك ئەوەی بانگ کرابم یان منیش لەوان بم بەو شێوەیە ئەزموونەکەم چەندین جار دووبارە کردەوە .

بەدرێژایی ساڵێکی تەواو واتە ساڵی ٢٠٠٣ من بە درێژایی هەفتە سەرقاڵ بووم و دەچوومە هۆڵەکانی ئاهەنگ گێڕانی زەواجەوە ،پارەیەکی زۆرم دەست دەکەوت... تا شەوێکیان چوومە یەکێ لە هۆڵەکانەوە دانیشتم و بەدوای نێچیردا دەگەڕام بە گۆشەکانی هۆڵەکەدا ، بینیم لە دوورەوە منداڵێك دانیشتووە ، وەك ئەوەی نەیەوێت بەشداری ئاهەنگەکە بکات .

منیش فرسەتەکەم قۆزتەوە و بە خۆمم وت : بەراستی ئەمە نێچیرەکەیە وئەمە دەستکەوتەکەیە، بە هەنگاوەکانم بەپەلە چووم بۆ لای و

خەندەیەکی درێژم خستە سەر روخسارم بۆی ، خواردنیشم بە دەستەوە بوو ، کە هەندێ شیرینی بوو منداڵان حەزیان لێدەکرد... دانەویمەوە بۆی و پێم وت : کچی جوان ناوت چیە ؟ وتی ( شعاع ) وتم: لە پۆلی چەندی ؟ وتی : چوارەمی سەرەتایی و بە یەکەم دەرچووم و پێم وت : نزیك بەرەوە تا پیرۆزبایت لێ بکەم و سەرت ماچ بکەم و ئەم شیرینیەت بەمێ ، بەڕاستی عاقڵیت و شیاوی هەموو شتێکیت.. کچە داماوەکەش بە بەرائەتی منداڵانەی خۆیەوە نزیك بوویەوە لێم ، لەو کاتەدا دەستی راستم درێژ کرد تا پێچ بکاتەوە بە دەوری ملیدا و و ملوانکەکە لێبکاتەوە و کچەکەش خێرا هەستی کرد و پێی وتم : ملوانکەکەی ملم مەدزە من هەتیوم ، بێجگە لەو کەسی تر بۆی نەکڕیووم ) منیش بەهۆی قسەکانیەوە دەستم کیشایەوە دواوە، بەلاّم لەبەر ئەوەی مرۆڤێك بووم ئاین و رەوشت داڕنرا بوو لێم و ویژدانم مردبوو، پێم وت : کچی خۆم مەترسە تەنها حەز ئەکەم ئەو ملوانکەیە ببینم کە خۆتت پێ رازاندوەتەوە چونکە جوانە و هەتا منیش یەکێك لەو شێوەیە بکڕم بۆ کچەکەم ... نزیك بویەوە لێم و بڕوای پێکردم و دایکەند و دایە دەستم و منیش شیرینیەکەم دایە دەستی... ئەو سەرقاڵی شیرینیەکە بوو..منیش بە خێرایی لە هۆڵەکە هاتمە دەرەوە و بە خێرایی بەرەولای ئۆتۆمبیلەکەم رۆشتم ، گەشتمە ماڵەوە و کاتێك خۆم دا بەسەر جێگاکەمدا بۆ یەکەمین جار هەستم کرد بە پەشیمانی ، بەڵکو ئارەق بەتەویڵمدا دەهاتە خوار ، هەتا لێدانی دڵم زیادی کرد و هەستم بە ترسێکی زۆر کرد و ویستم چاوم بنوقێنم و و بخەوم ، بەلاّم چەند ساتێکی نەبرد و تیشکێك لە خەومدا دەهات بۆم و دەگریا ودەیوت : ( کوا ملوانکەکەم باوکم زۆری لێداوم، تەماشای جەستەم بکە ئەوە

ئاسەواری لێدانەکەیە و بە ئاشکرا دیارە ، تکات لێ دەکەم بمدەرەوە )
هەستام لە خەو بە تۆقیوی و سەیری لای راست و چەپی خۆمم کرد ،
چونکە دوور نەبوو کە ئەو منداڵە لە ژوورەکەمدا بێت .

لە سەر ئەوە و لە سەر ئەو هەستە ناخۆشە کە دەتلامەوە پێوەی
بڕیارمدا واز لە چالاکیەکانم بهێنم بۆ ماوەیەکی دیاریکراویش بێت ، تا
بحەسێمەوە ، بەڵام تیشکێك دوای دوو رۆژ بۆ جاری دووەم بۆم هاتەوە
، ئەو قسانەی کرد کە جاری یەکەم کردنی ، تەنها لەوساتەدا هەستم بە
گەورەیی ئەو تاوانە کرد کە من دەیکەم و بڕیارمدا تەوبە بکەم و واز لە
دزینی ئاڵتون وزێڕی منداڵان بهێنم لە ئاهەنگەکاندا.. وە بەهۆی ئەو
کچە هەتیوەوە بڕیارمدا تەوبەیەکی راستەقینە بکەم و بگەڕێمەوە بۆ لای
خوا.. ئەوەش کاتێك بۆ جاری یەکەم نوێژم کرد و داوای لێبووردنم
لەخوای گەورە کرد ، ئێستاش لە سەر ئەو رێگایەم و دەخوازم
بەردەوام بم لە سەری تا خوای گەورە رۆژێ لە رۆژان گیانم دەکێشێت
لەگەڵ تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بە سەر دواهەمین دزیکردندا ، وە
دواهەمین خەوبینین بەو منداڵەوە، بەڵام هێشتا وێنەکەی لە بیر و
هۆشمدایە و لە خەودا دێت بۆم با مانگی جارێکیش بێت لە هەمان
کاتدا شوێن نەماوە نەچم بۆی و سۆراخی ئەو کچەم نەکردبێت بەڵکو
(شعاع) لەوێ بێت تا لەناویاندا ئەو مالوانەکەیەی بدەمەوە کە لێم دزی
بوو... چونکە هێشتا نەم فەوتاندبوو ، لە هەمان کاتیشدا هێشتا
ویژدانم لەو کاتەوە ئازارم دەدات، بە هۆی ئەوەوە هێشتا
نەحەساومەتەوە یان بە بەختەوری بژیم .

هەتا دیدۆزمەوە و ئەو ملوانکەیەی دەدەمەوە کە رۆژێ لە رۆژان لێم دزی بوو... دەخوازم ئەو رۆژە بێتە پێشەوە بەڵکو ئەو ساتەی کە دەگەم بە (شعاع) زۆر نزیکە .

رۆژنامەی (الهدف) ی کویتی ژمارە ١٨٦٧

# دایکی خۆشەویستم ... ژیانمی ویران کرد

کاتێك لەدایك بووم وەك پیشینان دەڵێن کەوچکێکی زێڕ لەدەممدا بوو، من لە خێزانێکی دەوڵەمەند بووم ، بەڵام ئەو دەوڵەمەندیە هیچ شتێکی نەدەگۆڕی ، چونکە زیادەڕۆیی لەنازدان بە کوڕان و کچان سات بە سات ڕەوشتیان بەرەو خراپی دەیانبات .. پاشان زیادەڕۆیی ونازپێدان تەنها لەناو خێزانە دەوڵەمەندەکاندا نیە، بەڵکو خێزانە هەژارەکانیش، دایك زیادەڕۆیی دەکات لە نازدانی بە کوڕ و کچەکانی ، هەتا دەبێتە هۆی تیاچوونیان ، چونکە هەڵدەستێت بە هەموو کاروبارەکانیان . بەڵکو کێشەکانیان دەگرێتە ئەستۆی خۆی .

لەناخی خۆیدا دەڵێت : هەموو شتێك واز لێبێنن بۆ من من قبوڵی دەکەم لێتان... بەلای منەوە ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە کە دایکم و دایکانی تریش تێی کەوتبوون، کە بەراستی ڕێزم هەیە بۆیان بەڵام من جیاوازم لەگەڵیاندا سەبارەت بە شێوازی پەروەردەکردنیان .

هەر کە هۆشم کردەوە بەم دنیایەدا و وردە وردە لەشتەکان تێدەگەیشتم خۆم بینیەوە کە نازێکی سەیرم پێدەدەن ، هەرچەندە تەمەنیشم بچوك بوو ... بەڵکو ئەو ساتانەی دەستم دەکرد بەگریان دایکم بەتایبەتی وای هەست دەکرد کە دنیا لە بەر چاوی ڕەش بووە ، هەرچەندە وەکو وتم من تەمەنم بچوك بوو ، ڕۆژێکم نایەتەوە یاد کە داوای شتێکم کردبێت و ئەو ڕۆژە بۆیان پەیدا نەکردبم لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بەڕاستی ناهەقی دایکم ناگرم ، ئەگەر بەڕادەیەکی مەعقوڵ بوایە.. بەڵام کاتێکیش گەورە بووم پێویست بوو بەشێك لە بەرپرسیاریەتی من هەڵگرێت و واز لە من بێنێت لە ژیانمدا پشت

بەخۆم ببەستم با کەمێکیش بووایە... بەڵام دایکم خوا ڕێنمایی بکات ژیانی تەرخان کردبوو بۆ من ، کە ئەوە هەڵەیەکی گەورە بوو ئەو تێی کەوتبوو، منیشی لە گەڵ خۆیدا تووش کردبوو ، کاتێ گەورە بووم نازپێدانی زیاتری کرد ، نەیدەهێشت پشت بە خۆم ببەستم و هەتا لە سەعیکردن و تەواو کردنی پێویستیەکانی ماڵەوەشدا .

ئەو دەیەویست یارمەتیم بدات بەو کارەی بەڵکو ئاسایی بوو بەلایەوە هەموو شتەکانی قوتابخانەم بۆ بنوسێتەوە، خۆزگە کارەکە هەر بەوە بوەستایە ، بە خوا سوێند ئەخۆم ئەگەر پێم بووتایە بەدەستی خۆت خواردنم بدەرێ یەك دەقیقە دوا نەدەکەوت ، بەڵکو هەتا پێم بووتایە : دایکە وەرە پۆشاکەکانم لەبەربکە رای دەکرد و ئەهات تا ئەو کارە بکات ، ئەم دایکە هیچ کارێکی لە ژیاندا بۆ من نەهێشتەوە ، ئەو لەبری دەست و قاچم هەڵدەستا بە کارەکان، لە لای هەموو خزمان و ناسراوان و هاوڕێیان بەرگری لێدەکردم، دەیخستە مێشکیانەوە بەڵکو ناچاری دەکردن کە بڕوا بکەن من لە سەر هەق و راستیم تا وام لێهات وبڕوام کرد هەرشتێ من دەیکەم بە تەواوی راستەقینەیە.. ئەوەشی بە هەڵەم دابنێت با لە کارێکی سادە و بچوکیشدا بێت بە سەرسورمانەوە و هەندێ جار بە سەرزەنشتەوە تەماشام دەکرد، تا بووم بەکچێکی نازدار کە رانەهاتبوو کەس لە ماڵەوە بە هەڵەی بخاتەوە ، بەو شێوەیە لە سەر ئەو پەروەردە و شێوازەی دایکم مامەڵەی لە گەڵدا دەکردم گەورە بووم، بە شێوەیەك وا گومانی دەبرد کە باشترین ڕێگای پەروەردەکردنە ، وە رۆژێ لە رۆژان بیری لەوە نەکردبوویەوە کە کوڕ و کچەکانیان کاتێ پشت بە خۆیان دەبەستن بەختەوەریە بۆ باوك و دایك ، بەڵکو متمانەیان واتە متمانەی منداڵەکان بە خۆیان ترۆپکی پەروەردەکردنە، بەڵام زۆر

به داخەوە ئەو جۆرە شتانە نەنزیك و نەدوور بە بیر و هۆشی دایکمدا نەدەهات .

هەولّم دەدا بەری لێبگرم و رێی لێبگرم ، بەڵکو چەندین جار رێم لێ دەگرت و بەراشکاوانە پێم دەوت کە ئەو جۆرە شیواز و مامەڵە کردنەی لە گەڵ مندا و هەتا پەروەردەکردنەکەشی بە تەواوی هەڵەیە ، وە کاری راست و دروست ئەوەیە کە وازم لێ بێنێت لە هەموو ژیانمدا پشت بەخۆم ببەستم، ئەمە بۆمن باشە و ئەنجامی باشی دەبێت ، بەلأم زۆر بەداخەوە پێی دەوتم کچی خۆم هێشتا منداڵیت ، پێویستە یارمەتیت بدەم، چونکە من دایکتم ، لە سەر ئەو بنچینەیە سوور بوونم وای نەدەکرد وازم لێبێنێت کە لەژیانمدا پشت بە خۆم ببەستم ، لە راستیدا منیش بەشداری ئەو هەلأنەی بووم ، چونکە بیرم لە ئاینده نەدەکردەوە و لە ژیانی کردەیی و وێنای ئەوەم نەدەکرد کە دەگەمە رێگایەکی داخراو، چونکە پەروەردەکەی دایکم بۆ من و زیادەڕۆیی لە نازپێدانم هۆکاری ئەوانە بوون ، بەڵکو زیانی هەبوو بۆمن و شکستی پێهێنام.. بەلأم کار لە کار ترزا و پەروەردەکردنەکەی تێکەڵی هەست و نەست و خوێنم بووبوو ، نەم دەتوانی رزگاربم لێی یان لەو بارەیەوە شتێ بکەم .

بە سەرکەوتوویی قۆناغی دواناوەندیم تەواو کرد ، و رۆشتمە زانکۆوە، لەوێش خوێندنم تەواو کرد و تەنها وەزیفە و زەواجم مابوو بۆیە یەکەمیانم دەست کەوت کە وەزیفەیەکی چاك بوو لە یەکێك لە وەزارەتەکانی حکومەتدا ، بەلأم دووەمیان دواکەوت بە هۆی چارەنووسەوە وەکو وا دەڵێن ، بەلأم دڵنیا بووم کە کوڕێکی چاك رۆژێ لە رۆژان لە دەرگای ماڵمان دەدات و من داوا دەکات بۆ ژیانی

هاوسەرگیری ، چونکە ئەوە سوننەتی ژیانە و کچ تەنها ئەوەی لەسەرە ئارام بگرێت  تا بەختی دەکرێتەوە .
بەو شێوەیە دەستم کرد بە کارکردن و ڕۆژێکیان چوومە وەزارەتەوە و من کچێکی دەوڵەمەندی بە ناز و مەکر بووم کە پێشتر هەرگیز کەس سەرزەنشتی نەکردبووم یان بە درۆی نەخستبوومەوە ، سەرەتای دەوامی من سەعات نۆی بەیانی بوو دوای دەست پێکردنی دەوامی ڕەسمی بە سەعات و نیوێك چوومە سەر کارەکەم،بۆیە ناوی منیان لە لاپەڕەیەکدا نووسی لە گەڵ ئەو فەرمانبەرانەی کە دوادەکەوتوون لە سەر کار.. ئەو ڕۆژە بەرپرسەکەم بانگی کردم و ئامۆژگاری کردم کە پێویستە پابەند بم بە کاتی دیاریکراوی دەوامەوە ، پاشان پۆزشی بۆ هێنامەوە چونکە یەکەمین جارە بەڵام دوای ئەوەی چەندین جاری تر دوا کەوتم.. بەرپرسەکە بۆی دەرکەوت کە جگە لە نوسینی ڕاپۆرت بەولاوە هیچ سوودی نیە بۆ من..تیایدا وتبووی کەمن ناشێم بۆ کارکردن و غیاباتیشم زۆرە و لە سەر هەموو ئەوانەشەوە کاتێ کارێکم پێدەسپێردرێت ڕای ناپەڕێنم ، بەو شێوەیە بەتەنها لەماڵەوە مامەوە.
ئەوە یەکەمین گورزی لێدان بوو کە دای بەسەرمدا ، چونکە وەك پێشتر وتم من کچێکی بەناز بووم و گوێم بە هیچ شتێك نەدەدا .
دایکم نارەحەتیەکەی لە سەر ئاسان کردم و وتی : ئارام بگرە ، ئارامم گرت و چەند مانگیکی نەخایاند بەختم کرایەوە و شوم کرد  وەك دەڵێن چوومە قەفەزی زێڕینەوە ، منیش خوازیار بووم کەوا بێت.. ئەگەر دایکم ڕای نەهێنامایە لە سەری.. چونکە مرۆڤێك بووم بەمانای وشە پشتم بە دەورو بەرم دەبەست و هیچم نەدەزانی ، لێرەدا مەبەستم تەنها پێداویستی و ئەرکەکانی ماڵەوە نیە بەڵام هەتا قسەکردنیش من

خوازیار بووم مێردەکەم دەربارەی من قسە بکات.. ئایا دوای ئەم پشت بەستنە شتێکی تر ماوە .

بیست و چوار مانگ تێپەری بە سەر ژیانماندا ومێردەکەم باری گرانی مرۆڤێك هەڵدەگرێت کە لاشەی گەورەیە و عەقڵی بچوکە ، مرۆڤێکی ناز پێدراوی بێ متمانە بەخۆ هەمیشە هەوڵ دەدات پێشەنگی دەوروبەرەکەی بێت و فەرمانیان بەسەردا بدات .

مرۆڤێکی ستەمکارە بەسەر دەوروبەرەکەیدا و هەمووشتێ داوا دەکات و هیچ شتێ پێشکەش ناکات ، هەتا مێردەکەم بە تەواوی پڕ بوو لێم وتی : هاوسەری بەڕێزم چاکە نواندن لە گەڵ تۆدا سوودی نیە ، باشتر وایە بە چاکی دەست بەردارت ببم ، (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) بەو شێوەیە بۆ جاری دووەم ژیانی هاوسەریم شکستی هێنا بەهۆی زیادەڕۆیی دایکم لە نازپێدانی پێم .. مێردەکەم دوای ئەوەی ئارامی نەما و تەلاقیدام .؟. تا بگەرێمەوە بۆ ماڵی دایکم .. کە هۆکاری نابەختەوەری من بوو بە بێ ئەوەی رۆژێ لە رۆژان هەست بەوە بکات .

ئێستاش ئەمە بەسەرهاتی من بوو ئەمەش پەیامەکەم بوو بۆ هەموو دایکێك لە هەموو خاکێکی موسوڵماندا ، بەراشکاوانە پێتان دەڵێم :

نەکەن زیادەڕۆیی بکەن لە نازپێدان بە کچەکانتان.. رایان بهێنن با پشت ببەستن بە خۆیان لە ژیانیاندا ، ئەمە بوو بەسەرهاتی من ، ئەی دایکان پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت پەند و وانەی لێی وەربگرن، چونکە شکست هێنان لە ژیاندا تامی تاڵە ، وە لەوانەیە کۆتایی پێبێت و بڕەوەێتەوە ئەگەر ئافرەتەکە سەر لەنوێ بێتەوە بە خۆیدا ، بەڵام

**ئاسەوارەکانی زیادەڕۆیی لە نازپێداندا ئەستەمە ڕەگ و ڕیشەی لە دڵدا هەڵبەکەنرێ ودیار نەمێنێت و بڕەوێتەوە، چونکە وەك خوێن بە ناو هەموو جەستەدا هاتوچۆ دەکات .**

**ڕۆژنامەی (الهدف)ی کویتی ژمارە ١٨٦٨**

# دوو جار خۆمم فرۆشت .

ئەم ئافرەتە دەڵێت :

لە تەمەنی پانزە ساڵاندا بووم کاتێ کە پیرەمێردێکی تەمەن هەشتا ساڵ هاتە داوام ، برا تاقانەکەم لە لای ئەوکاری دەکرد ، براکەم باسی ئەو دەوڵەمەندیەی بۆ دەکرم ، چۆن ئەگەر شووی پێبکەم وەکو پادشا دەژیم ، دوای ئەوەی باوکم وەفاتی کرد و ئەو برایەم گرنگی پێدەدام و ئەرکی سەرشانی هەڵگرتبووم ، خۆی بێبەش کردبوو لە زۆر شتی خۆشی دنیا تا بمێنێتەوە لە گەڵمدا و سەرپەرشتیم بکات .

منیش بیرم لەوە دەکردەوە کە رزگاری بکەم لەو بەرپرسیاریەتیە و تا بە خۆشی چۆنی دەوێت ژیانی خۆی بەسەر بەرێت و لەزەت لە گەنجیەتی خۆی وەرگرێ و دوور لە بەرپرسیاریەتی من.. لەبەر ئەوە خۆم ئەو بڕیارەم دا و رازی بووم کە ببمە هاوسەری ئەو پیرەمێردە و بە خۆمم وت : ساڵانێکی کەمەو دەبمە بێوەژنێکی دەوڵەمەند و سەر لە نوێ ژیانم دەست پێدەکەمەوە.

ئەوە یەکەمین مامەڵەی بە زیان بوو کە لە ژیانمدا پێی رازی بووم ،دوای ئەوەی هاوسەرگیریەکە تەواو بوو بۆم دەرکەوت ئەو پیرەمێردە دەوڵەمەندە زۆر رەزیلە وەمن خۆم خستە بەندینخانەوە و لە یەکێ لە ژوورەکانی خانووە گەورەکەیدا کە لە گەڵ منداڵەکانی، کە نەمدەتوانی رۆژێ لە رۆژان بیان ژمێرم کە بەرهەمی ژن و ئافرەتی تەڵاقدراو بوون لەو پیاوە ، تەنها یەك پیرەژن بەلایەوە مابوو کە ئامۆزای بوو، لە سەرەتای ژیانیدا هێنا بووی نەیدەتوانی لەماڵ بچێتە دەرەوە و رابکات بە هۆی تووش بوونی بە ئیفلیجی، کە بە ناچاری پەکی خستبوو تەنها

زمانێکی درێژی هەبوو وەك زمانی مار هەر کەسێ نزیك بوایەتەوە لێی دەیگەست .

دوای ساڵێك سکم بە منداڵە تاقانەکەمەوە بوو ، ئەو سکەم پاڵی پێوە نام ئارام بگرم و بەرگەی ئەو ژیانە سەختە بگرم و نارەزایی دەرنەبڕم سەبارەت بەو ژیانە ناخۆش وچەرمەسەریە لەو ماڵەدا ، هۆکاری دووەمیش براکەم کارێکی دۆزیبویەوە و لە شوێنێکی دوور ژنێکی هێنا بوو جێگیریش بووبوو .

حەزم نەدەکرد ژیانی لێتێك بدەم دوای ئەوەی رزگاری بووبوو لە بەرپرسیاریەتی بەرامبەر بە من و سەرقاڵبوونی بە ژیانی خۆیەوە ، شەو و رۆژ لە خوا دەپاڕێمەوە کە رزگارم کات لەو پیرەمێردە و بیباتەوە بۆ لای خۆی تاوەکو بەشێك لە میراتەکەیم بەرکەوێت  کە من و کوڕەکەم بەرمان دەکەوێت .

خۆشترین رۆژانی تەمەنم فەوتا و لەناوخەفەت و حەسرەتا بەسەرم دەبرد و چاوەڕوانی ئەوەبووم کە تاکە ئومێدم بێتە دی و لەو نارەحەتیە دەرچم و و بەشکستیەکیی تەواوەوە ومیراتی ئەو ماڵە قەرەبووی بەختیاریم و لاویەتیم دەکاتەوە کە منی فەوتاند لە گەڵ ئەو پیرەمێردەدا.

چاوەڕوانیم درێژەی کێشا و ساڵان تێپەرین و ئەو ئومێدەی من نەهاتەدی وئەو پیرەمێردەش خراپتر و رەزیلتر دەبوو ، کوڕەکەم کاتی ئەوەی هاتبوو بخرێتە بەر قوتابخانە و پێویستی بەخەرجی هەبوو تا لە بەردەم هاورێکانیدا بە جوانی دەربکەوێت .

لە بەر ئەوە بڕیارمدا کار بکەم تا بژێوی کوڕەکەم دابین بکەم ، پیرەمێردەکەم ئەو بیرۆکەیەی رەت کردەوە ، بۆیە منیش داوام لێکرد

تەلاقم بدات تا لەو بەندینخانەیە و ئەو تەوقی عەزازیە رزگارم بێت ، زۆرم کرد و کۆشام بەلام سوودی نەبوو ، براکەم زۆ یارمەتی دام دوای ئەوەی هەستی کرد کە ئەو بەرپرسیارە لەوەی بەسەرمندا هاتووە ، بەلام ئەو پیرەمێردە رازی نەبوو تەلاقم بدات ...

هەر کاتێ هەولم ئەدا لە شوێنێ کار بکەم ئەو دەستەلاتی خۆی دەقۆزتەوە تا دەربکرێم لە سەر ئەوکارە ، بۆیە رۆشتم بۆ مالی براکەم و و مێردەکەمم بە جێیهێشت و دوای ئەوە هەستم کرد من و کورەکەم بووین بە بار بە سەر خێزانی براکەمەوە..وە کەللە رەقی هیچ سوودێکی نیە.. بۆیە گەرامەوە بۆ لای مێردەکەم و دوای ئەوەی بەلێنی پێدام کەخانویەکی سەربەخۆم بۆ بگرێت و دووربم لەو خانووە کە زۆر رقم بوو لێی کە رۆژێ لە رۆژان هەستم بە تایبەتمەندیەتی یان حەوانەوە نەدەکرد لە بەر چاوی ئەو مندالانەیدا .

ژیانم بەوشێوەیە بەردەوام بوو تا گەیشتمە سی سالێ ئەو کاتە ئەوەی ویستم هاتە دی و پیرەمێردەکە دوای ئەوەی پانزە سالی تەمەنی منی فەوتاند کە لە ژێر زەبرو ناخۆشی مادی و مەعنەویدا دەمگوزەراند ، تەنها لەو ساتەدا خۆر لە ژیانی تاریکیمدا هەلهات.. ماوەی عیدەی سەختم بەسەر برد وخەونم بەوەوە دەبینی کە هەموو خەونەکانی من و کورەکەم دێننە دی .

بەلێ بێگومان میراتیەکەمان برێکی باش بوو ، زۆرێکم خەرج کرد لەو شتانەدا کە خوازیاری بووم ، مالێکی جوان و ئەساسێکی ناومالی باش و ئۆتۆمبیلێکی کەشخەم لێ کری و برێکی زۆریش لە زێر و ئەلماس و جل و بەرگ و هەموو ئەو شتانەی کە لە رابردوودا بێبەش کرابووم لێی .

دوای ئەوەی حەزەکانی کڕینم تێر بوون حەزم بەلای ئەوەدا دەچوو قەرەبووی بێبەشبوونی سۆزداری خۆم بکەمەوە ، بۆیە بەو خەونەوە گەڕام بە دوای پیاوێکدا کە قەرەبووی ئەوەم بۆ بکاتەوە بە درێژایی ژیانم لە دەستم چووە.. بە تایبەتی کە من تەمەنم سی ساڵە ، وە لە رووی جوانی و سەرەنج راکێشانەوە جێگەی ئێرەیی پێبردنی پیاوان بووم ، زۆرکەس هاتنە داوام بەڵام رەفزم دەکردن .

بۆیە بڕیارمدا بوو وردبین بم لە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەمدا ، چەند مەرجێکی زۆرم دەست نیشان کردبوو بۆ کەسێ کە ببمە هاوسەری ،لە سەرووی  هەموو ئەو مەرجانەشەوە ئەوەبوو کە بە قەناعەتەوە خۆشم بوێت .

دوای تێپەربوونی ساڵێ بە سەر وەفاتی مێردەکەمدا پیاوێکم ناسی.. پیاوێکی رێك و پێك بە پێی هەموو پێوەرەکان و کەسایەتیەکی بەرزی هەبوو ،سەرەنج راکێش بوو، توانای کاریگەری هەبوو لە سەر هەرکەس کە بیناسیایە، بەراستی ئەو کەسە بوو کەو بەدوایدا دەگەڕام و خەونم پێوە دەبینی .

تەنها بە بینینی خورپە بە دڵمدا هات ، چەندین هۆکارم دروست کرد کە وام لێبکات پێی بگەم ، خوازیاری ئەوە بووم چۆن من سەرەسامم بە ئەو، ئەویش هەروا سەرسام بێت بە من .

ئەوەی ویستم هاتە دی و ئەو پیاوە موتابەعەی دەکردم و گرنگی پێدەدام وتوانی ژمارە تەلەفۆنەکەمی دەست کەوێت ، باسی هەست و نەستی خۆیی بۆ دەکردم کە من ئەو ئافرەتەم کە چاوەڕوانی دەکات ، بە درێژایی ژیانی بە دوایدا دەگەڕێت ، رۆژێ لە رۆژان هەستی بە خۆشەویستی نەکردووە، هەرچەندە تەمەنیشی چل ساڵە  وە بڕوای وا

بوو كە ئەو خۆشەويستيە رۆزيەكە لە خواى گەورەوە بۆ هەردووكمان ، پێويستە لە دەستى نەدەين،پاشان داواى كردم و بەلاَم لە خۆيەوە بۆم دەركەوت لە بارودرۆخێكى نالەبارداية و خوازيارى ئەوەيە بتوانم حساب بۆ بارودۆخەكەى بكەم.. ئەويش ئەوبوو كە ژن و مالْ و منالّى هەبوو چەندين كورِ و كچى هەبوو هەر لە باخچەى ساوايانەوە هەتا خوێندكارى زانكۆ، و رێز لە هاوسەرى تەمەنى و ژنەكەى دەگرێت كە شان بە شانى وەستاوە وەئەركى پەروەردەكردنى منداڵەكانى هەڵگرتووە لە بەر ئەوە رێزى دەگرێ و نايەوێت هەستى بريندار بكات كە ژنى هێناوە بەسەريدا و نايەوێت كورِ و كچەكانى هەست بەناجێگيرى بكەن وە وێنەى باوكيان لە بەرچاويان لێلْ بێت و ژيانى خێزانداريان تێك بچێت، چونكە لە ديدى ئەواندا ئەم باوكێكى وەفادارە و تێكۆشەرە لەپێناو خێزانەكەيدا .

مەرجى ئەوەى هەبوو لە پەيوەندى كردن بە منەوە كە پێويستە هاوسەرگيريەكەمان نهێنى بێت و كەس نەزانێت بێجگە لە براكەم و چەند خزمێكى من .. بۆ نەگبەتى و بەخت رەشيم زۆر بيرم نەكردەوە ، چونكە تينووى خۆشەويستى و سۆزدارى بووم ، نكولى لەوە ناكەم كە ئەو پياوە دلْ و هەستمى داگير كردبوو كە لە توانامدا نەبوو دەستبەردارى بم .

بۆيە رازى بووم بەو گرێبەستە شكست خواردوەى تر لە ژيانمدا ، رازى بووم كە زەواج بكەين بە شێوەيەكى نهێنى و رازى بووم كە منداڵم نەبێت و داواى هيچ شتێ نەكەم كە لەوانە بێت ئەو زەواجەمان ئاشكرا بكات .

شووم کرد و لەو خۆشەویستیەدا ژیام کە بێبەش بووم لێی.. مێردەکەم خۆشی دەویستم و دیاری و پارەی پێدەبەخشیم ،و گرنگی پێدەدام و هەموو شتێ کە پێویستم بووایە بۆی دابین دەکردم، وەك کوڕی خۆی هەڵسوکەوتی لە گەڵ کوڕەکەمدا دەکرد.. من لەوپەڕی بەختەوەریدا بووم .. ساڵان تێپەڕین و لە ناخمدا حەزکردن لە منداڵ گەشەی سەند، تا بیگرمە باوەش و هەست و بە دایکایەتی خۆم بکەم ، ئەویش رەفزی کرد و وتی : ئەگەر بە بێ ئاگایی من سکت بوو ئەوە بەناوی خۆمەوە تۆماری ناکەم و ناوی ناخەمە تۆماری خۆمانەوە، چونکە ئەو کارە هۆکاری ئاشکرابوونی هاوسەرگیریەکەمانە وە من پێشتر ئەو مەرجەم خستە بەردەمت و تۆش قبوڵت کرد .

ئیتر دوای ئەوە وا تەماشای ژیانی هاوسەرگیری خۆمم دەکرد کە من وەکو عاشقێك وام و مافی ژنیەتیم نیە ، رازی نەدەبوو کە لە گەڵم بێتە دەرەوە یان بێت لە گەڵم بۆ لای پزیشك یان بۆ هیچ فەرمانگەیەکی حکومی بۆ تەواو کردنی هیچ کاروبارێکی رەسمی.. بەلای یاساوە ئافرەتێکی تەلاق دراو و بێوەژن بووم، چونکە رازی نەبوو من بخاتە ناو تۆماری خۆیانەوە ، کاتێکیش کە لە گەڵم دا دەبوو هەر بە پەیوەندی کردنی ژنەکەی یان یەکێك لە منداڵەکانی منی بە جێدەهێشت و بەفڕکان دەچوو بۆ لای ئەوان ، و نەیدەهێشت پەیوەندی پێوە بکەم با نەخۆشیش بکەوتمایە یان توشی رووداوێك بوومایە، تا لە بەردەم خێزانەکەی و هاوڕێکانی و ستافی کارەکەیدا ئیحراج نەبێت و تاوەکو ژنەکەی بەو زەواجەی ئێمە نەزانێت و زۆر بە ترسەوە سەردانی دەکردم و لەوکاتانەدا کە بگونجایە بۆی وە ماوەیەکی کەم دەمایەوە و پاشان دەڕۆشت و هەمیشە دەیوت تکات لێدەکەم پەیوەندیم پێوە مەکە .

رۆژێکیان ژنەکەی خۆی برد و سەفەری کرد بۆ لەندن بۆ چارەسەرکردنی لەوێ سێ مانگ مایەوە بە بێ ئەوەی پەیوەندیەکەم پێوە بکات ودڵنیا بێت لێم ، وەك ئەوەی هیچ مافێکم نەبێت لە لای ئەو ، پەشیمان بووم.. پەشیمان بووم لە سەر ئەو مامەڵە دۆڕاوە کە بەستبووم لە گەڵیدا ئەوەتا ئێستاش من بێبەشم لە زۆر شت.. بێبەشی دەروونی و سۆزداری و لە پیاوێك کە تەنها خاوەنی سێبەرەکەیمی .

کوڕەکەم گەورە بوو چووە دواناوەندی، کاتێ هاوڕێکانی دراوسێمان لێیان دەپرسی ئەو پیاوە کێیە کە جار جارێك سەردانمان دەکات لە وەڵامدا توشی ئیحراجی دەبوو.. وە مێردەکەم لێزان بوو لە شاردنەوەی ئۆتۆمبیلەکەی تا کەس نەیبینێت وە بە تەواوی دەم و چاوی دادەپۆشی کاتێ دەیویست بێتە ژوورەوە، وەك ئەوەی هاتووە شتێ بدزێت.. کوڕەکەشم دەیوت ئەوە مێردی دایکمە و ژنی تری هەیە و نایەوێت ژنەکەی بەم زەواجە بزانێت ،کوڕەکانیش دادەنیشتن و سەیر بوو بەولایانەوە بەو حاڵەتە پێدەکەنین و نەیاندەزانی کە ئەو حاڵەتە چەند ئازاری ئەو کوڕە بەستەزمانەی من ئەیات .

کوڕەکەم زۆر موعەققەد بوو حەزی نەدەکرد تێکەڵی خەڵکی بکات لە پاڵمدا دادەنیشت و بە درێژایی کات و هەستی بە مەینەتیەکانی من دەکرد ، لە پێناوی مندا ئازاری دەچەشت و بە بەردەوامی لێی دەپرسیم : دایە گیان بۆچی ئەم جۆرە شوکردنەت قبوڵ کرد ؟

منیش نەم دەتوانی وەڵامی بمەوە ،تەها لەناخی خۆمدا ئەم وتەیەم دەوتەوە ( دایکت گەمژە بوو دووجار خۆی فرۆشت ) .

رۆژنامەی (الطب و الاسرة ) ژمارە ٦٢

# بەسەرهاتی ڕفاندنێك لە مەككە

نەكەی بانگهێشتی ئافرەتێ یان هەر كەسێكی تر قبوڵ بكەیت ، مێردەكەت یان براكەت ئاگادار نەكردبێتەوە، كە هەرگیز بانگهێشتی پیاوێكی غەریب قبوڵ نەكەیت .. با ئەو بانگهێشت كردنەش لەماڵی خودادا بێت واتە (بیت الله الحرام ) .

ڕۆژنامەیەكی سعودی بەسەرهاتێكی واقیعی و ڕاستەقینەی بڵاوكردەوە كە بەسەر هاوڕێ و برایەكدا هاتبوو كە خەڵكی وڵاتی مەغریب بوون ، بەسەرهاتەكەش بەم شێوەیە یە:

كوڕێك لە مەغریب ژنی هێنا بوو، بوكەش بەڵێنی لە مێردەكەی وەرگرتبوو كە مانگی هەنگوینیان لەنزیك ماڵی خوا (بیت الله الحرام ) مەككەی پیرۆز بەسەربەرن ... كە پاشتر بووە دۆزەخ بۆی .

كاتێ بووك وزاوا لە(مسجد الحرام) واتە مەككەی پیرۆز بوون یەكێ لە دەروون لاوازەكان لە خەڵكی مەككە سەرەنجی ژنی ئەو پیاوەی دابوو.. دەروون نزمە پیسەكەی ئارەزووی چوو بووە سەری و بە فێڵە قێزەونەكەی خۆی نزیك بوویەوە لێیان و هەوڵیدا بیان باتەوە بۆ ماڵەوە ، بە پیاوەكەی وت: ئایا تۆ خەڵكی ئێرەیت ؟ پیاوەكەش وەڵامی دایەوە: نەخێر خەڵكی وڵاتی مەغریبم.. بۆیە پیاوە مەكیەكە سوور بوو كە نیوەڕۆ بانگهێشتیان بكات ..پیاوە مەغریبیەكەش پێ وت : نەخێر ئێمە دەمانەوێت نوێژی عیشاش لێرە بكەین ، پیاوە مەككەیەكە وتی : باشە باشە دەچینەوە بۆ ماڵەوە و ژنەكەت لەوێ لەگەڵ ئافرەتەكاندا جێدەهێڵین هەتا نوێژی عیشا دەكەین و پاشان دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە و پێكەوە نانی ئێوارە دەخۆین .

پیاوە مەغریبییەکە وتی : لە سەر بەرەکەتی خوا .
پێکەوە چوون بۆ مالّی پیاوە مەککەیەکە و ژنە هەژارەکەش لەویّ دابەزی و چووە مالّەوە بەو پێیەی ئەوەی لەومالّەدایە ئافرەتە !!
پیاوە مەکەیەکە لەگەلّ پیاوە مەغریبییەکە گەڕانەوە بۆ مزگەوت تا نوێژی عیشا بکەن و ژنەکەی لەمالّی پیاوەکە دانابوو ، چەند ساتانێکی خایاند و بانگ درا و نوێژ دەستی پێکرد و پیاوە مەکەیەکە لە چاوتروکانێکا نەما و بزر بوو .
پیاوە مەغریبییەکە لە بێئاگاییەکەی هۆشدار بوویەوە و درەنگ هەستی کرد کە تەلّەی بۆ دانراوە بۆ رفاندنی ژنەکەی ، چوو بۆ لای پۆلیسەکانی ناو حەرەمی مەککی ، تکا دەکەم پۆلیسەکان پیاوێك بوو ( بەشماخ ) ی سووری بەسەرەوە بوو شێوەی واو وا بوو ، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە ... پۆلیسەکەش پێی وت : زۆرێك لە خەلّکی ئێرە (بەشماخ) سوریان بەسەرەوەیە.. ئەبێت ئەوە کێبێت ؟ و لە چ گەڕەکێکدا بێت ؟ و کوا مالّەکەی ؟....هتد
پیاوە هەژارەکە نەیدەزانی وەلاّم بداتەوە ! ئێستەچی بکات ... ؟ چۆن بەبیّ ژنەکەی بگەڕێتەوە بۆ ولاّتەکەی ...
پیاوەکە لە مەککەی پیرۆز نزیکەی سیّ مانگ مایەوە .. و ژنەکەی نەدۆزیەوە و ئەو پیاوەشی نەدۆزیەوە کە ژنەکەی رفاندبوو .
پیاوەکە دوای ئەوەی هەموو هەولّ و پارەیەکی خستە گەڕ تا ژنەکەی بدۆزێتەوە بە ناچاری گەڕایەوە بۆ ولاّتەکەی خۆی ...
پیاوەکە بەتەنها و بەغەم و خەفەتەوە گەڕایەوە لەو ولاّتەوە کە وای گومان دەبرد کە پڕە لە چاودێریکردن و گرنگی پێدان ، بەلاّم بە داخەوە و بە هۆی دلّپاکی و نیاز پاکیەوە بەرامبەر بە خەلّکی ئەم شارە

که چاوەڕوانی خێر و چاکەیان لێدەکرێت ، ئەوەی بەسەرهات و بە سەر خۆی و ژنەکەیدا و لە مانگی هەنگوینیاندا .

هەتا ئێستاش هیچ هەواڵێکمان پێنەگەیشتووە سەبارەت بە دۆزینەوەی ژنەکەی یان هیچ بەڵگەیەک لە سەر وەفاتی یان مانی ، خوایە گیان دەروی لێبکەیتەوە و دڵی ئارامبکەیت .

ئەم بەسەرهاتە نزیکەی هەشت ساڵێك دەبێت روویداوە لەو کاتەدا رۆژنامە سعودیەکان بلاّویان کردوەتەوە بەلاّم دوای ئەوەی کار لە کار ترازا .

## زیناى مه‌حره‌مه‌کان له یاداشتى پزیشکێکى ئافره‌تدا

سه‌ره‌تا کاتێ من ئه‌م چیرۆکانه‌تان بۆ ده‌گێڕمه‌وه زۆر راڕا بووم له باسکردنیان .. له خوا پاڕامه‌وه که کۆمه‌کیم بکات تا له‌م کتێبه‌دا ئه‌وه‌ى پێویست و به سووده بینووسمه‌وه ، به‌راستى کاره‌که زۆر مه‌ترسیداره. به شێوه‌یه‌ك خوا لێمان رازى بێت نه‌ك ببێته هۆى تووڕه بوون و بیمى خواى گه‌وره ... بینیم که نابێت خۆمان بێ ئاگا که‌ین له‌م جۆره شتانه ، هه‌رچه‌نده هه‌ستیاریشه ، چونکه له واقیعێکدا ده‌ژین به‌راستى ئه‌م ئایه‌ته‌ى خواى گه‌وره‌ى به‌سه‌ردا ده‌سه‌پێت (ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) روم /٤١ ....واته ( خراپه (و به‌لاَ و شێوان و ده‌رد) له وشکانى (زه‌وى) و ده‌ریادا که‌وتووه‌ته‌وه، به‌هۆى ئه‌و خراپانه‌ى خه‌ڵکى کردوویانه، بۆ ئه‌وه‌ى (تۆڵه‌ى) هه‌ندێ له‌و (خراپانه‌)ى کردوویانه پێیان بچه‌ژێ به‌ڵکو بگه‌ڕێنه‌وه( له خراپه‌کارى) )

مه‌گه‌ر که‌سێ خواى گه‌وره ره‌حمى پێبکات . به تایبه‌تى له‌م کۆمه‌ڵگایه‌ى ئێستاماندا ئه‌م جۆره مه‌ینه‌تیانه رووده‌ده‌ن.. په‌نا ده‌گرین به خواى گه‌وره له‌م جۆره شتانه ، به‌ڵکو ئه‌مه زه‌نگێك بێت بۆ بێئاگایمان و ئاگادارکردنه‌وه‌یه‌ك بێت بۆ هه‌موومان تا به ئاگا بێینه‌وه و بێئاگانه‌بین له کاتى روانینمان بۆ ساده‌ترین گومان، سه‌رسام بووم به قسه‌کانى دکتۆر ( وائیل ابو هندى ) به شێوه‌یه‌ك وتى : سه‌ره‌تا ده‌مه‌وێت جه‌خت بکه‌مه‌وه که تاوانى ( زیناى مه‌حره‌مه‌کان ) له ناو

کۆمەڵگای ئێمەدا هەیە ، وە بەرەو روی چەندین حاڵەتی راستەقینە دەبینەوە لە ناو عیادەکانماندا ، ئێمە وەك پزیشکی دەروونی لە ئەنتەرنێتیشدا وەك راوێژکاری دەروونی لە میانی کەناڵە ئاسمانیەکاندا و لە هەندێ کتێبی زانستیدا هەندێ چارەکاری رۆژنامەوانی و بە داخەوە هەموو ئەم هەوڵانە لە گەڵ ئەم تاوانە کارەساتبارەدا ( زینای مەحرەمەکان ) هێرشێکی قورسی دەکرێتە سەر لە لایەن ئەو کەسانەوە کە راهاتوون لە سەر سیاسەتی سەرکردن بە ناو لمدا .

وە بانگەشەکەرانی شاردنەوەی شتەکان دەکەن کە ئەم نەخۆشیانە باس نەکرێن لە ناو کۆمەڵگەکەماندا ، بەڵام ئەوەی سەرەنجی منی راکێشا ئەو تێکەڵکردنە بوو لە نێوان چەمکەکاندا کە پەیوەندی بەم تاوانەوە هەیە لە نێوان چەمکی زینای مەحرەمەکان و نێوان یەخە و بەرۆك گرتنی هەرزەکارەکان یان منداڵە مەحرەمەکان .

پاشان وتی : پێم وایە کۆمەڵگای عەرەبی بە شێوەیەکی گشتی بەرەو رووی قەیرانێکی گەورە دەبێتەوە لە مامەڵە کردن لە گەڵ کێشە سێکسیەکانی تاکەکانیدا وە لەوانەیە بنچینەی ئەم شتە بگەڕێتەوە بۆ نەتوانینمان کە وێنای ئەوە بکەین کە لە نێوانماندا کەسانێك هەن شەیتان پێیان دەوێرێت و لە بیری چووە کە ماڵەکانمان پڕیەتی لە سەتەلایەت و پێگەی ئەنتەرنێت کە هاندەرە بۆ زیناکردنی مەحرەمەکان و پاڵنەریانە ، هەموو ئەمانە و نەتوانیمان بۆ پابەند بوون بە ئادابی خێزانی موسوڵمان بەرەو رووی دەبێتەوە کە پڕیەتی لە هەموو ماناکانی دڵ ئارامی و ئاسایش بۆ هەر کەسێ لە چوارچێوەی ئەوەدا بژی .

پرسیارێك ماوە : چی وای کرد ئەو هەموو شتە خراپانە لە رووی سێکسیەوە رووبدات ؟ کەس ناتوانێت بە شێوەیەکی زانستی وەلاّمی ئەو پرسیارانە بداتەوە ، بە هۆی ئەوەی کە توێژینەوە زانستیەکان لە ولاّتانی ئێمە گرنگی نادەن بە کاریگەری تەکنەلۆژیای پەیوەندیەکان کە هاتووەتە ماڵەکانمانەوە.. و نەریتی سێکسیمانیان یەکالاّ کردووتەوە ، بەلاّم ئەوەی کە پێویستە بوترێت لێرەدا : بێگومان ئەو هۆکارانە وای لە مرۆڤی ئەمڕۆ کردووە بە ئاسانی وابەستەی شەیتان بێت و پاشان هۆکارە پاڵنەرەکان بۆ تاوانی نمونەیی (زینای مەحرەمەکان ) ئێستا لە جاران زیاترتە ، لەم دواییەدا زۆر بووە ، لە گەڵ بێدەنگ بوون و شاردنەوەی کە زاڵ بووە بە سەریدا زۆر جار ( زینای مەحرەمەکان ) لەکۆمەڵگای ئێمەدا نادۆزرێتەوە بە تەواوی مەگەر رووبدات و قوربانی و نێچیرەکە سکی بێت .

ئەمە قەیرانێکە تایبەتە سەبارەت بە مامەڵەکردنمان لەگەڵ کێشە سکێسیەکانماندا کە بووەتە هۆی ئەوەی هەندێ کەسی دەروون نزم پەیدا ببن و حەزیان لەوەیە بە سەر شۆڕی بژین و جوانی دەکەن بۆیان .

ئێستا من بەجێتان دێڵم لە گەڵ هەندێ لەو بەسەرهاتە واقیعیە ئازاراویانە کە دکتۆر (هالە موستەفا) پزیشکی ئافرەتان و پسپۆڕ لە نەشتەرگەری ومنداڵبووندا بۆمان دەگێرێتەوە ..

من دەقێکی ئەو بەسەرهات و رووداوانەم دەست کەوت لە رێگەی سایتی ( ئیسلام ئۆن لاین ) ی بەناوبانگەوە ومۆڵەتم وەرگت بۆ کۆپی کردنی .

ئەگەر باسکردنی گرنگ نەبووایە لەم سەردەمەدا کە فەساد و خراپەکاری زۆر بووە تیایدا نەم دەوێرا کە نمونەی ئەم جۆرە کێشانە

باس بكەم ... بەلاَم دەردەكە چوەتە ناو خوێن و بڕێك لە شاخوێنبەرەكانی ئەم نەتەوەیەوە .

# چیرۆکی یەکەم : خاڵی زیناکەر .

دکتۆرە( هالە موستەفا) دەڵێت : بە هەموو دڵێکەوە رووم کردە خوای گەورە کە خوازیاری ئەوە بووم کە لێپرسینەوەمان و حسابمان دوابخات ، دوای ئەوەی فەساد لە وشکانی و دەریادا دەرکەوتووە ، دوای ئەوەی دووکەڵی بەدڕەوشتی لوتمانی تووشی هەلأمەت کردووە ، چۆنە ئەگەر ئێستا لە بەردەم خوادا وەستابین و لە هەموومان بپرسێت سەبارەت بەو بەدرەوەشتیانەی دەکرێت و سەبارەت بەو ئایینەی کە گوریسەکانی پچڕاوە .

ئەم دوعایە هاتە سەر زمانم و لە بەردەممدا دیمەنێکی رۆژی قیامەت دروست بوو، دوای ئەوەی کچە تەمەن حەڤدەساڵەکە لە گەڵ دایکیدا لە بەردەممدا وەستا بوو ، کە هەواڵی سك بوونی کچەکەی وەك گەردەلوولێك وا بوو بۆ سەری ، هەرگیز دایکی چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد کە کچە پاکیزەکەی کە ناچێتە دەرەوە لەماڵ زۆر کەم نەبێت و تێکەڵی کەس نابێت بە زینا سکی بووبێت .

لە بەردەم حاڵەتی نا ئاسایی دایکی داماودا هەوڵمدا بزانم کێ ئەو کارە قیزەونەی کردووە لە گەڵ ئەو کچە بێتاوانەدا .. تاوەکو ئەو خێزانە دەرك بە هەڵە بکەن و چارەسەری بکەن بە تایبەتی سکەکەی مانگی شەشەمی تێپەراندبوو.. بەلأم کچە سوور بوو لە سەر نکوڵی کردنی و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کەنازانێت چۆن ئەوە روویداوە و بە گێژ و وێژیەکی نائارامیەوە .

دایك و کچەکە رۆشتن و ئەوەندەی نەبرد گەڕایەوە و چرپاندی بە گوێمدا شتێکی وت وئەم جارەیان کە وەك هەورە گرمەیەکی سەخت

وابوو ، پیّ وتم : كه خاوەنی ئەم كارە خالۆیەكیەتی كە پێنج ساڵ لەم گەورەترە ، بەڵێ خالۆی كاتێ دایكی لە ماڵەوە دەچوویە دەرەوە لەماڵ و دیار نەدەما ، دڵنیا بوو كە كچەكەی بێ خەم بەجێهێشتووە و لە گەڵ خالۆیدایە .

كچەكە وتی: خالۆی نزیكەی ساڵێكە راهاتووە لە دەستبازی كردن لە گەڵی ... بەڵام بۆچی كچەكە بەرگری لە خۆی نەكردووە ؟ وە بۆچی بەكەسی نەوتووە ؟ پرسیارێك بوو زۆر سەراسیمەی كردبووم .

### * گرنگی بزاوتن

بەراستی مەینەتیەكی گەورەیە و زۆرجار لە بەردەممدا دووبارە دەبێتەوە ، بەڵام نازانم بۆچی ئەم جارەیان ئەم حاڵەتە هەژاندمی.. لەوانەیە لەبەر ئەوەی سكەكەی ئەو ماوەیەی تێپەراندبوو كە لە بار ببرێت ، لەوانەیە لەبەر ئەوەی من پێم وابوو تەنها بە لۆمەكردنی كچەكە لە سەر بێدەنگ بوونی و تەسلیم بوونی و لۆمەكردنی خێزانەكەی لە زیادەرۆیی و ئاسانكاركردن بۆی بەس نەبێت ، پێویستە هەوڵێكی گەورە بدرێت ..نازانم بەڵام ئەوەی بە تەواوی دەركی پێ دەكەم ئەوەیە كە پێویستە هەوڵێكی هاوبەش هەبێت لە هەموانەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم كارەساتە ترسناكە كە بەراستی لە كۆمەڵگاكەماندا هەیە ، كە ناوی (" زینای مەحرەمەكانە)

هەستام بە ئاماری حاڵەتەكانی (زینای مەحرەمەكان ) كە لەماوەی ده ساڵدا رێم تێكەوتووە ، لە میانی كارەكەمدا ، سوپاس بۆ خوا بینیم كە حاڵەتانێكی زۆر نین ، بەڵام بوونی هەیە ، ئەمە هەتا خەڵكی گومان نەبەن كە داوێن پیس بە رادەیەكی زۆر لە خێزانەكانماندا بڵاوبووتەوە ، بەڵام بە دڵنیایەوە دەركەوتنی ئەم جۆرە پەیوەندیە شێوێنراوە

ئاگاداریەکە بۆ کۆمەڵگا بە گشتی کە نەخۆشیەکی مەترسیدار دزەی کردووە بۆ ناو خێزانەکان و پێویستە بەرەنگاری ببینەوە و بە هەموو توانایەکەوە هەتاوەکو نەبێتە پەتایەکی گەشەسەندوو .

# چیرۆکی دووەم : سکی بوو لە برای مێردەکەی

ئافرەتێك هات بۆ لام بۆ عیادە باسی پچرانی سوری مانگانەی دەکرد بۆ ماوەی سێ مانگ وە پرسیارکردن سەبارەت بە پەیوەندی ژن و مێردی.. دوور بوو بە لایەوە کە سکی هەبێت وتی: مێردەکەم نۆ مانگە سەفەری کردووە وام گومان برد حاڵەتەکە پچڕانێکی ناوەندی خولەکە بێت پێش ئەوەی دەست بە پشکنین بکەم لێی پرسیم کە زۆر دەترسا ئایا ئافرەت دەشێت پیش نۆ مانگ سکی بوو بێت پاشان سکەکەی لە ناخیدا هێشتبێتەوە و دەرنەکەوتبێت پاش نۆ مانگك نەبێت ؟ لە بەردەم ئەو پرسیارەدا بە خێرایی داوام کرد شیکاری سك بوونم بۆ بکات .

ئەو ئافرەتەی کە لە گەڵیدا بو هاواریکرد : دکتۆر گیان سکی چی مێردەکەی ماوەی نۆ مانگە سەفەری کردووە؟ بەلاّم من سووربوم لە سەر ئەنجامدانی شیکاریەکە پێش دۆزینەوەکەی ، بەڵێ هەر وابوو ، ئەنجامی شیکاریەکە بەو شێوەیە بوو کە من پێشبینیم دەکرد ، بەڵێ سکی هەبوو .

ئافرەتەکە دەگریا و بەردەوام ئەم پرسیارە گەمژانەی دەکرد : ئایا دەشێت پێش نۆ مانگ سکم بووبێت پێش ئەوەی مێردەکەم سەفەری کردبێت ؟

لەبەردەم ئەم بە سووك زانین و گاڵتەپێکردنەدا لە لایەن ئافرەتەکەوە قیڕانم بە روخساریدا و وتم : ئایا بەس نیە بێدەنگ نابیت بەوەی کە زینات کردووە بەڵکو دەتەوێت ئەو کۆرپەیە بلکێنیت بە غەیری باوکی خۆیەوە و دەتەوێت بازرگانی بە سنوری خواوە بکەیت ؟

هەر دەگریا و بەهانەی دەهێنایەوە بۆ ڕووداوەکە کە بەدەست خۆی نەبووە، ڕاهاتبوو لەسەر مومارەسەکردنی سێکس لە گەڵ هێوەر ( برای مێرد ) ەکەیدا کە لەگەڵیدا نیشتەجێ بوو لە ماڵی خەزوری ، ئەم خواردنی بۆ دادەنا کاتێ کە درەنگ لە سەر کارەکەی دەگەڕایەوە ،وە هەموو ئەوانەی لەماڵەوە بوون خەوتبوون ، ئەمیش دەچووە ژووری کوڕەکە تا بەیانیان خەبەری بکاتەوە، بەوشێوەیە پەیوەندیەکە پەرەی سەند و ئەوە ڕوویدا کە نەدەبوو ڕووبدا ...

خۆی و هاوڕێکەی ڕۆشتن و گرژیان پێوە دیار بوو ، پرسیارێك بەمێشکمدا دەسوڕایەوە.. ئایا خۆی ڕزگار دەکات لەو سکەی ؟ یان پارێزگاری دەکات بۆ مێردەکەی و ڕوودەکاتە خوای گەورەی کە لێی ببورێت .. یان بەردەوام دەبێت لە سەر ئەو کارەی هەتا مێردە داماوەکەی دەگەڕێتەوە ؟ نەمزانی کام ڕێگەیان هەڵدەبژێرێت چونکە جاری دووەم نەمبینیەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرمووە ( اياكم و الدخول على النساء ) فقال رجل من الانصار افرايت الحموا ؟ قال (الحمو الموت ) متفق عليه.

واتە:(نەکەن بچنە لای ژنانەوە ) پیاوێکیش لە ئەنصار وتی مەبەستیشت لە هێومەرە : فەرمووی: هێومر مردنە .

# چیرۆکی سێیەم : پەیوەندی لە گەڵ مامدا

دایکێك لەگەڵ کچەکەیدا کە ( ١٣ ) ساڵان بوو هات بۆ عیادەکەم بۆ دڵنیا بوون لەو خولەی کە دوو مانگ لەکاتی خۆی دواکەوتووە ، دایکیم دڵنیا کرد کە سروشتیە دوا بکەوێت ، چونکە لە سەرەتادا خولی مانگانە رێك و پێك نیە ، بەڵام سەرسام بووم کە دایکی سووربوو شیکاری بۆ کچەکەی بکەم .

من بەزەیم بە دایکیدا دەهاتەوە تا خەرجی زۆر نەکێشێت بەهۆی شیکاریەکانەوە و پێویست ناکات ، بەتایبەتی پیایدا دیار بوو کە گوزەرانی باش نیە ، بەڵام چرپانی بە گوێمدا و وتی : دەمەوێت شیکاری سك بوونی بۆ بکەم، منیش سەرسام بووم لە داواکاریەکەی و پێم وت : بۆچی گومان دەبەیت بەو کچە بچوکە ؟

دایکەکە گریا و وتی :من دەڕۆمە دەرەوە بۆ سەرکار ، کچەکەشم بە تەنها دەمێنێتەوە لە گەڵ مامیدا کە کەسێکی خراپە ، ئەویش ژورەکەی بەرامبەر بەمە کاتێ رۆژێکیان زووتر لە سەر کارەکە گەڕامەوە ، کچەکەمم بینی لە ژووری مامی هاتە دەرەوە و نیشانەی دڵەڕاوکێ و نائارامی لە رووخساریدا دیار بوو ، لێم پرسی هۆکاری ئەوە چیە ؟ وتی : خەریکی پاکردنەوەی ژووری مامم بووم و ئیتر گرنگیم بە شتەکە نەدا و پێشبینی شتی خراپم لە مامیەوە نەدەکرد .

بەڵام موفاجەئات روویدا کاتێ دایکەکە بۆ جارێکی تر گەڕایەوە کچەکەی بینی لە گەڵ مامیدا لە شێوازێکی قێزەوندا ..کە زمان ناتوانێت وەسفی بکات .

بـەڵێ دوای پـشكنین بینیـان كـچێنی لـە دەسـت داوە وە پێویـستە شـیكاری سك بوونی بـۆ بكرێـت ، ئەنجامەكـە بـە نێگـەتیڤ هاتـەوە و دایكەكە زۆر دڵخۆش بوو بەوە.

پێش ئەوەی دایكە بڕوات لە گەڵ كچەیدا ئەم پرسیارەم لە كچەكە كرد : بۆچـی ئـەوە روویـدا ؟ بۆچـی یەكـەم جـار بـەدایكت نـەوت كـە مامـت دەیـەوێت لەكـەدارت بكـات ؟ وتـی : لـە سـەرەتادا دەترسـام بـەڵام دوای ئەوە، دەم بینی خۆم حەزم لێیەتی و هەوڵی بۆ ئەیەم ... بە بەرائەتێكی تێكەڵ بە قیزەونیەوە ئەوەی وت و كچەكە لە گەڵ دایكیدا رۆشـت ، بیرم لـەوە دەكـردەوە كـە ئـەو دایكـە چـی بڵێـت بـە خـۆی و دوای ئـەوەی ئـەو كچەی گەیانـدی بـەو جێگایـە ، ئایـا لۆمـەی خـۆی بكـات كـە كەمتـەرخـەم بووە لەبەرامبەر كچەكەی و دەبوایە داینەنایە لە لای ئەو مامە سەركەش و تاوانبارە ؟ ئایا كچەكە ئـەو رووداوەی بیردەچێتەوە یـان هـەوڵ ئـەدات كاری تری وا بكاتەوە لە شوێنی تردا ، وەڵامم دەست نەكەوت .

## چیرۆکی چوارەم: پەیوەندی لە گەڵ باوك

کچێکی تەمەن پانزە ساڵ هات بۆ عیادەکەم و خاڵۆژنی لە گەڵیدا بوو کە راستەوخۆ داوای لێکردم پشکنینی پزیشکی بۆ بکەم بۆ دڵنیا بوون لەکچێنی.. وە کاتێ پرسیاری هۆکارەکەیم لێکرد دەستی خستە سەر رووخساری و تەماشای زەویەکەی دەکرد و وتی: دایك و باوکی ئەم کچە بەردەوام شەڕیانە و لە ئەنجامدا ژنەکەماڵی بە جێهێشتووە و دوومنداڵە بچووکەکەی لە گەڵ خۆیدا بردووە و ئەم کچەش بە تەنها لە گەڵ باوکیدا ماوەتەوە .

ئەم داماوە بەردەوام پەیوەندی بە دایکیەوە دەکرد و داوای لێدەکرد بە خێرایی بگەڕێتەوە .. دایکیشی رازی نەبوو دەیووت دەبێت مێردەکەم زۆرم لێبکات بۆ گەڕانەوە ، رۆژێکیان کچەکە بە خەستی گریا و دەیویست سۆزی دایکی بجوڵێنێت و بە خێرایی بگەڕێتەوە و دەیوت : تۆ نازانی لە چ حاڵەتێکدام و چی روودەدات .. دایکەش گوێ ی پێنەدەدا ، هەتا من کەوتمە نێوانیانەوە و تەلەفۆنەکەم لە دایکی سەند و لە کچەکەشم پرسی چی روودەدات ؟ بۆچی بەو شێوەیە دەگریت ؟ ئەمە یەکەمین جار نیە دایکت چەندین مانگە ماڵتان بەجێدەهێڵێت بەڵام کچەکە بە خێرایی تەلەفۆنەکەی داخست .

خاڵۆژنی وتی : دوای ئەوەی بێ ئومێد بووم لە گوێ پێنەدانی دایکی بەرامبەر ئەسرینەکانی کچەکەی ، چووم بۆ لای کچەکە کە خۆی خستە ئامێزمەوە ، و شکاتی باوکی لێکردم کە کاتێك شەو دادێت چی لە گەڵدا دەکات وە ئیتر ناتوانێت لەمە زیاتر بەرگەی بگرێت ..

دوای ئەوەی قسەی خاڵۆژنیم گوێ لێبوو کە وەك هەورە گرمە بوون بۆ من ، هەستام بە پشکنینی کچەکە و بە فەزڵی خوا بۆم دەرکەوت کە هێشتا پاکیزەیە ، بۆیە ئامۆژگاری خاڵۆژنیم کرد کە بیباتەوە بۆ ئامێزی دایکی و نەیەڵێت بچێتەوە بۆ لای ئەو پیاوە دڕندەیە .

# چیرۆکی پێنجەم : ئاسەوارێکی وێرانکەر

کچەکە داد و بێدادی بوو لە ئازارێکی زۆر لە کاتی خولی مانگانەدا ، دوای پشکنین پرسیارم لێکرد سەبارەت پەیوەندی مێردەکەیەوە ، ئایا دەگاتە چێژ لە گەڵیدا یان نا ؟ بەشەرمەوە وتی : من هەمیشە مێردەکەمم خۆش دەوێت ، بەڵام هەر کە جیماع دەکەین پێکەوە هەست بە بێزارییەکی زۆر دەکەم و حەز دەکەم بە خێرایی دەست بەردارم بێت ، هەرچەندە مێردەکەمم زۆر خۆش دەوێت ، چونکە سیفاتەکانی جوانن .

من وا گومانم دەبرد کە هۆکارەکە ئەوەیە کە زانیاری تەواوی نیە بە سروشتی پەیوەندیکردنەکەوە ، بۆیە دەستم کرد بە شیکردنەوە و گرنگی سەقامگیری دەرونی و سۆزداری ، بەڵام لە چاوەکانیدا شتێکم دەبینی کە حەشاردراوە ، دوای ئەوە چەند جارێکی تر سەردانی کردم کە هەستی دەکرد حەزدەکات قسەم لە گەڵدا بکات ، لێرەدا هەلم قۆستەوە و لێم پرسی : ئایا پێش زەواجت پەیوەندی سێکسیت لە گەڵ کەسدا هەبووە ؟ روخساری سوور هەڵگەڕا و نکولی لە پرسیارەکە کرد، بەڵام مەبەستی خۆمم بۆ روون کردەوە کەمن پرسیار لە قۆناغی هەرزەکاری دەکەم ، سەرەتای ئاشانا بوونی بەکارە سێکسیەکانەوە ، وە بۆم روون کردەوە کە لەوانەیە هۆکاری دەرونی هەبێت لە پشت ئەمەوە کە دەبێتە بەربەستێك لەنێوان ئەم و مێردەکەیدا ، بەڵام کە خەریکە بێتاقەت دەبێت لە سەر سەختی ژنەکەی.. بەڵام هیچی پێنەوتم و رۆشت و پاشان جارێکی تر گەڕایەوە و تەماشای زەویەکەی دەکرد و بە هێواشی وتی : تکات لێدەکەم کە یارمەتیم بدەیت ،منیش پێم وت: ئایا گومانت هەیە لەوەی کە من یارمەتیدەرت بم ؟

گەڕایەوە و تەماشای زەویەکەی کردەوەو وتی : من لەتەمەنی هەرزەکاریدا راهاتبووم لە سەر مومارەسەکردنی سێکس لە گەڵ براکەمدا، کەراستەوخۆ لەمن گەورەتر بوو ، بەردەوام بووین لە سەر ئەوە تا تەمەنی زانکۆ ، پاشان هەر یەکەمان هەستمان بە مەترسی رووداوەکە کرد و وازمان لەو کارە هێنا .

براکەم ژنی هێنا و منیش شووم کرد بەڵام هەمیشە ئەو دیمەنانە دەهاتە پێش چاوم تەنها ئەو ساتانە کە مێردەکەم دەیویست بێتە لام و تووشی بێزاری و جارس بوون دەبووم .

تا ئێرە کارەکە لە پسپۆڕی من دەرچوو بوو ، بۆیە پێویست بوو پزیشکی دەروونی رۆڵی هەبێت لەمەدا و داوام لێکرد کە لە نزیکترین کاتدا بڕوات بۆ لای پزیشکی دەروونی و رارا نەبێت ، رۆشت و پرسیارانێکی زۆری لە ناخمدا جێهێشت : ئایا ئەگەری ئەوە هەیە یاری هەرزەکاران بەردەوام بێت لەناو خۆشك و براکاندا تا تەمەنی زانکۆ ؟ ئایا خێزان دەستی هەیە لەو رووداوەدا ؟ ئایا بەراستی ئەوەی ئەو ژنە مەبەستیەتی ئەنجامی ئەو مومارەسە کۆنەیە لەگەڵ براکەیدا ؟ پرسیارانێك لەوانەیە لە لای پزیشکی دەروونی وەڵامی دەست بکەوێتەوە .

پەروەردگارا بە رەحمی بەرفراوانت رزگارمان بکە لە هەموو ئەو ئازارانەی تووشی ئەم نەتەوەیە بووە لە هەوا و ئارەزوو...وە جێگیرمان بکە لەسەر ئاینەکەت تا بگەینەوە بەدیدارت و رەزامەند بیت لێمان، ئەی بە بەزەیی بەبەزەییان .

لە کۆتایدا : پێویستە باسی شتێك بکەین بۆ خۆپارستن لەم دەردە کە توشی هەرزەکارە شازەکان دەبێت ، لە کوڕان و کچان لەکۆمەڵگای

پێشکەوتووماندا و ئەوانەی خۆیان رۆشنبیرکردووە بە رۆشنبیری رۆژئاوای نەفرەتی، مەگەر کەسێك پەروەردگار رەحمی پێ کردبێت .
وە سەبارەت بە ئالیەتی خۆپارستن لە تاوانی ( زینای مەحرەمەکان ) دکتۆر ( الزهرانی) دەڵێت : بێگومان لە گرنگترین رێگاکانی چارەسەرکردن پەروەردەی حێزانی ئیمانیە بەدرێژایی قۆناغی منداڵی وهەرزەکاری ، ئەوەش بەسەرقاڵکردنی کالتی منداڵەکان بە شتانێکەوە کە دووریان بخاتەوە لە بزواندنی شەهوەت و ئارەزوەکانیان و دووریان بخاتەوە لە کەناڵە پیسەکان و نزیکیان بخاتەوە لە لە خوای باڵادەست .. و بەشداریکردنیان لە هەموو ئەو هۆکارانەی کە پاڵپشتە بۆ پەروەردەی ئیمانی وەکو بازنەکانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و گەشتەکان و چالاکیە وەرزشیەکان و خوێندنەوە .
وە جەخت لە سەر گرنگی رێکخەرەکانی خێزانی لە هەڵسوکەوت کردن لە گەڵ مەحرەمەکاندا، چونکە ناچێتە عەقڵەوە کە خوشك لەبەردەم براکەیدا جوانی و غەریزەی خۆی پیشان بدات .
وە هەروەها ئاگادارمان دەکاتەوە کە چارەسەری بەسوود و سەرکەوتوو بەوە دەبێت کە پەرە بە کەناڵە ئیسلامیەکان بدرێت کە ئەمڕۆ بڵاوبوونەتەوە.. بۆ نمونە بۆ هێورکردنەوەی کاریگەری ئەو کەناڵانەی کە بەرد دەجوڵێنیّ نەك مرۆڤ ئەو لاوەی لەگەڵ خوشکەکەیدا شەونخونی دەکێشێت بەحوکمی ئەوەی نزیك بێتەوە لێی وە ئەو شتانە دەبینن کە لەو فلیمانەدا روودەدەن .. ئەگەر ئارەزووی سێکسی جولا لە لایان یان بە تایبەت لای پیاو کە ئەو دەبێتە کۆیلەی ، وە ئاماژە بەو زاراوەیە دەکات کە شێخ محمد الغزالی دەڵێت ( ئاژەڵی سێکسی خەفەکراو لە ژێر پێستدا ) وە روونی دەکاتەوە کە بێگومان ئەو ئاژەڵە

ئەگەر ورووژێنرا لەناخی مرۆڤدا مرۆڤایەتیەکەی لە بیر دەباتەوە و وای لێدەکات تاوانەکانی سێکس ئەنجام بدات بەرامبەر بە نزیکترین کەس لێوەی ، بە تایبەتی ئەگەر لەو کەسانە بێت پەنا بەخوا ئیمانیان لاواز بێت .

پەروەردگارا خۆمان و ماڵ و منداڵمان وموسوڵمانان بپارێزە لە هەموو خراپەیەك .

# چەند بەسەرهاتێکی واقیعی قوربانیانی قەیرەیی

ئەمانە کۆمەڵێك چیرۆکی واقیعی هەندێ لەوانەن کە بونەتە قوربانی قەیرەیی ، کۆمکردوونەتەوە بەو ئومێدەی کە هەموو خوشکێك سودی لێببینێت و پەلە بکات لە پرۆسەی هاوسەرگیری و بەدیدی من هۆکاری بڵاوبوونەوەی دیاردەی قەیرەیی دەگەڕێتەوە بۆ چوار هۆکاری سەرەکی:

١- سەخت مامەڵەکردنی هەندێ لە دایکان و باوکان لە کچەکەیاندا لەبەر هۆکاری مادی .

٢- ئەو نەریتەی لە کۆمەڵگای کچاندا دەوترێتەوە ئەویش ئەوەیە کە دەبێت خوێندنی تەواو کردبێت، وە ئەمەش دەبێتە هۆی دواکەوتنی هاوسەرگیری .

٣- مارەیی زۆر و خەرجی زۆری ژن هێنان .

٤- کارکردنی ئافرەت ... چونکە رێژەیی قەیرەیی لە کچانی فەرمانبەردا زیاترە وەك لە ئەوانی تر .

# چیرۆکی یەکەم: هاوسەرگیری چارەسەرە

من کچێکم و خوای گەورە ڕێزێکی زۆری ڕژاندووە بە سەرمدا، سوپاس بۆ خوا لە خاوخێزانێکی زۆر دینداردا گەورە بووم .. بەڵکو خۆشم هەندێ شتم پێ قبوڵ نەدەبوو، بۆ نموونە گوێگرتن لە گۆرانی بە ئاشکرا و قسەکردنی زۆر بە تەلەفۆن .

وە هەروەها یەکێ لە ڕۆزیەکانی تری خوای گەورە بەسەرمەوە ئەوە بوو کە من سوور بووم لە سەر خوێندنەکەم کە بگەمە پلە و ئاستێك کە دڵخۆشبم پێی ، حەزم لە خوێندنەوە بوو بە هەموو شێوەکانیەوە ، زۆر خوێندنەوە وای کردبوو کە لە زۆرێك لە بوارەکان لە فیکرمدا گەشەیان کردبوو ، لەبەر ئەوە کەسێکی کۆمەڵایەتی و خۆشەویست بووم ، وە زۆرێك لە خەڵکی بەم شێوەیە وەسفیان دەکردم ( کەسایەتیەکی پێگەیشتوو و ڕووناکبیر گەورەتر لە تەمەنی خۆی ، ناسك ، تێگەیشتوو، توانای هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی هەیە ..... )

بە هەرحاڵ خوێندنم تەواو کرد و دڵم خۆش بوو بە تەواو کردنەکەم ، خوای گەورە بۆی ئاسان کردم کە وەزیفەیەکی باشم دەست بکەوێت ، مامەوە و چاوەڕوانی وەزیفەیەکی تر بووم ، دەمویست پەیوەندی لە گەڵ مرۆڤێکی چاکدا ببەستم، مەرجەکانم زۆر خاکیانە بوو ، ئەو مرۆڤەش هات کە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و خوێندنەوە لە من نزمتر بوو بەڵام من تەماشای ئەو شتانەم نەئەکرد ، ئەوەندە بەس بوو دەورروبەر شایەتی چاکی و پابەند بوونی بۆ بدەن ،بەڵام توشی شۆك بووم کاتێ خێزانەکەمان قبوڵیان نەدەکرد ، بەڵێ وا تەماشای منیان دەکرد ، کە هیچ مرۆڤێك نیە شیاوی من بێت ، وە دەیانویست پلەو پایەیەکی

کۆمەڵایەتی بەرزی هەبێت ، چەندین کەسی تر دەهاتن بۆ داوام و کەس وکاریشم بە منیان نەدەوت ، بەڵکو هەر خۆیان لە نێو خۆیاندا مشت و مڕیان دەکرد و کۆتاییان پێدەهێنا بە شێوازی ( لەچارەی نەنوسراوە) ... ئەمەیان شێوەی ئاوایە و ئەوەیان شێوەی ئاوایە، ئەویان کارەکەی وایە و سێیەمیان کەس و کارەکەی وایە ... هتد .

ئەو بارودۆخە زۆر کاریگەری هەبوو لە سەرم ، خەونەکانم بوون بە هەڵم .. بۆیە پاڵنەرێك پاڵی پێوە نام بیر لە شتێ بکەمەوە کە بێتاقەتیم دەرکات .

بۆیە هێڵی ئینتەرنێتم راکێشا بۆ ژوورەکەم و دەستم کرد بە چاتکردن، شارەزا بووم تیایدا و وردە وردە تەماشای فیلمی ناشەرعی و وێنەی ناشەرعیم دەکرد ، مومارەسەی سێکسی ئەلەکترۆنیم دەکرد ، تا خوای گەورە کچێکی هاوڕێی باشی بۆ ناردم کە ئاگاداری کردمەوە و ئامۆژگاری کردم و سوێندی دام کە دوورکەومەوە لێی ، بۆیە بەراستی منیش رووم کردە( منتدی ) شوێنگەکان ، لەوێ جیهانێکی روونا کبیری و پێشکەوتووم بینی ، بۆماوەیەکی درێژ بیر و هۆشم فراوان بوو ، بەڵام هەر حەزم لە گۆرانی و کڕینی کاسێت بوو .

پاشان سەرقاڵ بووم لە سەنتەرەکە ، هەتا سەرسام بووم بە یەکێ لە نوسەرەکان لە هەمان سەنتەر ، پەیوەندی دروست بوو لە نێوانماندا ، نامەی پۆستەیی ، پۆستەر ، وەڵام دانەوە ، پاشان مۆبایل ، بێگومان منیش بێ عەقڵ نەبووم هەروا بە ئاسانی خۆم بدەم بەدەستەوە ، بەڵکو بەخێرایی و بە راشکاوانە پێم وت : من سۆزم هەیە بۆت، ئەگەر تۆش وایت ئەوە تەنها یەك شت لە بەردەمتایە ئەوەیە کە بێیتە داوام، بۆیە ئەویش بڕیاریدا بێتە داوام ، بۆیە خوای گەورەمان کردە سەر پشکی

کارەکـەمان و لـە گـەڵ کەسـوکاریدا هاتـە داوام ،بـەڵام هەڵسوکەوتی خێزانەکـەیان ناتەندروسـتانە بـوو، هەرچـەندە خـۆی هـیچ نەنگیـەکی نـەبوو، بێگومـان وەکـو پەرچـەکردارێك لـە خێزانەکەیانـەوە هەستا بوون بـەژن هێنـان بـۆی و هەوڵـمدا دوورکەومـەوە لێـی، بـەڵام مـن هـەر دوور دەکەوتمەوە بەڵام لەوشەوەدا بڕیارمدا بەتەواوی تەوبە بکەم و واز لە ڕێگای نێت و پەیوەندیەکان بێنم ، و ڕووبکەمە خوای گەورە تا ڕزگارم بکات و ڕۆزیم بدات بەو شێوەیەی کە هیچ حسێبێکی بۆ ناکەم ، بە مێردێکی صالح کە یارمەتی و هاوکارم بێت لەدین و دنیادا .

لە بەردەم ئەم ڕێگرتنەی خێزانماندا ، هەستام بە بەرەنگار بوونەوەیان و بویرانـە و بە بێتاقەتیـەو پـێم وتـن ،کـە مـن حـەزم لـە پەیوەندیـە ، بەراسـتی مـن ترسـم هـەبوو لـەخۆم، شـەرمکردن سـودی نـەبوو بـۆم لـە کاتێکدا تەمەنم بە سەرئەچێت و شتە ووروژێنەرەکان کاریان تێکردووم .

کەس و کارم نکولیان دەکرد کە کارەکە بە دەست ئەوان بێت و بەڵکو دەیان بەستەوە بە چارەنوسـەوە ، مەینەتیەکـە لـەوەدا بـوو کـە بـەردەوام ئامۆژگـاری مـن و خوشـکەکانمیان دەکـرد تەماشـای زەنجـیرە تەلەفزیۆنیەکان مەکەن ، دەستان داپۆشن و گوێ لەگۆرانی مەگرن .... هتد ، بۆچی فەرمان بە خۆیان ناکەن بە واز هێنان لە نەریتە نەزۆکەکان و بەشداریکردن لە شاردنەوەمان لەماڵەکانماندا ؟

بەهـەر حـاڵ مـن دوای ئـەم بەڵگانـە پـەنام بـردە بـەر کـچە دەزگیراندار و شـووکردەوەکان بـۆ گـەڕان بـە دوای مێردێکـی گونجـاودا ، بینیمـەوە وکەسێکی چاکیش بوو.. بەڵام ئەویش ڕەت کرایەوە چونکە لـە کـەس و کاری ئێمە نەبوو ..

وه ئەمرۆ من لە ململانێدام ، دەمەوێت خۆم داپۆشم و وازم لەزۆر شت هێناوه، وازم لە گوێگرتن لە گۆرانی هێناوه تاوەکو سۆزم نەخرۆشێت، وازم لە لە پەیوەندی لە گەڵ ئەو مرۆڤەدا هێنا تا خوای گەوره رەزامەند بێت لێم ، هەرچەندە جێگای مەزنە لە دڵمدا ، من ئێستا ئامۆژگاری بەخێوکەران و سەرپەرشتیاران دەکەم کە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ کچەکانیاندا نەکەن کە کەس وکاری من مامەڵە دەکەن، چونکە ئەنجامەکەی بەوشێوەیە دەبێت کە بینیتان .. من نموونەیەکم بۆ ئێوه ، من نموونەیەك بووم بۆ رەوشت.. وه هەرگیز بەخەیاڵمدا نەدەهات بچمە ناو قسەکردنەوه لەگەڵ هەر مرۆڤێکدا بێت ... وه دەخوازم لەخوای گەوره کە لێم خۆش بێت و تەوبەیەکی یەکجاری بکەم و لێم وەربگرێت ، بەراستی هەر ئەو نزیك و وەڵام دەرەوەیە .

# چیرۆکی دووەم: خوای گەورە بێبەریت بکات لە بەهەشت

ئەمە بەسەرهاتی کچێکە یەکێك لە شێخە بەرێزەکان باسی کردووە و دەڵێت : ئافرەتێك تەمەنی گەیشتە چل ساڵ هێشتا شووی نەکرد بوو .. هەرکاتێ داواکاری دەهات باوکی رازی نەبوو بیدات بە شوو بە هۆی ئەوەوە توشی خەم و خەفەت بووبوو، مەگەر خوا بزانێت لە چ حاڵەتێکدا بوو ... تەنها بە روخسارێکی ماتەمینیەوە دەبینرا .

لە ئەنجامی ئەوەدا توشی نەخۆشی بوو بە هۆیەوە خرایە نەخۆشخانەوە و باوکی هات تا سەردانی بکات و دڵنیا بێت لە تەندروستی.. پێی وت : باوکە لێم نزیك بەرەوە ، باوکیشی لێی نزیك بوویەوە ..پێی وت : نزیك بەرەوە ، ئەویش نزیك بوویەوە ... پێی وت: بزیك بەرەوە ، ئەویش نزیکتر بوویەوە... پێی وت : بڵێ ئامین، وتی ئامین... پێی وت: بڵێ ئامین، وتی ئامین... پێی وت بڵێ: ئامین ، وتی: ئامین .

کچەکە وتی: خوای گەورە بێبەریت بکات لە بەهەشت وەك چۆن منت بێبەری کرد لە شوکردن .. دوای ئەوە وەفاتی کرد ، خوای گەورە رەحمی پێبکات .

# چیرۆکی سێیەم: بمدەنێ با نیو مێردیش بێت .

ئەمە بەسەرهاتی ئافرەتێکی قەیرەیە ، بەئازار و حەسرەتەوە بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت : من تەمەنم پانزە ساڵ بوو داواکەران و خوازبێنی کەران لە هەموو لایەکەوە دەهاتن بۆ داواکردنم ، منیش رەفزم دەکردن بەبیانووی ئەوەی کە دەمەوێت ببمە پزیشك ، پاشان چوومە زانکۆ و زەواجم رەت دەکردەوە بە بیانووی ئەوەی کەمن دەمەوێت سەدریەی سپی لەبەر بکەم و ( واتە بە تەواوی ببمە پزیشکی پسپۆڕ) تا گەیشتمە تەمەنی سی ساڵ، لەم دواییەدا ئەوانەی کە دەهاتن بۆ داوام ژنی تریان هەبوو ، منیش رەفزم دەکردن و دەمووت : دوای ئەم هەموو ماندووبوون و شەونخونیە شوو بە پیاوێکی ژندار بکەم ، چۆن شتی وادەبێت ؟ من خاوەنی سەروەت و سامان و نەژاد و بڕوانامەی بەرزم و شوو بە پیاوی ژندار ناکەم... دوای ئەوە ئەو ئافرەتە تەمەنی بوو بە چل و پێنج ساڵ و دەیووت : بمیەنێ با نیوە مردێکیش بێت .

# چیرۆکی چوارەم: ئەوە درێژە و ئەوەش کورتە

ئەمە بەسەرهاتی کچێکە ، ئامادە نەبوو کاتێ باوکی لە سەرەمەرگدا بوو.. وە رازیش نەبوو لێی خۆش بێت، چونکە رێگای لە هەقی شەرعی ئەم کچە گرتبوو کە زەواج و سەقامگیری و نەوەخستنەوە و پاراستنی داوێن بوو بەبەڵگەی بێ سەرو بن ، ئەوە درێژە و ئەمەش لە ئاستی ئێمەدا نیە ، چەندین بیانووی تری لەو جۆرە هەتا کچە گەورە بوو لە شووکردن تێپەڕی و کاتێ باوکی لە سەرەمەرگدا بوو داوای لێکرد کە گەردنی باوکی ئازاد بکات..کچەکە وتی: هەرگیز گەردنت ئازاد ناکەم ، بە هۆی ئەو حەسەرت و پەشیمانیەوە کە منت بێبەش کرد لە مافی خۆم لە ژیاندا... چی بکەم بە بڕوانامەکانم .. ئایا هەڵیواسم بە دیواری ماڵێکدا کە منداڵ و جگەرگۆشە نەگەڕێ پیایدا ؟ چی بکەم بە بڕوانامە گەلێك و پلەو پایەیەك کە لە گەڵیاندا لەسەر جێگا بخەوم ، منداڵێك بە خێو نەکەم و نەینێم بە سینمەوە .

غەمی خۆم بۆ پیاوێك باس نەکەم کە خۆشم بوێ و سۆزم هەبێت بۆی و ئەویش خۆشی بوێم ، و سۆزداربێت بۆم و خۆشەویستی ئەو وەکو خۆشەویستی تۆ نیە ؟ سۆزداری ئەو وەکو سۆزداری تۆ نیە ؟ بڕۆ لەبەرچاوم و لە قیامەتدا یەکتری دەبینینەوە لەبەردەم دادگایەکی داپەروەردا کە زوڵمی تێدا نیە ..

حوکم و فەرمانێك کە مافی هیچ کەسێك پێشێل ناکات و وەبەزیم پیاتا نایەتەوە و رازی نیم لێت و لە قیامەتدا لەبەردەم خوای گەورە بە یەکتری دەگەینەوە .

# چیرۆکی پێنجەم: دان پیانانەکان

یەکێ لەو برایانەی بەشدار بوو لە سەر ژمێریکردنی دانیشتوان دەڵێت:لە کاتی سەرژمێریکردندا چوینە زۆر ماڵەوە لە چەندین ماڵ شتی سەیرو سەمەرەمان دەبینی ، کچ لە تەمەنی سی ساڵیدا بوو وە هی تر لە تەمەنی چل ساڵیدا وە هەبوو لە شەست ساڵیدا هەموویان شوویان نەکردبوو ..

* یەکێکی تریان وتی : چووینە ماڵێکەوە پێنج کچی قەیرەم بینی تەمەنیان لە نێوان سی تا چل و پێنج ساڵیدا بوون .

* پیرەمێردێکی گەورە کە حەفتا ساڵ تەمەنی تێپەڕاندبوو کاری بە کرێدانی خانوو بوو وتی : چووینەتە چەندین ماڵ ئافرەتی قەیرەی تێدا بوو لە تەمەنی شەست ساڵی و حەفتا ساڵیدا ..

لۆمەی کۆمەڵگا و خزمانیان دەکرد ، نەفرەتیان لەوانە دەکرد کە هۆکار بوون لە مانەوەیان بە قەیرەیی تائەو تەمەنە ، کەسێ شک نابەن دەرمانێکیان بدەنێ و ناتوانن بەئاسانی بە ئەرکی سەرشانیان هەستن.. باوک و دایکیان نەماوە ، ئەگەر وەفاتیشیان نەکردبێت گەورەن و هەروەها خۆشک و براکانیشان سەرقاڵن بە ژیانی خۆیانەوە ، هەریەکەیان لای هاوسەر و ماڵ و منداڵی خۆیەتی .

# چیرۆکی شەشەم: بڕوانامەکەم بەرن و مێردێکم بەنێ .

یەکێك لە شێخە بەڕێزەکان ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پزیشکێکی کچ هاواری دەکرد و دەیووت : بڕوانامەکەم بەرن و مێردێکم بدەنێ ، و دەیووت : سەعات حەوتی بەیانی هەموو ڕۆژێك کات و ساتێکە بێزارم دەکات و ئەسرینەکانم دەرێژێت لەو کاتەدا لە پشت شۆفێرەکەوە سوار دەبم و بەرەو عیادەکەم بەڵکو بەرەو گۆڕەکەم و زیندانەکەم دەڕۆم و ئافرەتانی تر دەبینم بە منداڵەکانیانەوە چاورەوانی منن و تەماشای چاکەتە سپیەکەم دەکەن و کە بوردەیەکی ئاوریشمی فارسیە، بەلاَم بەلای منەوە پۆشاکی تەعزیە باریە بەسەرمەوە و پاشان وتی: دەچمە عیادەکەم سەماعەکە دەکەمە ملم وا ئەزانم پەتی سێدارەیە و ئالاَوە لەملم ، کۆتی سێیەمیش ئێستا ئامادەیە تا خۆی بپێچێ بە ملمدا بەرامبەر بە ئایندەش تەواو رەش بینم ... پاشان هاواری کرد و وتی بڕوانامەکەم و سەدریەکەم و هەموو موراجیعەکانم بەرن کە بەختەوەری درۆینە دەست مرۆڤ دەخەن (مەبەستی پارەو سامانە) ...تا گوێم لە وشەی دایکەوە بێت .. پاشان ئەم چەند دێڕە شیعرەی وت :

لقد كنت ان يقال : كبيبه فقد قيل فما نالنى من مقالها

فقل للتى كانت ترى فى قدوه هى اليوم بين الناس يرپى لحالها

كل منهن لها بعج كفل تچمه فهل ممكن ان تشترى هى بمالها

واتە :

من خوازیاربووم پێم بوترێت پزیشك

پێم وترا بەڵام بەو وتنە هیچم دەست نەکەوت

بڵێ بەو کچەی کە من بە پێشەنگ دەبینێ

ئەمڕۆ لە ناو خەڵکا جێگای بەزەییە

هەر ئافرەتێ چەند منداڵێکی هەیە و لە ئامێزی دەگرێ

ئایا ئەو دەتوانێ بە پارەکەی بیکڕێت

# چیرۆکی حەوتەم: دایکی نەزان

ئەمە بەسەرهاتی کچێکە لە خێزانێکی چاك و ناسراو بە رەوشت بەرزی.. کوڕێکی چاکی صالح هاتە داوای ئەم کچە ، بەلاّم کاروبار لەم خێزانەدا بە دەستی باوك و بە دەستی کچ و هیچ برایەکەوە نەبوو بەڵکو کاروبار بە دەستی دایکیانەوە بوو.. پێکەوتوو بوو و زۆر کاریگەر بوو بە شارستانیەتی رۆژئاوایی.. بەهەرحاڵ دوای هەوڵێکی زۆر بۆ ئاشانا بوون بە رەسەنایەتی کچەکە.. عەقدی شەرعی بەسترا ، دوای ئەوە دەستی کرد بە ئەساسی شوقەکە ، وە زۆری تێچوو بە هۆ دەست خستنە کاریانەوە لە لایەن دایکی کچەوەکەوە لە هەموو شتێکی بچوك و گەورەدا ، کوڕەکە رقی لێی بوو بەلاّم زۆر ئارامی دەگرت لە پێناوی کچەکەدا .

دوای ئەساس رێکەوتن لەسەر کاتی گواستنەوە کە بەڕاستی مەینەتیەکی گەورە بوو وە کارەساتی مەزن روویدا ، چونکە ناکۆکیەکی گەورە کەوتە نێوان زاوا و خەسوویەوە لە دیاریکردنی ئەو کۆشکەی کە ئاهەنگەکەی تێدا دەگێڕن وە هەروەها لە چاپکردنی بانگ هێشت کردن و بەشداریکردنی گۆرانیبێژی ئافرەت.. زاوا بە تەواوەتی رەفزی ئەوەی کرد ، چونکە تواناکانی سنووردار بوو ئەو تەنها فەرمانبەرێك بوو ، هەموو هەوڵی خۆی خستبووە گەڕ لە بوکەکە و ئەساسی شوقەکەدا ، بارودۆخیش رێگای پێنەئەدا تەنها بە کرێگرتنی کۆشکێکی سادە وئاهەنگێکی مامناوەندی نەبێت .

ئەی لە کوێ بڕی دووسەد هەزار بێنێت تا دایکی کچەکە رازی بکات ئەویش هەر سوور بوو لە سەر قسە و رای خۆی.. کەسایەتی باوکە

لاواز بوو له بەردەم سوور بوونی دایکەدا.. رازی بوو له سەر داواکاریەکە و کچەکەش بە تەواوی سەراسیمە بوو لە بەردەم ئەو هەڵسوکەوتانەدا ، کوڕەکە چەندین جار هەوڵی دایەوە لە گەڵیاندا و چەندین کەسی باشی خستە نێوانیانەوە.. بەڵام هەموو هەوڵەکان شکستی دەهێنا.. دوای ئەو هەوڵانە کوڕەکە یەك چارەی مابوو ئەویش جیابوونەوە لە کچەکە.. پاشان چوە داوای کچێکی تر و خوای گەورەی کردە سەر پشکی کارەکەی ئەوانیش پرسیاریان کرد لە بارەیەوە.. بینیان کە کوڕێکی صاڵحە، بۆیە بەخێرایی رازی بوون ، ژنی هێنا و خوای گەورە منداڵی پێبەخشی و کچەکەی یەکەم جاریش بە قەیرەیی مایەوە لە ماڵ باوکیدا و تەمەنی گەیشتە سی و چوار ساڵ... کەس نەدەهاتە داوای بە هۆی گەورەیی و دووەمیش بە هۆی تەلاقدانیەوە .

# چیرۆکی هەشتەم: باوکی نەزان

ئەمە بەسەرهاتی کچێکی گەنجی چاکە کە باوکێکی نەزانی هەیەو لە خوای گەورە ناترسێت ، ئەم کچە لە قۆناغی سەرەتایدا فێری خوێندەواری بوو و پاشان وازی لەخوێندن هێنا و تەمەنی بیست و پێنچی تێپەڕاندبوو ، داواکەران لە هەموو لایەکەوە دەهاتنە داوای و باوکیشی هەموویانی رەت دەرکردەوە بەبەڵگەی ئەوەی دەیەوێت کوڕێك بێت لە نەژاد و عەشەرەتەکەی خۆی .

کچەکە تەمەنی گەیشتە بیست و هەشت ساڵ.. گەنجێکی چاك هاتە داوای لە خێڵەکەی خۆی، بەلام زۆر هەژار بوو، باوکە زۆر بە توندی رەفزی کرد بەبێ پیشکەشکردنی هیچ هۆکارێك.. لەو کاتەدا کچەکە کە راوێژی بە خوشکەکەی کرد کە لە خۆی گەورەتر بوو خوشکە گەورەکەی دوای مشتومڕ و ئامۆژگاریکردن لە کەسانی راوێژکارەوە داوای لێکرد شکات لەباوکی بکات لە دادگای شەرعی ، قازیش فەرمانی پێدان هەموویان ئامادەبن ، ئەوانیش ئامادەبوون لە دانیشتنی دادگادا قازی لە باوکی پرسی بۆچی رەفزی دەکات ، ئەویش چەندین وەلامی بێسەر و بەری دایەوە کە لە نەزانین و بەد رەفتاری خۆیەوە بوو ، لە دادگا دا هەموو وتەکانی کە بە کچەکەی وتبوو تۆمارکرا بۆیە کچەکەش بە فەرمانی قازی بەندکرا.. لەوکاتەدا باوکە رازی بووکچەکەی شوو بکات چونکە دەترسا لەو فەزاحەتی بەندینخانە.. بەناچاری رازی بوو بە زەواج کردنی .... بۆیە مارەی کرد لە کوڕە هەژارەکە کە لەم دواییەدا رەفزی کردبوو، بەلام بەزۆری قازی ، دوای ئەوەی کە خەریك بوو ئەو کچە بە قەیرەیی بمێنێتەوە .

# چیرۆکی نۆیەم: کۆچکردن

ئەمە بەسەرهاتی کچێکە کە لە سەرەتای قۆناغی قەیرەیدایە.. ئەمە کچێکی گەنجی چاکە و باوکی رازی نەبوو شووبکات.. هەرچەندە داواکارێکی زۆری هەبوو لەلادێ و شارەوە.. وە باوکی سوور بوو لە سەر ئەوە چونکە کەسێکی دەویست لە ژینگەیەکی دیاریکراو و بە سیفاتی تایبەتەوە .

بۆیە ئەم کچە ناچار بوو بەرەو رووی باوکی بێتەوە و بەتوندی و بە راشکاوی و بەسەختی، بۆیە شەڕە قسەیەکی سەخت بەو هۆیەوە کەوتە نێوانیانەوە بەڵام سوودی نەبوو.. پاشان پەنای بردە بەر دایکی و چونکە دایکە هیچی بەدەست نەبوو پاشان کچەکە کاری خۆی دایە دەست خوای گەورە ، بەڵام شەیتان هەڵی خەڵەتاند بە خۆشەویستی کوڕێکی دراوسێیان کە مەیلی هەبوو بۆ کچەکە .. باوکە ئەمیشی خستە ریزی ئەوانەوە کە رەفزی کردبوون ،

جارێکی تریش شەیتان بە فێڵ هەڵی خەڵەتاند و تووشی گوناهێکی گەورەی کرد ، توشی زینای کرد.. باوکی دوای ماوەیەك بەکارەکەی زانی .. دراوسێکانیش زانیان.. هەواڵەکە بە ناو کەس و کار و خزماندا بڵاوبوویەوە.. فەزیحەتەکە لە هەموو شوێنێکدا لێی نەدەبوویەوە ، ناچار باوکەکە ئەو خانوەی فرۆشت کە تێیدا بوو، سەفەری کرد بۆ شارێکی تر کە زۆر دوور بوو لەم شارە وە یەکەمین کاریێ دوای بارکردنەکەی ئەنجامی دا ئەوە بوو کە کچەکەی دا بەشوو دوای ئەوەی کە پێشتر رەفزی دەکرد کە شوو بکات .

ئەمە بەسەرهاتی کچێکە کە یەکێ لە خوشکە بەرێزەکان دەڵێت : من کـچێك دەناسـم کـە شـەمەندەفەری زەواج تێیپەڕانـد و چـوە ریـزی قەیرەکانەوە، جارێکیشان گەشتم پێی و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە کاتێ بەسەرهاتی خۆی دەگێرایەوە ، ئەسرین بە چاوانیدا چۆڕاوگەیان بەستبوو ، وتیشی لە داخ و حەسەرتا خەریك بوو شەقی دەبرد .

پـێ وتم : مـن لـەو پـەڕی نارەحـەتی و مەینەتیـدا ئـەژیم.. ژیـانێکی زۆر سەخت بەسـەر ئەبـەم، بـاوکم بە بێ چەقۆ منـی سـەربڕی . لـەو رۆژەوە سەری بڕیم کە بێ بەشی کردم لە زەواج و خانەی هێمنی و سەقامگیری ، بە هۆی چەند درهەمێکەوە کە لـە کۆتـایی مانگدا دەسـتی دەکـەوت لـە موچـەکەم و لـە مانـدبوونم و هەوڵـدانم.. ئـەو خوشـکە کـە باسـی بەسەرهاتی ئەو کچە دەکات وتـی: پاشان شەیتان بردی بەرەو کاری ناشیاو و بـەرەو خراپـە.. وردە وردە کەوتـە قسەکردن لـە گـەڵ کـوڕان و پیاوان بـە تەلـەفۆن ، تـا سـومعە و پلـەو پایـەی بە تـەواوی دابـەزی و بە هۆی رەفزکردنی باوکیەوە کە شووبکات ... لـە بـری ئـەوەی ئاشـنا بێـت بە پیاوێك کە ئەویش مێردە ئاشنا بوو بە دەیان لاو .

# چیرۆکی دەیەم: قەیرەیی بە هۆی خوێندنەوە

یەکێ لە خوشکە بەڕێزەکان بۆی گێڕامەوە و وتی : ماڵێک چوار خوشکی تێدا بوو بچوکەکیان تەمەنی بیست ساڵ بوو و گەورەکەشیان سی و حەوت ساڵ.. هیچیان شوویان نەکردبوو ، پاشان ئەو خوشکە وتی : ئافرەتێکیش ئەناسم تەمەنی سی و پێنج ساڵە و تا ئێستا شووی نەکردووە و رەفزی هەموو ئەو کەسانە دەکات کە دێنە داوای . ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە سورە لە سەر پەروەردە کردنی خوشك و برا هەتیوەکانی .

# چیرۆکی یانزەیەم: ترسان لە سەروەت و سامان

یەکێ لە خوشکە بەڕێزەکان بۆی باس کردم و وتی : سێ کچ دەناسێت هەر کاتێ داواکارێ دەچێتە داوایان رەتیان دەکاتەوە ، چونکە لە سەروەت و سامانەکەی دەترسێت ، تا کچەکان گەیشتنە بازنەی قەیرەیەوە، بۆیە زۆر بە سەختی رقیان لە باوکیان دەبوویەوە هەتا ئەو رادەیەی کاتێ باوکیان وەفاتی کرد لۆمەیان دەکرد و نەفرەتیان لێ دەکرد.. خوایە گیان پەنا دەگرین بە تۆ لەو جۆرە شتانە .

سوپاس بۆ خوا تەواو بوو

٢٠٠٨/٦/٢٣

حسێن محمود هەڵەبجەیی

نەبوونی ئاراستەکردن و پەروەردەکردنی کچی موسوڵمان لەوانەیە ڕێگا بدات بۆ چەندین دیاردەی ناتەندروست و ئاکاری ناشرین کە لە ژیانیدا گەشە بکات.. بە تایبەتی لە قوناغی لاوێتیدا یان ئەو قۆناغەی پێی دەوترێت هەرزەکاری .

کەواتە پەروەردەی هۆشیارانە خوشکی موسوڵمان ئاشنا دەکات بە بەرپرسیارێتیەکەی لە ژیاندا ، وە دەیوەستێنێت لەسەر شێوەکانی خراپە و شێوازەکانی و ڕێگاکانی و هۆشداری دەداتێ کە نەکەوێتە ناویەوە و ڕێگای ڕێنومایی و ڕاستی نیشان دەدات واتە ئەو ڕێگایەی کە سوودی پێدەگەیەنێت لە دنیا و قیامەتدا .

وە ئەم ڕۆڵە یەکەمجار لە ئاراستەکردندا لە سەر شانی دایك و باوکە،وە ئەوان لە ڕۆژی قیامەت بەرپرسن لە ئاراستەکردنی منداڵەکانیان و ئاگادارکردنەوەیان لە تاوان و سەرپێچی وە دواجار لە سەر شانی بانگخوازان و زانایانە .

لەم سەردەمەدا کە فەساد بڵاوبوەتەوە لە هەموو شوێنێکدا زۆر گرنگە کە مەترسی ئەم دەردە بە کوڕان و کچانمان بناسێنین، بە تایبەتی کچان وە ئەم چیرۆك و بەسەرهاتە واقیعیانەیان بۆ باس بکەین کە وایان لێدەکات قێزیان لێ بێتەوە و خۆیانی لیَ لابدەن .

کاتێ باسی خراپە دەکەین مەبەستمان هاندان نیە بۆی، وەك هەندێك کەس وا گومان دەبەن بەڵکو بۆ ئاگادارکردنەوەیە لێی و ترسان لەوەی تێی نەکەوین... وە بەختیار ئەو کەسەیە پەند لە کەسانی ترەوە وەردەگرێت .

# پێرست

**پێرست.....................................لاپەڕە**

# خوشکی بەرێزم ڕێگاکەت هەڵە کرد

نەبوونی ئاراستەکردن و پەروەردەکردنی کچی موسوڵمان لەوانەیە ڕێگا بدات بۆ چەندین دیاردەی ناتەندروست و ئاکاری ناشرین کە لە ژیانیدا گەشە بکات.. بە تایبەتی لە قوناغی لاوێتیدا یان ئەو قۆناغەی پێی دەوترێت هەرزەکاری .

کەواتە پەروەردەی هۆشیارانە خوشکی موسوڵمان ئاشنا دەکات بە بەرپرسیارێتیەکەی لە ژیاندا ، وە دەیوەستێنێت لەسەر شێوەکانی خراپە و شێوازەکانی و ڕێگاکانی و هۆشداری دەداتێ کە نەکەوێتە ناویەوە و ڕێگای ڕێنومایی و ڕاستی نیشان دەدات واتە ئەو ڕێگایەی کە سوودی پێدەگەیەنێت لە دنیا و قیامەتدا .

وە ئەم ڕۆڵە یەکە مجار لە ئاراستەکردندا لە سەر شانی دایك و باوکە،وە ئەوان لە ڕۆژی قیامەت بەرپرسن لە ئاراستەکردنی منداڵەکانیان و ئاگادارکردنەوەیان لە تاوان و سەرپێچی وە دواجار لە سەر شانی بانگخوازان و زانایانە .

لەم سەردەمەدا کە فەساد بڵاوبوەتەوە لە هەموو شوێنێکدا زۆر گرنگە کە مەترسی ئەم دەردە بە کوڕان و کچانمان بناسێنین، بە تایبەتی کچان، وە ئەم چیرۆك و بەسەرهاتە واقیعیانەیان بۆ باس بکەین کە وایان ئێدەکات قێزیان لێ بێتەوە و خۆیانی لێ لابدەن .

کاتێ باسی خراپە دەکەین مەبەستمان هاندان نیە بۆی، وەك هەندێك کەس وا گومان دەبەن بەڵکو بۆ ئاگادارکردنەوەیە لێی و ترسان لەوەی تێی نەکەوین... وە بەختیار ئەو کەسەیە پەند لە کەسانی ترەوە وەردەگرێت .

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق — کوردستان — هەولێر

نرخ( ٥٠٠٠ ) دینار